

## ئیبراهیم سەکران

ناوی ئەبوو عومەر، ئیبراهیم کوڕی عومەر کوڕی ئیبراهیم سەکرانە. لە ساڵی ١٩٧٦ لە وڵاتی سعوودیە لەدایکبووە. یەک ساڵی لە زانکۆی مەلیک فەهد بۆ نەوت و کانزاکان خوێندووە و پاشان ئەوێ بەجێی دەهێڵێت و ڕوو لە کۆلێژی شەریعەت دەکات لە شاری ڕیاز و بڕوانامەی ماجستێر لە سیاسەتی شەرعی بەدەست دەهێنێت. پاشان دەچێتە بەریتانیا و بڕوانامەی ماجستێر لە یاسای بازرگانی نێودەوڵەتی لە زانکۆی ئیسکس لە شاری کۆڵشیستەر بەدەست دەهێنێت.

ڕێڕەوی فیکری ئیبراهیم سەکران گۆڕانی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە، سەرەتا سەکران وەک پێشەنگی فیکری لیبراڵی و بانگەشەکەرێکی تازەگەری ئایینی دەرکەوت، بەڵام دوای چەند ساڵێکی کەم، سەکران لە هەموو بیر و بۆچوون و نووسینەکانی پێشووی خۆی هەڵگەڕایەوە و بانگەشەیەکی فیکری جیاوازی دەکرد و وەک بەرەنگارێکی سەرسەختی فیکری لیبراڵی و تازەگەری دەرکەوتەوە، جیا لە بانگەواز و نووسین و ڕەخنەی لە سیاسەتی دەسەڵاتدارانی وڵاتەکەی تا لە ساڵی ٢٠١٦ دەستگیر کرا

ئەم بیرمەندە خاوەنی چەندین کتێبی بەپێزە کە هەندێکی بڵاو کردەوە لەوانە:

- ڕێگە بەرەو قورئان
- پەیڤە ناسکەکانی قورئان
- ڕێبازەکان
- هەژموونی ڕۆشنبیری زاڵ
- لێکدانەوەی سەردەمی بۆ کەلەپوور
- ڕووداوەکان
- پشکە تێکەڵەکان).

# چەند سەرنجێکی سەرەتایی

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگار، لە پاشان ...

ئەوا حەوت ساڵ بەسەر یەکەم بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی ئەم توێژینەوەیەدا تێپەڕی، ئەوکات وام پێشبینی دەکرد لەمیانەی چەند مانگێکدا وەک کتێب بڵاوی دەکەمەوە، کەچی وا بوو بە حەوت ساڵ!

جا ئەم توێژینەوەیەی لەبەر دەستت دایە بۆ یەکەم جار لە (مجلة العصر الألكترونية)دا و لە بەرواری جومادای دوایی (١٤٢٨ ک)/تەموزی (٢٠٠٧ ز) بڵاوکراوەتەوە. دواتر هەندێک لە خوێنەران ئەو کات چەند خوێندنەوەیەکی ڕەخنەییان بۆ توێژینەوەکە پێشکەش کرد و منیش ئەو ڕەخنانەم پوخت کردەوە. بە شوێنیدا پاشکۆیەکی گشتگیرم بە ناونیشانی: «چەند پرسێکی ورووژاو» نووسی، دیسان لە هەمان مانگدا لە «مجلة العصر»دا بڵاوکرایەوە، جا ئەو پاشکۆیەم لە کۆتایی کتێبەکەدا زیادکرد بۆ ئەم توێژینەوەیە بەهۆی ئەو پەیوەندییە جەوهەرییەی بە پرسەکانییەوە هەیە و بە ئامانجی یەکلاکردنەوەی توێژینەوەکە بۆ ئەم بڵاوکردنەوە چاپییەی -کە لەبەر دەستتدایە- هەستام بە ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی چاپ. هەروەها هەستام بە شیکردنەوەی هەندێک چەمکی هزری و ئەنسرۆپۆلۆژی کە لای هەندێک لە خوێنەران ناڕوون بوون، نموونە و بەڵگە و کۆتکاریشم بۆ هەندێک شوێنی ئاڵۆز زیادکردووە بۆ لادانی تەم و ڕۆشنتربوونەوەی، ناونیشانیشم بۆ هەندێک بابەتی ناونیشاننەکراو داناوە. ئیدی زۆرینەی بڕگەکانی توێژینەوەکەم وەک خۆی هێشتووەتەوە. لە پەروەردگار دەپاڕێمەوە کە ئەم توێژینەوەیە لەو زانستە بەسوودە بێت کە پاش مردن دەمێنێتەوە.

(نووسەر - iosakran@gmail. com)

# دەلاقەیەک

لە سەروەختیماڵئاوایی کردن لە نەوەدەکان ناوخۆی ئیسلامی لەڕێگای چاپکراو و کۆنگرە تایبەتەکانییەوە تژی بووبوو لە دیالۆگ و چارەسەری جۆراوجۆر لەمەڕ پێویستیمان بە تازەگەری و ڕەوایەتی بەخۆداچوونەوە، هەروەها پێشوازییەکی باش و بەگوڕیش هەبوو بۆ هەر تێز و پێشنیازێک لەو پێناوەدا، ئەو تێزانەش بەگشتی کۆمەڵێک تێز بوون کە دەگەڕانەوە بۆ پێوەرە شەرعییەکان، تازەگەریشیان بە ئامانجی بەهێزترکردنی ئامادەبوونی ئیسلامی و گەیاندنی بە شوێن و ناوچەی تازە پێشکەش دەکرد، نەک تازەگەری بە ئامانجی لادانی ناوەڕۆکی ئایینی و جێپێ لێژکردنی.

بەڵام دوابەدوای ڕووداوەکانی «سێپتەمبەری٢٠٠١ز» دیوە **سۆزدارییەکەی** ئاوازی گوتاری نوێگەریی پەیتا پەیتا گۆڕانکاری بەسەردا دەهات، **هەرچەندە** هێشتا لەناو مەرجەکانی ناوخۆی ئیسلامیدا دەسووڕایەوە. هەر لەگەڵ کەوتنی بەغداش لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣ز، زۆرێک لە ئاڵاکانی شووناس و ئینتیماش لە گەڵیدا کەوتن، زۆرێک لەو دەنگە نوێگەرییانەش لە ناوخۆی ئیسلامیدا بەرەو سەربازگەیەکی تەواو جیاواز کشانەوە.

ڕاستە هێشتا چەند کەسایەتییەکی نوێخواز ماونەتەوە کە قورسایی شەرعی و سەربەخۆیی سیاسی خۆیانیان پاراستووە، مرۆڤ بە گەورەتەماشاکردنێکی ڕاستاڵانەوە لەبەریان هەڵدەستێت -کە زۆریشن سوپاس بۆ خوا-، بەڵام دەبێت دان بەوەشدا بنێین -بەوپەڕی ڕاشکاویشەوە- کە زۆرێک لە خامەکانی گوتاری مەدەنی کاریان گەیشتووەتە کۆمەڵێک بەرەنجامی بەئازاری وەها کە خەریکە چاوی چاودێران کوێرایی بۆی دابێت لە خەم و خەفەتدا، وەختێک دەبینێت

بەرەو هەڵدێر دەچن.

چەند توانای نەپساوی گەنجانمان کە سەرەتای ڕێگایان بە زمانێکی بانگخوازانەی گەرموگوڕ دەستیپێکرد، وا ئەمڕۆکە -داخی گرانم- هەڵوێستێکی عەلمانی سوور و ڕاشکاویان وەرگرتووە و خەریکی پەکخستنی کرداریی ڕۆڵی دەقەکانن لە ژیانی گشتی، بێوچان کاردەکەن لە دژی فەتوا ئاینییەکان و تانە و تەشەردان لێیان، ڕادەکێشرێت بۆئەوەی ڕۆڵی نووسەرانی بەکرێگیراوی بەردەرگای پادشایان ببینێت، ئیدی سەنگی خۆیانیان دۆڕاند و پڕوپاگەندە و پیاهەڵدانیان خستووەتە ڕێ، ئەوجا بۆڵەبۆڵیانە لەدەست زمانی ئیمانی و بە گەمژەیی دادەنێن و هەمیشە ڕەهەندی غەیبی و پەنهانی دووردەخەنەوە لە لێکدانەوەی ڕووداوەکاندا، بەڵکوو هەندێکیان کاری گەیشتووە بەوەی بەڕاشکاوی ڕەخنەگەلی وەها دەردەبڕێت کە دوودڵییەکی قووڵ و گەورە سەبارەت بە پرسە وجوودییە گەورەکان دەنوێنێت. ئەم چینە ئیدی سەرچاوەیەتی بەڵگەیان گۆڕییەوە بە سەرچاوەیەتی ڕوخسەت و ئاسانکاریی جا لە هەر کوێیەک دەستبدات بە چاوپۆشی لەوەی کە ئایا مەبەستی خودای تێدا دێتە دی یاخود نا؟ لەو حاڵەی پێشوویانەوە کە هەڵگری خەمی پەرەپێدانی گوتاری ئیسلامی بوون، چوونەتە حاڵ و دۆخی تەنگ هەڵچنینی سیاسی بەو گوتارە، لە پاش هەر ڕووداوێکی ئەمنی بە زمانێکی هاندانەوە لێدوان دەدەن دژ بە هەر شتێک کە بۆن و بەرامەی ئیسلامی لێ بێت، ئیتر شەیدای ئەو شرۆڤە ناماقووڵانە بوون کە ڕووداوەکانی توندوتیژی پەیوەست بکەن بە کار و ئیشی دامەزراوە بانگخوازییەکان، زێدەڕەویی بکەن لە بێبایەخکردنی هەر دەستکەوتێکی کەلەپووری و پەنا دەبەنە بەر ئەدەبیاتە فرانکفۆنییەکان لەپێناو دووبارە لێکدانەوەی سیاسی بۆ کەلەپوور، بەوەی بڵێن کە هەموو ئەوە تەنها ئەنجامی ململانێکانی بەرژەوەندی و هاوسەنگییەکانی هێز بووە و هیچ پاڵنەرێکی ئەخلاقی یاخود ئایینی نەبووە، بەڵکوو هەندێکیان ڕاهاتوون

بە تانەدان لە گێڕانەوەکانی سوننەتی نەبەوی، بە تایبەت ئەو سەرچاوانەی سوننەت کە سەنگی مێژوویی تایبەت بە خۆیان هەیە و بە سەرچاوەی تێکدانی کۆمەڵایەتی هاوچەرخی لەقەڵەم دەدەن.

لە بەرانبەر ئەم هەموو ستەم و نا ئینسافییەی دەرحەق بە دەق و کەلەپوور و دامەزراوە ئیسلامییەکان ئەنجامی دەدەن، کەچی لە مامەڵەکردنیاندا لەگەڵ دوژمنانی چارەسەری ئیسلامی زمانێکی ناسک و ڕووخۆشی بەکاردێنن، بۆچوونەکانیان بە هەِند وەردەگرن و بە مافی ڕەوای خۆیان و ئازادی بیر و ڕا ناوزەدی دەکەن، لێتێگەیشتنی دۆستانەیان هەیە بۆ توێژینەوە گالتەئامێزەکان بە ئیسلام و ڕۆمانە پووچگەراکان و چەپڵەلێدانی بەرز و بەهێز بۆ هەر بابەتێکی ڕۆژئاوایی کە مرۆڤی ڕۆژئاوایی بۆخۆشی وانییە! باسکردنی کەسانی خۆراوایی بە زمانێکی فووتێکەر و سەنگین و ئەزموونە عەلمانییەکانی ناو مێژووی ئەورووپی لە ململانێی نێوان کڵێسا و زانست و شۆڕشی فەڕەنسی و چاخی ڕۆشناییەکان و نموونەی ئەوانە بە شێوەیەک دادەبەزێننە سەر کۆمەڵگای خۆمان کە شایەنی گەنجێکی موسوڵمان نییە. هەروەها زەقکردنەوە و تێبینی خستنە سەر هەڵەکانی بەرگری و بەرەنگاری زیاتر لە هەڵەکانی داگیرکەر، داواکاری بەردەوامیان ئەوەیە کە بە گوڵە غاندییانەکانی ئاشتی ڕووبەڕووی پرۆژەی سەربازی ڕۆژئاوا ببینەوە. هەتا کۆتاییی زنجیرەی پەرەسەندنە بەئازارەکان کە لە وتووێژەکانی داهاتوودا ئاماژەیان پێ دەکەین.

چاودێر زۆر بەسادەیی دەتوانێت لە هێڵکاریی ئەم چەندبارەبوونەوە بەردەوام گەشەسەندووانەدا ڕۆڵی تابلۆیدی ئەلیکترۆنی لە هەڵاوساندنی ئەم لادانەدا بخوێنێتەوە. بەو واتایەی: کە زۆرینەی ئەم هەوکردنانەی ناو ئەم گوتارە لە میانەی کارلێکە تیژ و توندەکان و گێچەڵ گۆڕینەوە لەگەڵ گرووپە ئینتەرنێتییە تایبەتەکان بە نمایشی توندوتیژی و زێدەڕۆیی لە پشت دەمامکی هزری ڕێگرتنی ساختە لە خراپە ئاوا زل بووەتەوە و بەم ڕۆژە گەیشتووە، بە

جۆرێک کە گوتاری نوێی مەدەنی بە تەنها هەستەکانی تۆڵەکردنەوە و کەلەڕەقی پاڵیدەنێن بەرەو زێدەڕەویکردن لە سەرپێچیکردنی دیدگای ئیسلامیدا لە دژ و لە داخی ستەم و پێڕاکێشانێکی ئەلیکترۆنی، واش نازانم عاقڵێک هەبێت تۆڵە لە خودای دوژمنەکانی بکاتەوە، بە داخەوە ئەمەیە کە دەگوزەرێت!

بەهەرحاڵ، پێموایە سادەترین دەرهاویشتەکانی خۆشویستن و ئەمەکداری بۆ ئەم چینە ئەوەیە کە دەستپێشخەری بکرێت بۆ ڕاشکاوانە باسکردن لە مەترسییەکانی ئەم پەرەسەندنانە، بەشکوو لەناو گەرمەی مشت و مڕەکاندا بەهۆش خۆمان بێینەوە و لەوە خەبەرمان بێتەوە کە نابێت ڕقەبەرایەتی ڕکابەران و دوژمنایەتی دوژمنان قڵیش بخاتە پەیوەندیمان بە خوا و پێغەمبەرەوە و سەرمایەی ڕاستەقینەمان بدۆڕێنین.

بەتایبەت کە ئەم گوتارە نوێیە گوتارێکی چالاک و گەشەسەندووە لەناو چینی ئالوودە بە ڕۆشنبیری و خاوەن مەیلی هزری، هەروەها پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکرێت لەلایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە لە ڕۆژنامە و کەناڵی ئاسمانی و جگە لەوانەش کە هەمیشە هەڵەکانی دەرکەوتنی سەر شاشەکان و ستوونەکانی چاپەمەنی دیمەنێکی وەها دڵڕفێن نیشان دەدەن کە غەریزە کڵپەدارەکانی سەرەتاکانی تەمەن لە خۆدەرخستن و خودسەلماندن هەرگیز خۆی لەبەریان ڕاناگرێت، ئیدی لاو/ڕۆشنبیر دەچێتە ژێر ڕکێفی مەرجەکانیان، تاکوو ئەو پلە و پێگەیە بەدەست بێنێت.

ئەم دیمەنە جەرگبڕە خوێندنەوە و ڕامانی خۆی دەسەپێنێت، لەپاشانیش لێکدانەوەی فەڕیزە ناوخۆییەکانی ئەم گوتارە کە گەیاندوویەتییە ئەم سەرەنجامە سامناکانە، بە ئامانجی ڕازیکردنی خوای پەروەردگار و لەڕێگای ئامۆژگاریکردنی شوێنکەوتووانی ئەم ئاڕاستەیەوە بۆ وەرگرتنی حەق و ڕاوەستان لەسەری، هەروەها لەپێناو بەهێزکردنی متمانەی بانگخوازی لەناو ناوەندە پەروەردەیی و

زانستییەکانی ئاڕاستەی ئیسلامیدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەمدرێژییەکانی ئەم گوتارە و برینداركردنە بەردەوامەکانی و بانگەشە دوژمنکاریەکانی و چالاکی و جووڵەی لە پەمپدانی ڕاگەیاندن و هاندانی دامەزراوە ئەمنییەکاندا لە دژی کاری بانگخوازی و پەروەردەی ئیسلامی.

لە واقیعدا: ئەم گوتارە مەدەنییە نوێیە هەندێک لە چاودێرانی بە چەند پۆلێنێک وەسفی دەکەن کە بەرهەمهێنەرانی ئەم گوتارە خۆیان پێی ڕازی نین، زیاتر وەک جنێوێکی نەیاران لێی دەڕوانن وەک لەوەی بە پۆلێنێکی ڕێکاری وەری بگرن، هەربۆیە وامان بەباش زانی کە بەسەر ئەم پۆلێنانەدا بازدەین و لەڕێی فەرهەنگی چەمکەکانی خۆیەوە لەم گوتارە بگەین کە پێکهاتە تایبەتەکەی ئەو پێکدێنن، وەک چەمکی شارستانییەت، کرانەوە، ئەوانی دی، لێبوردن، ڕێژەییبیەتی، ڕۆشنخوازی، هەستانەوە، هاووڵاتیبوون، مرۆڤاندن، وەلانانی بەئایدۆلۆژیکردن، دوورخستنەوە، سەرپەرشتیاری، بەسیاسیکردن، دۆگماتیزم، ڕادیکاڵییەت و ئەم نموونانە.

کە ئێستا ئەم چەمکانە لە کۆمەڵە ئامرازێکی مانابەخشی پەتییەوە گۆڕاون بۆ چەند لافیتەیەکی هزری کە بەرەو ئاڕاستەیەکی هاوبەشی تایبەت پاڵدەنێن و ئیدی لەناو ڕێڕەوی مشتومڕی ناوخۆییماندا بە ماناگەلێکی نوێ بارگاویکراون، بەجۆرێک کە ناوەڕۆکێکی مەزهەبی پێکەوەبەستراو لەخۆدەگرێت، پتر لەوەی کە تەنها چەند تەکنیکێکی لێکدانەوەی ئازاد بن.

تەنها لەپێناو خۆپاراستن لە ناڕوونی و هەڵەتێگەیشتن بوو ئەو پۆلێنانەمان تێپەڕاند، کە ئێمە لێرەدا ئامانجمان ئیجتیهادکردنە بۆ پێشکەشکردنی گوتوبێژێکی زانستیی کورت و پوخت بۆ ئەو تۆڕە چەمکییەی کە لەپشت بەخێوکردنی ئەم گوتارەوەیە و بە دیدگای تایبەتیی خۆی کۆمەکی دەکات، ئامانجی ئەم پەڕاوە ڕەخنەییە -خودا بۆخۆی دەزانێت- برینداركردن و ئازاردان

نییە، یاخود خستنی چەند کەسایەتییەکی دیاریکراو، یاخود لایەنداریکردن بۆ بەرەیەک نییە. داواکارین لە پەروەدگار کە سەرکەوتوومان بکات لە یەکلابوونەوە بۆ خۆی و یارمەتیمان بدات بۆ دوورکەوتنەوە لە شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزوو وستەم.

ئەوەی گرنگە لێرەدا بەتایبەت ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە کە ئێمە نە توخنی نموونەهێنانەوە کەوتووین، نە ناوهێنانی کەسایەتی دیاریکراوی ناو ئەو گوتارە، لەپێناو دوورکەوتنەوە لە گشتاندن، چونکە ئێمە لەسەر چەند وێناکارییەکی گشتی دەدوێین کە نووسەرانی ئەم گوتارە جیاوازی گەورەیان هەیە لە دانپێدانان و لە ئەستۆگرتن و نزیکبوونەوە یاخود دوورکەوتنەوە لێی. هەیانە زۆر تێیکەوتووە و هەشیانە کەم، جا کۆکردنەوەی ناوەکان و خزاندنیانە ناو یەک سیاق لەوانەیە وەهمی ئەوە دروست بکات کە لە وردەکارییەکانیشدا بەشدار و هاوڕان، ئەوەش دژی کارکردنە بە ئەرکی دادگەری و ویژدانپەروەری.

کەواتە ئەم پەڕاوە تایبەتە بە «پێوانەکردنی پەیوەندی ئەم گوتارە مەدەنییە بە بنچینەکانی وەحییەوە»، دەستپێکیش نمایشێکی کورتی سیاقی مێژوویی ئەم دیاردەیە دەکەین، ئیدی لێرەوە دەچینە سەر باسکردنی مەبەستی سەرەکی.

# ١- تارماییەکانی هەڵگەڕانەوەی پێوەری

گوتاری مەدەنی لەمیانەی ئەو دینامیکیەتە بەئازارەی پەرەسەندنەکانیدا -کە ئاماژەمان پێکرد- بەرەو دۆخێکی هەڵگەڕانەوەی پێوەریی چوو، تا وایلێهات کە ئەمڕۆ وەک بڵێی دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی بنچینەیی و گشتگیر دەبینین کە دەست بۆ توخمە ناوەڕۆکییەکانی دیدی هزریمان دەبات، ئەمڕۆ لەبەرچاوماندا حاڵەتێکی توندی هەڵگەڕانەوە لە خشتەی بەهاکاندا هەیە کە ناتوانین چاوپۆشی لێ بکەین یاخود پشتگوێی بخەین، کار بەوە گەیشتووە کە هەڕەمی لەپێشینەییەکان ئاوەژوو بووەتەوە!

ئەم هەڵگەڕانەوە چەمکییانە هەڵوێستی لەهەمبەر توراس، **هەڵوێست** لەهەمبەرڕۆژئاوا، هەڵوێست لەهەمبەر دامەزراوە بانگخوازییەکان، **هەڵوێست** لەهەمبەر نەیارانی چارەسەری ئیسلامی، هەڵوێست لەهەمبەر **واقیعی** کۆمەڵگای هاوچەرخمان و هەڵوێستی لەهەمبەر دەوڵەتی نوێی عەرەبی گرتەوە. بەو واتایەی کە ئیتر دەرزی قیبلەنمای هزری هێزی موگناتیسی پێشووی خۆی بەتەواوی لەدەستداوە، وەک بێژی دووکەڵەکەی سێپتەمبەر باڵی درێژکردبێت بۆمان و کاتژمێرە لمییەکەی ئاوەژوو کردووەتەوە تاکوو ئەمجارەیان ڕێکردنمان بەرەو دواوە ئاڕاستە بکاتەوە.

ئەوەتاا توراس لە کابینەی پێشڕەوایەتیکردنەوە دابەزێنرایە ناو قەفەسی تۆمەت! پاش ئەوەی ئەم توێژە لاوە وەک نموونەی پرشنگداری سەرچاوەی ئیلهام و بەهاکان لە توراسیان دەڕوانی، مرۆڤ بە سوکنایی شووناس و ئینتیما لە بەردەمیدا دەست لەسەر سنگ دەوەستا، وای لێهاتووە بەشێک لەو گەنجانە وەک ئەلبوومی ڕەفتاری سەرەتایی شەرمهێن لە توراس دەڕوانن کە نابێت

بەبێ بزەی تەریقبوونەوە و داوای لێبوردنکردن لاپەڕەکانی هەڵبدرێنەوە، لەگەڵ بەکەم تەماشاکردنێکی قووڵ لە گەورەپیاوان و پێشەوایانی ناویشی.

لە باشترین حاڵدا ئیدی تەنها هێندە لە کەلەپووری ئیسلامی وەردەگیرێت کە پڕچەکمان بکات بەو دەق و سەنەد و واتایانەی کە جەخت لە ئەنجامەکانی چاخی ڕۆشنگەریی دەکەنەوە و پاڵپشتی دەکەن!

هەربۆیە زۆرێک لە وەبەرهێنەرانی ئەم گوتارە بانگەوازییان ئەوەیە کە دەقەکانی وەحی و کەلەپوور بە خوێندنەوەیەکی مەدەنیانە بخوێنرێنەوە، بێگومان مەدەنییەتیش لێرەدا بە پێناسە ماددیەکەی، بە واتای خوێندنەوەیەکی ئاڕاستەکراو کە لەناو ئەو دەقانەدا تەنها بە شوێن ئەو ناوەڕۆکانەدا بگەڕێت کە پاڵپشتی مەدەنییەتی ماددی دەکەن، ئەوانەشی کە پێکدادانیان لەگەڵیدا هەیە، ماناکانیان لاڕێ بکات، ئیدی لەناو ئەم ئاڕاستەیەدا لێهاتوویی فیقهزان پەیوەندی بەوەوە هەیە کە چەندێک توانای فەراهەمکردنی پەردەپۆشکردنێکی شەرعی بۆ بەرهەمەکانی شارستانییەتی ماددی هەبێت، هەروەها توانای لاڕێکردن و گۆڕینی جۆراوجۆر و جیاوازی هەرچی کە لەگەڵیدا پێکدادانی هەیە، لەجێی ئەوەی کە بانگەوازییان بۆ ئەوە بێت تا خوێندنەوەی وەحی خوێندنەوەیەکی بابەتی و ڕاستاڵانە بێت کە یەکلا بێتەوە بۆ پشکنین و گەڕانی پێداگر و ورد بۆ مەبەستی خودایی!

بە واتایەکی دیکە: وەحی لەباتی دادوەر بەسەر شارستانییەتەوە بکرێت بە تەنها پارێزەرێکی بەرهەمەکانی و پاساویان بۆ بێنێتەوە و لە بەرەی ئەواندا بجەنگێت، ئیدی جگە لەوە مافی هیچ ڕۆڵێکی دیکەی نەبێت! شاراوەش نییە کە داوەریکردن جۆرێکە لە دەسەڵات و سالاری، بەڵام پارێزەرییێتیکردن بۆ جگە لە خۆت حاڵەتێکی شوێنکەوتەییییە کە نرخ و ئەرزشی تەنها لە پاسەوانیکردن و پاساوهێنانەوەدایە.

پرسیارە بەئازارەکە کە لێرەدا خۆی دەسەپێنێت ئەمەیە:

ئەو هەماهەنگییەرِ ڕاستەقینەیە چییە کە دەتوانین پێشکەشی جیهانی بکەین ئەگەر ئەوپەڕی ئەوەی کە بە ڕۆژئاوای دەڵێین ئەوە بێت کە: ڕێباز و ڕەوشت و هەڵسوکەوتەکانی ئێوە دەگونجێت لەسەر هەندێک لە بۆچوونە فیقهییەکانی لای ئێمە بواری بۆ بدۆزرێتەوە، یاخود ئەگەری هەیە کە هەندێک لە بەڵگەکان ئاماژەیان پێ کردبێت؟ ئەسڵەن ئەوان بەر لەوەی ئێمەش بناسن خەریکی ئەو شێوازە ژیانەی خۆیان بوون!

هەروەک چۆن وێنەی ڕۆژئاوا لە شەقامی بەزین و دابەزینەوە بازیدایە سەر سەکۆی ئەو مامۆستا و دەمسپییەی کە قسەی ناگێڕدرێتەوە، خۆ ئەگەر قایلیش نەبووین بەوەی دەیڵێت، ئەوە لەبەر کەموکوڕیی ئێمەیە نەک خوانەخواستە هەڵەیەک بێت لەوەوە!

لەپاش ئەوەش کە هەندێک لەو لاوانە شانازییان بەوەوە دەکرد کە **خۆیان** بدەنە پاڵ ئاراستەی ئیسلامی و وەک شووناسێکی کەسی لە ژیانی **گشتیدا** نمایشی بکەن، وا ئەمڕۆ هەندێکیان وەک بار بەسەر کۆمەڵگاوە دەیبینن، زۆریش کەیفیان نایەت بە قووڵبوونەوە و گەشەسەندنە کۆمەڵایەتییەکەی!

# ٢- نموونە ڕاڤەییەکانی دیاردەکە

هێشتا کادیرانی ئیسلام بڕۆی سەرسامی و پرسیاریان بەرزدەبێتەوە لەم کارەساتە هزرییە، زۆر مکوڕانە دەپرسن کە بڵێی بەدیاریکراوی چی ڕوویدابێت؟

لەڕاستیدا هەموو گوتارێکی هزری لە کۆمەڵێک فەرێزەی بنچینەیی یاخود سەلمێنراوی شاراوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە جێبەجێکردنەکان لێوەی سەرهەڵدەدەن و داوەریکردنی کێشە و ئاریشەکانیشی بۆ لا دەگێڕدرێتەوە، ئیدی بە ئەگەری بنچینەیی ناوبنرێت یاخود بەهای سەرەکی، یان پارادایم[١]، یان ئیبستیما[٢]، یاخود هەر دەستەواژەگەلێکی ئەنسرۆپۆلۆژی[٣] دیکەی هاوشێوەی

---

(١) پارادایم (paradigm): یەکێک لە چەمکە بەناوبانگەکانی ناو فەلسەفەی زانستەکان، لە بنەمادا بە واتای: «نموونە» دێت، بەڵام تۆماس کۆن (ک:١٩٩٦ز) مێژووناسی زانستەکان لەمیانەی پەرتووکەکەی: «پێکهاتەی شۆڕشە زانستییەکان» ناوەڕۆکێکی دەستەواژەیی تایبەت و بەرتەسکتری بەبەردا کردووە، کە خودی خۆی ئاوا پێناسەی دەکات: "ئەو دۆزینەوە زانستییانەی کە لەلایەن جیهانەوە دانی پێدا نراوە لە قۆناغێکی کاتی دیاریکراودا کە دەبێتە سەرچاوەی گرفت و چارەسەری نموونەیی کۆمەڵگای توێژەرە زانستییەکان." بڕوانە: (بنية الثورات العلمية)، ترجمة: علي نعمة، دار الحداثة، الطبعة الأولى، (١٩٨٦ز)، (ص١٠).

(٢) ئیبستیما (episteme) پیتی فەرەنسی: لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە بە واتای «زانین» دێت، لەپاشان فەیلەسووفی فەرەنسی «میشال فۆکۆ» (ک:١٩٨٤م) لە پەرتووکە بەناوبانگەکەیدا: «وشەکان و شتەکان: هەڵکۆڵینەکان لە زانستە مرۆییەکاندا» بەکارهێنانێکی تایبەتی پێ دا، بەڵام چەند دیاریکەرێکی نوێی دەستەواژەییشی پێ دا، هەروەک بەم واتایە بەکاریدێنێت: «ئەو دەستە چەمکە گشتییە ناوەڕۆکییە لەپێشینەییانەی کە سیستەمی زانین دیاری دەکەن، هەروەها مەرج و گونجانەکانی گوتار، لە چاخێکی دیاریکراودا، لەپاشان لەو ڕێگایەوە ناوبانگ پەیدا دەکات.»

(٣) لەوانەیە ئەوەی کە پارادایمی کۆن و ئیبستیمای فۆکۆمان لە یەک ڕەفەدا داناوە، هەندێک لە خوێنەران بە گرفتی ببینن، بۆ زیاتر بینینی بەڵگەکان لەسەر لێکچوونی بەهێزی چەمکیانەی نێوانیان؛ دەتوانن ئەو بەراوردکاری و لێکچوواندنەی کە «جان بیاجیە» (ک:١٩٨٠ز) زانای

ئەمانە، ئەوەی کە لە زانستە شەرعییەکاندا بە دەستەواژەی (الأصل - بنچینە) یاخود (الكلي - گشتی) ناودەبرێت، هەروەک دەڵێن "بنچینەکانی فڵانە مەزهەب" واتە: ئەو بنەما ناوەڕۆکیانەی مەزهەبەکە کە هەرچی جێبەجێکاری و چارە واقیعییەکانە لێوەی سەرچاوە دەگرن.

پێشەوا ئیبن تەیمییە لە تێبینییەکی داهێنەرانەدا ئاماژەی بە ڕۆڵی دۆزینەوەی گشتی و پرەنسیپە مێژووییەکان کردووە لە تێگەیشتن و لەخۆگرتن و دڵنیابوونەوەی زانستیدا، هەروەک دەفەرمووێت -ڕەحمەتی خوای لێ بێت-: "چونکە بۆدەرکەوتن و زانینی بنچینەی شتەکان و پرەنسیپیان ...، لە بەسوودترینی زانستەکانە، لەکاتێکدا کە مرۆڤ هەتاوەکوو زانیاری تەواویی لەبارەی ئەو حەقیقەتانەی شتەکەوە نەبێت کە پێویستی پێیەتی و کاری تێی دەکەوێت، هێشتا زۆر نائارامی و دوودڵی لە سینەیدا دێت و دەچێت".[1]

لە جێگایەکی دیکەدا دەفەرمووێت: "هەرکەسێک هۆکاری پشت قسە و بۆچوونەکان نەزانێت، با بەتاڵ و ناڕاستیش بن -ئەو بیر و بۆچوونانە-، **توانای** تیمارکردنی گیرۆدەبووانیان ولادانی گومانەکانیانی نابێت." (٢)

لە واقیعدا: چاودێران و ڕەخنەگران لێکدانەوەی زۆریان بۆ ئەم دیاردەیەی ئاوەژووبوونەوەی پێوەری -کە ئاماژەمان پێکرد- خستووەتەڕوو، هەروەها هەوڵی جۆراوجۆریش بۆ دۆزینەوەی ئەو تۆوە جەوهەرییەی کە جێبەجێکردن و هەڵوێست و نوێکردنەوەکانی ئەم گوتارە مەدەنییە توندڕەوە لێوەی سەرچاوەدەگرن، جا هەندێک لە ڕەخنەگران بۆچوونیان وایە کە هۆکار سەرسامبوونە بە ڕۆژئاوا،

---

دەروونناس و فەیلەسووفی سویسری کە لە نێوان ئەو دوو چەمکەدا کردوویەتی بخوێننەوە لە پەرتووکەکەیدا: (البنيوية)، ترجمة: عارف منيمنة و بشير أوبري، دار عويدات، الطبعة الرابعة، (١٩٨٥ز)، (ص١٠٦).

(١)ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (١٠/٣٦٨).

(٢)ابن تيمية، "تلخيص الاستغاثة": (١/١٨٢).

لە دیدی منیشدا: سەرسامبوون بە ڕۆژئاوا یەکێک لە دەرئەنجامەکانە نەک فاکتەری یەکلاکەرەوە، هەروەک لە داهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە.

بە بۆچوونی هەندێکی دیکە لە ڕەخنەگران ڕەگی شاراوە لەم دیاردەیەدا بریتییە لە عەقڵانییەت. بە هەڵسەنگاندنی منیش: ئەم دیاردەیە تیۆریایەکی کردەیی لە سەرچاوەکانی زانین و مەعریفەدا نییە کە ئەوەی عەقڵ دەلالەتی لەسەر دەکات پێش بخات و ئەوەی عەقڵ دژیەتی ڕەتی بکاتەوە، بەڵکوو جارێک لەگەڵ عەقڵە، جارێکیش لەگەڵ دەق، تاوێک لەگەڵ سەلیقەی کەسی، تاوێکیش لەگەڵ دابونەریت، جارێکیش دژ بە هەموو ئەمانە، چونکە ئەو لەگەڵ بەرهەمی نوێی شارستانیدا دەسووڕێتەوە سەرباری ئەو پەیوەندیەی کە لەگەڵ سەرچاوەکانی زانیندا هەیەتی، بەڵکوو پێموایە کە بنیادنانی سیستمێکی عەقڵانی تۆکمە زۆر گەورەترە لە توانای ئەم دیاردەیە و سەرجەم نووسەرانی.

هەندێکیش لە نووسەران دەڵێن کە ئەم دیاردەیە درێژبوونەوەیەکی مێژوویی قوتابخانەی موعتەزیلەیە، لە واقیعیشدا، ئەم لێکدانەوەیە زۆر دوور ڕۆیشتووە، چونکە قوتابخانەی موعتەزیلە قوتابخانەیەکی ئایینی پەڕگیرە کە سەرجەم فاسق و تاوانکاران -تاوانی گەورە-ی لە ئیسلام کردووەتەدەرەوە و ڕەوایەتی دا بە ململانێی چەکداری بەرانبەر بە دەسەڵاتدارانی ستەمکار، هەروەها بە هەمان کەرەستەکانی خۆی بەربەرەکانێی لەگەڵ فەلسەفەی ئیغریقیدا کردووە، هەروەک زۆرێک لەو زانایانەی لێکۆڵینەوەیان لەبارەی زانستی «فیرەق - گرووپەکان» کردووە موعتەزیلەیان بە خاوەن «ئیرادات - ورەبەرزی» وەسف کردووە، بەو واتایەی: کەسانی خاوەن سولوک و پەرستش بوون، هەروەها بەرهەمێکی ڕێکخراوی عەقڵییان هەبووە، هۆکاری لادانیان تەنها ئەوە بوو کە بە عەقڵ دەمیان لە بابەتە غەیبییەکان دەکوتا و پێشیشیان دەخست بەسەر ڕیوایەت و گێڕانەوەکاندا، تاوەکوو پێنج بنچینە ناسراو و بەناوبانگەکەیانی لێوە بەرهەم هات، نەک لەبەرئەوەی کە پشتیان لە شەریعەتە کردارییەکان کردبێت

و سەرسامی میللەتێک لە میللەتانی بێباوەڕ بووبێتن. کەوابێت موعتەزیلە قوتابخانەیەکی پەڕگیرە نەک شلگیر، بگرە موعتەزیلە زۆر ماقووڵترن لەو گوتارە فرانکفۆنییە هاوچەرخەی کە هەوڵی گەیشتن بە دژیەکییە ناوخۆییەکانی کەلەپووری ئیسلامی دەدات بە ئامانجی دوورخستنەوەی یەکجاری وەحی لە ژیانی گشتی.

کەواتە: لێکدانەوەی ئەم ئاوەژووبوونە پێوەرییە چییە؟

بەپێی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی تایبەتی خۆم، وای دەبینم کە ئەو ناوکە شاراوەیەی هەموو ئەم گۆڕانکارییە توند و ڕیشەییانەی لە هەڵوێست و دیدگاکاندا لێی کەوتووەتەوە بریتییە لە زێدەڕەویکردن لە بەهادانان بۆ مەدەنییەت و شارستانییەتدا، بە پێناسە ماددییەکەی، چونکە زێدەڕەویکردن لە شارستانییەت و مەدەنییەتی دنیایی بە پێناسە ماددیەکەی و کردنی بە پرسی لەپێشینە و ئامانجی ئامانجەکان ئەمەیە ئەو ڕەگە سەرەکییەی کە هەموو ئەم هەڵگەڕانەوە چەمکییانەی لێوە سەردەرهێناوە، بەو واتایەی کە ئەو نموونە لێکدانەوەییەی وەڵامێکی ورد سەبارەت بە جێبەجێکارییەکانی ئەم دیاردەیە پێشکەش دەکات، ئەوەیە کە دەکرێت ناوی لێ بنێین بە ئامانج دانانی شارستانییەت و سەنتەربوونی مەدەنییەت، بە پێناسە ماددییەکەی.

دەکرێت زۆر بە کورتی بوترێت: مەدەنییەتی توندڕەو سەرچاوی لادانی ڕۆشنبیرییە، بەجۆرێک کە لادانی کردەیی وەحی بەشوێن خۆیدا دێنێت، چونکە وەحی بە ئاراستەی مەدەنییەتی ماددی دنیایی پاڵنانێت و لەگەڵ زۆرێک لە بەرهەمەکانیشیدا پێکدادانی هەیە، هەروەها بە سووک تەماشاکردنی کەلەپووری ئیسلامی لێ دێتە کایەوە چونکە دەزگایەکی شەرعی چەمکی وای لەخۆگرتووە کە مرۆڤ دنیانەویست و وابەستەی ژیانی پاشەڕۆژ دەکات.

ئەم زێدەڕەویکردنە لە بەهای مەدەنییەتی ماددیدا بەگەورەدانانێکی

دەروونی لەلای خاوەنەکەی لە هەمبەر ڕۆشنبیری نوێی ڕۆژئاوا دێنێتە بەرهەم، بەهۆی پێشکەوتنە مەدەنییە ماددییەکەیەوە بەسەر مییلەتە هاوچەرخەکانی دیکە، جا ئالوودەی نمایشکردنی بەرهەمەکانی دەبێت، قەڵسیش دەبێت بە باسکردنی کەلێنەکانی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی و لادەداتەوە بۆ فامکردنی ڕۆشنبیری خۆراوایی وبەخشینی مانایەکی ئەرێنی پێی، یاخود بەلایەنی کەمەوە بێلایەنانە لێی بوەستێت و لەپاڵ جوانییەکانیاندا پاکانەی بۆ بکات.

ئیدی گەنج بەرەبەرە دەست دەکات بە دوورکەوتنەوە لە کادیرانی ئیسلام بەهۆی خۆماندووکردنیان بە بانگەوازی ڕێی پەروەردگارەوە، بەوەشی لەخۆی گرتووە لە قووڵکردنەوەی باوەڕ لەناو دڵی خەڵکیدا و حاڵیبوون لە واتاکانی وەحی، ئیدی بنچینەی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا لەسەر بنچینەیەکی ئایینی نییە کە دۆستایەتی لەگەڵ بەرانبەردا بە ئەندازەی ئەوە بێت کە کەسی بەرانبەر تا چەند دۆستایەتی وەحی و چاخەکانی پێشین دەکات، هەروەها لێی دوور بکەوێتەوە بە ئەندازەی ئەوەی ئەو کەسە لە دۆستایەتیکردنی وەحی و چاخەکانی پێشین دووردەکەوێتەوە، بەڵکوو بنەما و کۆڵەکەی دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بنەمایەکی مەدەنی ماددی بنیادنراو دەبێت لەسەر هەوڵی هاوبەش بۆ ئاوەدانکردنەوەی دونیا، بەچاوپۆشی لە قەبارەی سنوورشکێنییەکان بەرانبەر بە وەحی و چاخە پێشینەکان. جا خاوەن بەرهەمی مەدەنی ماددی -ئیدی نووسەر بێت، یاخود ئاڕاستەیەکی هزری، یاخود کۆمەڵگایەکی هاوچەرخ- لێخۆشبوون بۆ سەرجەم لادانە ئایینییەکانی دەردەچێت و لە دەریای چاکە مەدەنییەکانیدا لێکتێگەیشتنی بۆ پەیدا دەکرێت، لەکاتێکدا بە چاوی سووکەوە تەماشای خاوەن دەستکەوتی ئایینی دەکرێت مادەم لە کەمتەرخەمی مەدەنی ماددیدا تێوەگلاوە، -ئیدی نووسەر بێت، یان ئاڕاستەیەکی هزری، یاخود کۆمەڵگایەکی هاوچەرخ-.

هەوڵ بدە لە تابلۆی هاوچەرخی خەمناکی ساردوسڕی بانگەواز ڕابمێنیت و شوێنپێی دەزووەکانی ڕاڕایی هزری هەڵبگریت کە بەرۆکی هەندێک لە گەنجانی کۆمەڵگای موسڵمانی ئەمڕۆی گرتووە، دەیبینیت کە سەرجەم ئەو دەزووانە لە گرێی زێدەڕەویکردن لە بەهای مەدەنییەت و شارستانییەتدا -بە پێناسە ماددیەکەی-یەکدەگرنەوە، لەوێوە دەردەچن و بۆ ئەوێش دەگەڕێنەوە.

چەندی دەتەوێت چاو بخشێنە بەو گرووپە هزرییانەدا کە ژیانی تازەی ئەمڕۆیان تەنیوە، دەبینیت ئەو مۆرکەی کە ڕەنگی جیاجیای بە گشت ئەم گرووپانە بەخشیوە بریتییە لە هەڵوێست لەهەمبەر شارستانییەت، جا پێم بڵێ بەهای شارستانییەت و مەدەنییەت لای تۆ کام پلەی وەرگرتووە؟ پێت دەڵێم کەوتوویتەتە کوێی نەخشەی بەرە هاوچەرخە هزرییەکانەوە.

جا ئێمە ئەگەر لە جێبەجێکردنەکانی ئەم گوتارە نوێیە و هەڵوێست و بۆچوون و شێوازەکانی پەیوەندی و نوێکارییە ناوچەییەکانی بکۆڵینەوە کە لەسەر نەخشەی هزری ئەنجامیان دەدات، بێگومان بەو ئەنجامە دەگەین -وەک پێشووتریش ئاماژەی پێدرا- کە ئەو بەها سەرەکییەی زاڵە بەسەریدا و وا دەکات پشتگیری هەڵوێستێک بکات یاخود دژایەتی بکات، پرسێک بەرز دەنرخێنێت یان بێنرخ دەکات، زۆر بەدڵنیاییەوە دەیبینین کە بریتییە لە سەنتەربوونی مەدەنییەت، بە مانا ماددیەکەی، بنیاد لەسەر سەنتەربوونی مەدەنییەتی ماددی، شێوازی پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگا و کەلەپوور و ڕۆژئاوا و دەوڵەتی نوێی عەرەبی دیاری دەکرێت، لەسەر بنەمای نزیکی و دووریان لە مەدەنیبوونی ماددی.

تەنها بەوەی کە لاوی موسڵمان بیری زێدەڕەو وەربگرێت لە بەهادانانیدا بۆ مەدەنییەت و شارستانییەت و ئاوەدانکردنەوە و هەستانەوە بە پێناسە ماددییەکانیان، ئیدی هەڕەمی لەپێشینەییەکان و نەخشەی بەهاکان لەلای

سەرەوژێر دەبنەوە، ئەوەی پێی وایە کە لەپێشینەیەتی و بەهای سەرەکی لە پەیژەی بەهاکاندا بریتییە لە مەدەنییەتی ماددی دنیایی، ئیدی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی لە تەرازووی ئەودا دەبێتە نموونە سەرکەوتووەکە، لەهەمان کاتدا سەردەمی چاخە زێڕینەکانی پێشین و بزووتنەوەی هاوچەرخی ئیسلامی لەلا دەبێتە نموونەی نسکۆ و شکستێک کە دەبێت داوای لێبوردنی بۆ بکرێت.

بەڵام ئەوی کە پێی وایە لەپێشینەیەتی بۆ بەهای سەرەکی لە پەیژەی بەهاکاندا بریتییە لە بژاری دەروون و بنیادنانی داهاتووی ڕۆژی دوایی و مەدەنییەتی ماددی لەلای تەنها ئامرازێکە، ئەوکات کەلەپووری ئیسلامی و لەپاش ئەویش جووڵانەوەی ئیسلامی لەلای ئەمیان دەبنە نموونەی ناوازەیی و هەڵکەوتن و ڕۆشنبیری ڕۆژئاواییش دەبێتە نموونەی نزمی و دواکەوتوویی.

# ٣- چاوگەکانی زێدەڕەویی مەدەنی

ئەم گوتارەی کە بەو شێوازە بەئێشە پەرەیسەند و گەیشتە ئەو حاڵەتە پەڕگیرە مەدەنییەی کە پێکدادانی لەگەڵ بنچینەکانی وەحیدا هەیە، چوار دۆخی سەرەکی باڵی کێشاوە بەسەریدا کە گۆشەکانی دەفری جەوهەری گەشەسەندنەکەیان پێکهێناوە، ئەوانیش بریتین لە کەشی سێپتەمبەر و وروووژەکردنی فرانکفۆنییەت و پێشوازیی گەرمی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بۆی و پەرچەکردار بەرانبەر بە ستەمی ئەلیکترۆنی.

جا لەپاش ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر تەوژمی ئیسلامی کەوتە بەر شاڵاوی دادگاییکردنێکی دڕندەی جیهانییەوە کە بەری گرت لە پەلهاویشتن و دەنگدانەوەی، لەگەڵیشیدا لایەنگیرییە میللیە کۆمەڵایەتییەکەی بە شێوەیەکی بەرچاو پاشەکشەی کرد، لە سایەی ئەم بۆشاییە جوزئییەشەوە کە چوونەوەیەکی حاڵەتی ئیسلامی لەپاش خۆی بەجێی هێشت، توێژینەوەکانی قوتابخانە فرانکفۆنییە چالاکەکان لە سنوری مەغریبدا دەرکەوتن، وەک وەڵامێکی نوێ کە سەرکەوتوو بوو لە قۆستنەوەی دۆخی ئەمنی کاتی، سەرکەوتنێکی گەورە و فراوانیشی لە ماوەیەکی کورتدا بەدەستهێنا.

فرانکفۆنییەت (Francophonie) لە بنەڕەتدا چەمکێکە بۆ ئەوانە بەکاردێت کە بە زمانی فەرەنسی دەدوێن، لەپاشان بەکارهێنانی فراوان بوو بە جۆرێک کە بوو بە «پابەندبوونێکی ئایدیۆلۆژی» بۆ پەرەپێدان و بڵاوکردنەوە و بەبازاڕکردنی زمان و ڕۆشنبیری فەرەنسی، دامەزراوەی جۆراوجۆریش سەرپەرشتی دەکەن، لەوانە دامەزراوەی نێودوڵەتی فرانکفۆنییەت و ئەو باڵە دامەزراوەییانەی کە

لێکەوتەی ئەون. [١]

ئێمەش لێرەدا فڕانکفۆنییەت بە دەستەواژەیەکی تایبەتتر بەکاردێنین، کە بریتییە لە: تەعبیر کردن لە تەوژمێکی مۆدێرنەی عەرەبی هاوچەرخ کە کار دەکات لەسەر دووبارە تەئویلکردنەوەی توراسی ئیسلامی بە ئیلهام وەرگرتن لە ڕێبازە هزرییە فەڕەنسییەکان، بە واتای چەماندنەوەی ڕۆشنبیری خوێنراوە بۆ ڕۆشنبیری خوێنەر، لە واقیعیشدا زۆرێک لە نوێگەرانی عەرەب ئەوە ناشارنەوە کە ئەوان بە چاویلکەی فڕانکفۆنی پەڕەکانی کەلەپوور هەڵدەدەنەوە، تەنانەت «جابری» دەڵێت:

"ئەو تێبینییەی یەکێک لە هاوڕێیان کە گوتی: 'زیاتر ئەبستمۆلۆژیای فەڕەنسی لە نووسینی تۆدا ئامادەیی هەیە.' بەڵێ، ئەوەڕاستە، بۆ چەند هۆکارێکیش دەگەڕێتەوە: خودی و بابەتی. هۆکارە خودییەکان ئەوەیە کە ئێمە لە مەغریب زیاتر وابەستەی ڕۆشنبیری فەڕەنسین وەک لەوەی وابەستەی ڕۆشنبیری ئەنگلۆسەکسۆنی بین." [٢]

---

(١)بۆ خوێندنەوەی نموونەیەک لە تێڕوانینی فڕانکفۆنییەکان بۆ خۆیان دەتوانرێت ئەو پەرتووکە وەدەست بخرێت کە ئەنجوومەنی باڵای فڕانکفۆنییەکان دەریانکردووە، کە ئەڵقەی دەیەمە لە زنجیرەی «نامیلکەکانی فڕانکفۆنییەت»، ئەویش بە ناونیشانی: (الفرانكفونية العربية:دراسات وشهادات) ترجمة:جيهان عيسوي، ئەم پەرتووکەش هاوکات لەگەڵ لووتکەی «فڕانکفۆنییەتی عەرەبی» دەرچوو کە لە ئۆکتۆبەری(٢٠٠١ز) لە بەیروت بەسترا، خوێنەر لەو پێشەکییەی کە «شارل جۆسلان» بۆ پەرتووکەکەی نووسیوە -وەک «وەزیریڕاسپێردراو بۆ هەماهەنگی و فڕانکفۆنییەت»- تێزێکی ئەوپەڕی سەیر و نامۆی بەرچاو دەکەوێت، کە جۆسلان لە پێشەکییەکەیدا هەوڵ دەدات خوێنەری عەرەب قایل بەوە بکات کە فڕانکفۆنییەت باشترە بۆ عەرەب لە ئەمریکاندن! چۆن بڵێیت سەپاوە لەسەرمان یەکێکیان هەڵبژێرین. بۆ خوێندنەوەی شیکاریگەلی ڕەخنەیی جۆراوجۆر سەبارەت بە فڕانکفۆنییەت. بڕوانە: عبدالإله بلقريز، (محرر)، "الفرنكفونية، آيديولوجيا، تحد ثقافي لغوي"، مركز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الأولى، (٢٠١١م).

(٢)محمد عابد الجابري، "التراث والحداثة: دراسات ومناقشات"، مركز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الثانية، (١٩٩٩م)، (ص ٢٩٣).

بە هەمان ڕوونی و ڕاشکاوی «ئەرکۆن» دان بە هاوێنە فڕانکفۆنییەکانی خۆیدا دەنێت، وەک دەڵێت: "ئەوڕێبازانەی کە من بەسەر کەلەپووری عەرەبی ئیسلامیدا جێبەجێی دەکەم هەمان ئەوڕێبازانەن کە زاناکانی فەڕەنسا بەسەر کەلەپووری مەسیحی لاتینی یاخود ئەورووپی خۆیاندا جێبەجێی دەکەن".

وادیارە کە ئەم ڕەواجە خێرایە بە شێوەیەکی کاتی دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی تەوژمی ئیسلامی چارەی ئەمنی خۆی بۆ دەگەڕێتەوە؛ ئەگینا ئەگەر قوتابخانەی فڕانکفۆنییەت پشتی بە بلیمەتی تێزە تایبەتەکانی خۆی ببەستایە، مۆزەخانەکەی هەر لە هەشتاکانەوە ئاوەدان دەبوو، نەک لەدوایساڵی ٢٠٠١زاینییەوە! بەڵام ڕەواجی پاش بێبازاڕی بەشوێن زەمینلەرزەی دۆخی سیاسی سێپتەمبەریدا هات کە هاوسەنگییەکانی هێزی سەرەوژێر کردەوە کە ڕێگەی بە زۆرێک لە هزرە سیاسییە تێکشکاوەکان دا لەپشت مێزە بازنەییەکانەوە بزە بکەن.

بەهەرحاڵ، زۆرێک لەو لاوانەی ئیسلام کە لە پێشانگاکانی کتێبدا ڕوویان لە بەرهەمەکانی قوتابخانەی فڕانکفۆنی کرد و لە بەرانبەرڕەفەکانی خانەی وەحدە و ساقی و جومەلدا هێشتا پەرتووکەکانیان بەتەواوی نەخوێندبوویەوە وەلێ چەمکە شاراوە زاڵەکانی ناویان بەتەواوی نۆشکردبوو، یاخود بە واتایەکی دیکە لۆژیکی ناوەوەی ئەو توێژینەوانە، لە لووتکەی ئەو چەمکانەشدا سەنتەربوونی مەدەنییەت و بە ئامانج گرتنی شارستانییەت.

ئەو توێژەی لە دەمی قەیرانی کەنداو سەرقاڵی خوێندنەوەی گۆڤاری (المجتمع)، گۆڤاری (البيان)، مەودودی، سەیید قوتب، نەدەوی، موحەممەد قوتب، موحەممەد غەزالی، فەتحی یەکون، موحەممەد ئەحمەد ڕاشید، جەمال سوڵتان و تۆزقاڵێکیش فەهمی هوێدی و موحەممەد عەمارە بوون، دۆڵابی ناو سەیارەکانیان ئاخنرابوو لە کاسێتی عەودە و حەوالی، دەمەوئێوارەی سێپتەمبەر دەستیان دابووە خوێندنەوەی قوتابخانەی فڕانکفۆنی/مەغریبی

کە بەناوبانگترین کەسایەتییە گەورەکانی موحەممەد عابید جابری و عبد اللّٰه عورەوی و موحەممەد ئەرکۆن و عەبدولمەجید شورەفی و عەبدوڵمەجید صەغیر بوون، لەگەڵ بڕێکی کەم لە کەسایەتی ڕۆژهەڵاتی کە نزیک بوون لەم ئاڕاستەیەوە، وەک حەسەن حەنەفی و خەلیل عەبدولکەریم و نەصرِ حامید ئەبوو زەید و عەبدولجەواد یاسین و طەیب تێزینی و حوسێن مەڕوە و عەلی حەرب و فیراس سواح و نموونەی ئەمانە.

ئەم توێژە لە گەنجانی ئیسلامی لەسەر کورسییەکانی قوتابخانەی فڕانکفۆنی/ مەغریبی پرسیاری شارستانییەت ڕاپچڵەکاندن، شایەنی باسە ئەوەش بڵێین کە ڕاچڵەکانێکی زۆر توند و بەهێز بوو، تا ئاستی دروستکردنی لەرزینی هزری جۆراوجۆر و لەدەستدانی توندوتۆڵی ڕۆشنبیری لەلای زۆرێک لە خوێنەران.

ئەم توێژە لاوە خاوەن پێشینە بانگخوازییە ئیسلامییە لە سەرەتادا هەوڵیاندا وەڵامێک بۆ پرسیاری شارستانییەت پێشکەش بکەن کە هەردوولا ڕازی بکات و خۆیان لابدەن لە پێکداداان بەو شووناس و ئینتیما قووڵەی ڕایکێشاون، هەروەها خۆشیان لەلای ئەو سەلیقە هزرییە خۆشەویست بکەن کە تازە وا خەریکی خوێندنەوە و ملدانن بۆ هەژموونی گوتارەکەی، بەڵام بەر لەوەی وەڵامبدەنەوە وەک نەیارەکانیان بیریان کردەوە و پڕەنسیپەکانی ئەوانیان وەرگرت.

ئەم توێژە لاوە هێشتا لەوە حاڵیی نەبوون کە قوتابخانەی فڕانکفۆنی/ مەغریبی دووبارە پێکهێنانەوەی تەواوی بۆ لۆژیکییان ئەنجامداوە، دووبارە ڕێکخستنەوەی ڕێگای بیرکردنەوە و شێوازی ئاوێتەبوونیان لەگەڵ شتەکاندا، شێوەی ڕوانینیان لە واقیع، هەروەها هەڵسەنگاندنیان بۆ ڕووداوەکانیان، لەڕێگای هەڵمژینی ئامڕازە تایبەتەکانی خوێندنەوە و لێکدانەوە و تێبینیکردنیان و دووبارە ڕیزکردنەوەی هەڕەمی ناوەوەی بەهاکان و دووبارە کێشانەوەی خشتەی زەینی لەپێشینەییەکان.

ئەو پرسیارەی لێرە لەم شوێنەدا قوت دەبێتەوە ئەوەیە: جیاوازی چییە لەنێوان عەلمانییەتی عەرەبی پێش١٩٨٤ز و عەلمانییەتی عەرەبی دوای١٩٨٤ز؟

کە ساڵی١٩٨٤ز ئەو ساڵە بوو کە یەکەم ئەڵقە دەرچوو لە زنجیرەی (نقد العقل العربي) -ڕەخنەگری لە عەقڵی عەرەبی- لەلایەن موحەممەد عابید جابری بیریاری مەغریبیی بەناوبانگەوە، کە دەمی -پەیمانی نوێی تەلمۆدی عەلمانییەتی عەرەبی ناوبژیوان-ی کردەوە، کە چوار ئەڵقەی سەرەتای ئەم زنجیرەیە کە بەدوای یەکدا بڵاوکرانەوە بە ناونیشانی: (تكوين العقل العربي - پێکهێنانی عەقڵی عەرەبی) و (بنية العقل العربي - پێکهاتەی عەقڵی عەرەبی) و (العقل السياسي العربي - عەقڵی سیاسی عەرەبی) و (العقل الأخلاقي العربي - عەقڵی ئەخلاقی عەرەبی) تەواوکاری ڕێبازی ئەو کۆمەڵە توێژینەوە پەرت و بڵاوانەی پێشووی بوو کە لە نووسراوەی (نحن والتراث - ئێمە و کەلەپوور)دا پێشکەشی کردبوو.

هەربۆیە هەندێک لە مێژوونووسانی لیبراڵی پێیان وایە کە **ئەگەر طەهطاوی** دامەزرێنەری ئەزموونی هەستانەوەی یەکەمی عەرەبی بێت، **ئەوا جابریش** دامەزرێنەری ئەزموونی دووەمی عەرەبییە، هەروەک (سعدالدين ابراهيم) زانای کۆمەڵناسی و چالاکوانی بەناوبانگ دەیڵێت.

بگرە بەناوبانگترین ڕەخنەگری توند لە پڕۆژەکەی جابری کە نزیکبووە نیوەی تەمەنی لە لێکۆڵینەوەی قسەی هەڵبژاردە و گواستراوە و نێوان فاریزەکانی بەرهەمەکانی جابری دابنێت، کە ئەویش بیریاری عەرەبی ناسراو «جۆرج طەڕابیشییە» دان بەوەدا دەنێت کە جابری نەک هەر کاریگەری لەسەر مورید و قوتابیانی خۆی هەبووە، کە ئەمە ڕووداوێکی مێژووییە و بەردەوام دووبارە دەبێتەوە، بەڵکوو بەوەی کە هەژموونێکی سەرسامکەری بەسەر هاوتاکانی خۆشیدا هەبووە، کە تەنانەت طەڕابیشی ڕەخنەگر خۆشی لە یەکەم ڕووانین

و خوێندنەوەی بەرهەمەکانیدا لەوە دەرباز نەبووە کە «جۆرج طەرابیشی» -سەرسەختترین بۆسەدانەر و ڕەخنەگری جابرییە- لە باسی سەرسامبوون و کاریگەربوونی بە کتێبەکەی جابری لە یەکەم خوێندنەوەیدا دەڵێت:

«با ڕاشکاوانە بابەتێکی تایبەتی بۆ خوێنەر بخەمەڕوو، کە من لەدوای سێ مانگ لە دەرچوونی» پێکهێنانی عەقڵی عەرەبی لە گۆڤاری «وەحدە»دا نرخاندنێکی باڵام بۆ کتێبەکە نووسی، هەروەها هەندێک پەڵپی تاک و تەرەی وردەڵەش، لەدواییدا بەوە کۆتاییم پێ هێنا کە گوتم: "بەڕاستی زەینی مرۆڤ لەپاش خوێندنەوەی پێکهێنانی عەقڵی عەرەبی وەک ئەوە نامێنێتەوە کە پێشووتر لەسەری بووە، چونکە ئێمە لەبەرانبەر تێزێکدا وەستاوین کە توانای گۆڕانکاری هەیە، نەک تەنها تێزێک کە ڕۆشنگەری بکات ... "[١]

کاریگەریی بیریار لەسەر هاوتا و هاوچاخ و کێبەرکێکارانی، حاڵەتێکی سەیر و دەگمەنە لەڕەشنووسی مێژوودا. لە کاتێکدا کە هاوچەرخی پەردە و ڕێگرە.

پێشتریش مێژوونووسانی هزری عەرەبی ئەم دیاردەیەیان تێبینی کردبوو کە بە نموونە (رضوان سید) دەڵێت: "جابری ئەو بیریارە عەرەبەیە کە خاوەن زۆرترین جەماوەر و هەواداری ناو ناوەندی گەنجانی جیهانی عەرەبییە".[٢]

ڕاستییش ئەوەیە کە قورسایی جابری و ئەوەی کە خاڵێکی وەرچەرخانە نزیکە کۆدەنگی سەرجەم کەسایەتییە هاوچەرخەکانی لەسەر بێت، ئەمەش واتای ئەوەیە کە هەڵواسینی مێژووی دیاردەی عەلمانییەتی/ناوبژیوانی بە جابرییەوە زۆر نییە بەراورد بە قورسایی و توانای کۆنکریتبڕی ئەو کە سەرجەم تەوژمە کێبڕکێکارەکانی توانایان بەسەریدا نەشکا.

ئەوجا هەڵوێستی خودی جابری لە هەمبەر چەمکی عەلمانییەت هەڵوێستێکی

---

(١)طرابيشي، "نظرية العقل"، دار الساقي، الطبعة الثانية، (١٩٩٩م)، (ص ٨).

(٢)رضوان السيد، "محمد عابد الجابري وتفسير القرآن"، صحيفة الحيادة، العدد: (١٧٢٠٠).

ئاڵۆز و ناڕوونە کە جابری لە بەرهەمەکانی سەرەتایدا ڕاشکاوانە عەلمانییەتی خۆی دەردەبڕی و فەڕوبەرەکەتی لێ دەخواست، هەروەک بە شانازییەوە دەڵێت: "فەلسەفەی عەرەبی لە مەغریب و ئەندەلووسدا خاوەن ئاڕاستەیەکی عەلمانی بوو."(١) یان لە شوێنیکی دیکەدا لە شێوەی بەڵگەهێنانەوەیەک دەڵێت: "جا ئەمە نابێت ببێتە ڕێگر لەبەردەممان کە گرنگی ئەم ئاڕاستە عەلمانییەی ناو گوتاری ئیبن باجە وەدەربخەین"(٢)، بەڵام لە کارەکانی ئەو دواییەیدا جابری مەیلی بەو لایەدایە کە دەستبەرداری ”دەستەواژەی“ عەلمانییەت بێت لەپاش ناشرینبوونی و بانگەوازی بۆ ئەوە دەکات کە ناوەڕۆکەکەی بئاخنرێتە ناو دەستەواژەگەلێکی دیکە کە کەمتر هەستیاری خوێنەری ئیسلامی بورووژێنن، هەروەک بەنموونە جابری خۆی دەڵێت: "هیچ دروشمێک لە دروشمەکانی هزری نوێی عەرەبی هێندەی دروشمی عەلمانییەت مایەی ئاڵۆزی و هەڵەتێگەیشتن نەبووە"، لەپاشان دەڵێت: "لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە ئێمە بانگەواز بۆ پێویستیی دوورخستنەوەی دروشمی عەلمانییەت لە فەرهەنگی هزری عەرەبی دەکەین، هەروەها گۆڕینەوەی بە دوو دروشمی «دیموکراسییەت وعەقڵانییەت و ... »."(٣)

بەڵام ئەوەی کە دیسانەوە دەبێتە گرفت بۆ ئەم هەڵسەنگاندنە نەرێنییە بۆ دروشمی عەلمانییەت ئەوەیە کە جابری لەوسەرەوە دێتەوە و «ناواخن»ی عەلمانییەت لە شوێنگەلێکی دیکەدا دەپەڕێنێتەوە، چۆن بڵێیت ڕەخنە لە دەستەواژەی عەلمانییەت دەگرێت و لەپاشانیش ڕەخنەکە لە ناوەڕۆکی خۆی بۆش و بەتاڵ دەکاتەوە، بە شێوەیەک کە جابری لە کتێبێکی دواتریدا -بەنموونە-

---

(١)الجابري، ”نحن والتراث“، المركز الثقافي العربي، الطبعة السادسة، (١٩٩٣م)، (ص ٩).

(٢)الجابري، ”نحن والتراث“، (ص ١٩٢).

(٣)الجابري، ”في نقد الحاجة إلى الإصلاح“، مركز دراسات الوحدة، الطبعة الأولى، (٢٠٠٥م)، (ص ٨٣-٨٤).

دەڵێت: "ئیسلام دین و دەوڵەتە، بەڵام وەها بۆ دەوڵەت تەشریع نەکراوە کە بۆ دین تەشریعکراوە."[١] هەروەها ئەو بیرۆکە عەلمانییە دەچەسپێنێت کە دەڵێت شەریعەت پەیوەندی بە سیستمی حوکم و داوەرییەوە نییە، دەڵێت: "سیستمێکی حوکم نییە کە ئیسلام تەشریعی بۆ کربێت." [٢]، جا ئەم ڕاڕاییە لەنێوان ڕەتکردنەوەی دروشمەکە و دزەپێکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی وای دەنوێنێت کە پاڵنەرەکانی ڕەتکردنەوە ستراتیژین، نەک باوەڕی[٣]، بەتایبەت ئەوەی کە بەئاشکرا ڕەتکردنەوەی دەستەواژەکە -وەک بانگەشەی دەکات- هەر لە سەرەتای هەشتاکانەوەڕوویداوە، واتە لەگەڵ هەڵهاتنی هێز و گوشاری ڕۆشنبیریی ڕابوونی ئیسلامی.

ئەم وشەبازییەش بە هەڵهاتن لە دەستەواژەی عەلمانییەت و لەو لایەشەوە پێشکەشکردنی هەمان ناوەڕۆک لەناو دەستەواژەگەلێکی دیکەدا، شێوازێکی تایبەت بە جابری نییە بەڵکوو ئەم ستراتیژییەتە تەڵەکەبازە هەر لە وەختی سەرگرتن و بردنەوەی ڕابوونی ئیسلامییەوە لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری کۆمەڵگایی بە بەرزڕاگرتن و شکۆدانانی حوکمی شەریعەت، لەناو ڕۆشنبیرە عەلمانییە عەرەبەکاندا ڕەواجی پەیدا کردووە، دەشتوانین چەند نموونەیەک لەوە بۆ هەندێک لە عەلمانییە عەرەبەکان بێنینەوە، نموونەیەک لەوە «جابر عصفور» دەڵێت: "مادەم ئیدی دەستەواژەی عەلمانییەت شکۆی شکاوە و ناوی

---

(١) الجابري، "العقل السياسي العربي"، مركز دراسات الوحدة، الطبعة الخامسة، (٢٠٠٤م)، (ص ٣٨٥).

(٢) الجابري، "العقل السياسي العربي"، مركز دراسات الوحدة، الطبعة الخامسة، (٢٠٠٤م)، (ص ٣٧١).

(٣) دواتر ئەوەشم بەرچاوکەوت کە ریضوان سەیید -کە لەڕۆشنگەران ئەژماردەکرێت- لەبارەی عەلمانییەت لەلای جابری دەڵێت: "هزری عەلمانیش، کە جابری حەزی بە دهستەواژەکەی نایە با بە ناوەڕۆکیش جێگیری کردبێت". بڕوانە: رضوان السيد، "المثقفون العرب والموروث الإسلامي" المصدر... ئەم وێناکردنەی ریضوان سەییدیش بۆ هەڵوێستی جابری لە هەمبەر عەلمانییەت بە وێناکردنێکی وورد و ڕاست دەبینم.

زڕاوە؛ وا باشترە دەستەواژەی «دەوڵەتی مەدەنی» بەکاربێت".[١]

باشە، لێگەڕێ بابەتەکە بە شێوەیەکی ڕوونتر نمایش بکەین: جیاوازی لەنێوان قوتابخانەی «صادق جەلال عەزەم و زەکی نەجیب مەحفوز و فوئاد زەکەریا و موحەممەد ئەحمەد خَلَف الله» و هاوشێوەکانیان لەنێوان قوتابخانەی «جابری و ئەرکۆن و حەسەن حەنەفی» و هاوشێوەکانیان چییە؟

بەو واتایەی: نهێنی هێزی کێشکردن لە توێژینەوەکانی عەلمانییەتی عەرەبی هاوچەرخ کە زەینی لاوانی ئیسلامی فریوداوە و وای کردووە ئەم ڕەنگە لە توێژینەوە و نووسین لە ناویاندا جێی خۆی بگرێت؟

حەقیقەتەکە ئەوەیە کە جیاوازی بنچینەیی بریتییە لە گۆڕینی شێوازی بەئامانجگرتنی ڕاستەوخۆی شەریعەت بۆ شێوازی دووبارە لێکدانەوەی توراس لە ڕێگای ئەو کەرەستانەوە کە زانستە مرۆییە نوێکان لەخۆیانگرتووە، بەشێوەیەکی دیکە بڵێم: یانی بازدان لە پرسی ئەنتۆلۆجییەوە بۆ پرسی ئیبستمۆلۆژی.

ئەم جیاوازییە کە بریتییە لە نمایشکردنی دەستوور لە دەفرە ئەنسرۆپۆلۆژییەکاندا- کەڕێک خودی ئەمەیە سەرچاوەی کاریگەربوون و کەمەندکێشبوون لەلای خوێنەری ئیسلامی، ئەو زمانەی کە ئەو بەباشی لێی تێدەگات.

ئەم لاوانە بەشێوەیەکی ناوەڕۆکی زۆرێک لە «چەمکە بارگاوییەکان بە لێکدانەوەی عەلمانی شاراوە»یان هەڵمژی، یاخود ئەوەی کە بە ئاڕاستەی وێناکردنە عەلمانییەکاندا پاڵدەنێت، لە وێنەی چەمکی چاخی تۆمارکاری، بەدەقکردنی سیاسی، عەقڵی داهاتوو، ئەرسۆزۆکسی ئیسلامی، دەق وەک بەرهەمێکی ڕۆشنبیری، نەرمی/مەتاتێتی قورئان و جگە لەوانەش لە ئامرازەکانی بیرکردنەوەی عەلمانی.

---

(١) جابر عصفور، الأزهر والمثقفون، الأهرام، السنة (١٣٥)، العدد (٤٥٤٥٨).

بەهەرحاڵ، قوتابخانەی فرانکفۆنی/مەغریبی هاوچەرخ وەک ڕاشکاوترین نمایندەی ئەم شێوە گوتارە دەمێنێتەوە، هەروەها گرنگیدانی بە دوو بابەتە سەرەکییەکە: دووبارە شرۆڤەکردنەوەی توراس و لێکدانەوەی ئەنسرۆپۆلۆژی بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی، سەرچاوەی سەرنجڕاکێشان و خەڵەتاندن بوون کە دزەکردنی بۆ ناو شووراکانی ناوخۆی ئیسلامییان بۆ دەستەبەرکرد، چونکە بابەت و ناوەندە هاوبەشەکانی گرنگیپێدان هەمیشە زمانێکی هاوبەشی تێگەیشتن دەنوێنن، خاڵێکی یەکتربینین و ناسین دەنوێنن، -کە زۆرجار- دەگۆڕێت بۆ حاڵەتێکی پێکگەیشتن و قیبلەنمای هەژموونیان بەپێی تەرازووی هێزە مەعریفییەکان ئاڕاستە وەردەگرێت، لە کۆتاییشدا دەگاتە حاڵەتێکی داگیرکاری ڕۆشنبیری.

لەڕاستیشدا: ساتی ماڵ گواستنەوەی ئەم چینە لاوە لەنێوان دوو قوتابخانەکەدا تەنها «ساتێکی کارلێکی سروشتی لەگەڵ شاندێکی ڕۆشنبیری دیاریکراو» نەبوو، بەڵکوو چەند هەژانێکی هزری سەرسوڕهێنەری بەخۆوە بینی کە ئەنجامی داخورپانی هەڵگەڕانەوەی پرسیاری سەرەکی نێوان دوو قوتابخانەکە بوو.

کە پرسیاری سەرەکی لە قوتابخانەی هزری ئیسلامیدا بریتیبوو لە پرسی سەرکەوتنی ئیسلام، هەرچی چەمکێکی بانگخوازیش کە دوابەدوای ئەوە پەرەی پێدرا کە چنراوی ئەم هزرە پێکدێنێت دەچێتە ژێر ئەوەوە، وەک چەمکی چارەسەری ئیسلامی، بەداوەرکردنی شەریعەت، بژاری باوەڕی، کاری ڕەوتەوانی، فیقهی واقیع، فرەڕێکخراوەیی، کاری پەروەردەیی، ڕێگریکاری لە خراپە، هۆشیارکردنەوەی ڕەوەندەکان، وەکارخستنی مزگەوتەکان، ئاسایشی هزری و پاراستنی پاکیزەیی، ڕاگەیاندنی ئیسلامی، تیمارکردنی برینەکانی مسوڵمانان، ئامادەکردنی هێز و نموونەی ئەوانە لە چەمکە ئیسلامی و شێوازە پەیوەندییە دێرینەکانی ناو ئەم گوتارە.

بەڵام پرسیاری سەرەکی قوتابخانەی فرانکفۆنی، پرسی شارستانییەت بوو بە مانا ماددییەکەی، لەپاشانیش سەرزەنشتکردنی توراس و ئاراستەی ئیسلامی و کۆمەڵگای عەرەبی و دەوڵەتی نوێی عەرەبی لەسەر بنەمای نزیکبوونەوە و دوورکەوتنەوەیان لە نموونەی ڕۆژئاوایی نوێ، کە نموونەی ڕۆژئاوایی نوێ پێوەرە ناوەڕۆکییە ئاشکرانەکراوەکە بوو، ئەگەرچی دەقی فرانکفۆنی زۆرجار پێچەوانەی ئەوە دەنوێنێت.

ئەم شۆکبوونە بە گوتاری قوتابخانەی فرانکفۆنی و هەژموونی دەزگا چەمکییەکەی و شانکێشانکێی زمانە دەستبڵاوەکەی و جبەخانەی گەواهی و بەڵگە کەلەپوورییەکانی، ئەوەی لە شانیراست و چەپی پەڕاوی دەقەکانی وەک تۆو وەشێنراوە لە ناوی بریقوباقی کەسایەتییە ئەوروپییەکان، ئەوەی ڕەوانەت دەکات بۆ لای لە ئەزموونی سەرکەوتووی ڕۆژئاوایی، هەروەها ئەوەی هەندێک لە برگەکانی لەخۆیگرتووە لە خەرمانی نارِوونی و ئاڵۆزی سەرنجڕاکێش، پەمپدانی شاراوە و بەردەوامی لەدژی هەرچی شتێکی نارۆژئاوایی هەیە، سەرکەوتوو بوو لە فراندنی بیرکردنەوەی هاوسەنگ و درزپێبردنی ئینتیمای بانگخوازی و ملپێدانی خوێنەر بۆ پرەنسیپە جەوهەرییەکانی خۆی و خۆڕادەستکردن لەهەمبەر گۆشە تایبەتەکانی ڕوانین و خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ شتەکان، هەروەها بیرکردنەوە لە جیهان لە ڕێگای خودی تۆڕی چەمکی ئەوەوە.

ئەوەی کە وایکرد گوازرانەوەی ئەم توێژەی گەنج -کە بابەتی باسەکەمانە لێرەدا-لەنێوان دوو قوتابخانەکەدا گوازرانەوەیەکی هێڵی کەڵەکەبوو نەبێت لە قوتابخانەیەکەوە بۆ ئەوەی تەنیشتی، هێندەی ئەوەی دەستلەکارکێشانەوەیەکی هزری دوژمنکارانە بوو لە سەربازگەیەکی پێشووەوە، لەپاشان ناوتۆمارکردن بۆ ئەندامییەتێکی نوێ لە سەربازگەیەکی بەرانبەریدا.

وادەزانم وەڵامە هەڵەکان بۆ پرسی شارستانییەت؛ «بەشی هەرە گەورەی پسووڵەی شڵەژانی هزری لەلای ئەم توێژە ناوخۆییەی لاو» لەئەستۆدەگرێت، کە ئەویش دەرەنجامی پێکدادان بوو لەگەڵ بریسکانەوەی گوتاری فرانکفۆنی لەژێر گوشارەکانی یانزەی سێپتەمبەردا، ئەوەی کە ناوەندی ڕۆشنبیریمان تێیدا زیاتر بە ڕێبوارێکی بەهەڵپە دەچوو کە خۆی بە نزیکترین پاسدا هەڵبواسێت تا چەتەکانی کۆشکی سپی هەڕەشەی لێ نەکەن، بەبێ گوێدانە ئەوەی کە ئایا ئەو پاسە دەیگەیەنێتە ئامانجی خۆی، یاخود بەرەو سەرەنجامێکی دیکە ڕاپێچی دەکات.

دەبێت دان بەوەشدا بنێین کە دابەزینی گوتاری ئیسلامی لەسەر مینبەرەوە بۆ ناو قەفەسی تۆمەت لە دەمی نەوەدەکان و لەپاش سێپتەمبەردا، هەندێک لە هێزی کێشکردنی کۆمەڵایەتی داشکاند، بواریشی واڵاکرد بۆ بەبازاڕکردنی گوتارگەلێک کە هەرگیز پشت نابەستن بە سەرکەوتنی خودی و تایبەتی خۆیان، هێندەی پشت بە ئامادەنەبوونی کێبڕکێکارە مکوڕەکانیان دەبەستن.

ئەمەش مانای ئەوەیە -وەک لەپێشیشدا هات-: کە گوتاری هاوچەرخی ئیسلامی هەر لەگەڵ تێپەڕاندنی ئەم قەیرانە و لەکۆڵبوونەوەی شوێنەوارە ئەمنییە توندەکانی ڕووداوی سێپتەمبەر؛ تەندروستی و پێگەی پێشڕەوی کۆمەڵایەتی خۆی بۆ دەگەڕێتەوە، ڕێک بەوێنەی ئەوەی کە وەک دیاردەیەکی سروشتی هەڵچوون و هاوار و سەرزەنشتی دەستبەجێ و تێکەڵ وپێکەڵ لەگەڵ ساتی یەکەمی ڕووداوێکی هاتوچۆدا دەبینین، لەدواییشدا هەر ئەوەندەی شوێنەوارە سەرەتاییەکانی شڵەژان تێپەڕێنران دۆخەکە دێتەوە جێ و دووبارە ڕێگاکە باری ئاسایی خۆی وەردەگرێتەوە.

مێژوو ئەوەی فێرکردووین کە شکست و ژێرکەوتنە وابەستە و پەیوەندیدارەکان بە دۆخێکی سیاسی لەگەڵ کۆتایی پێهاتنیدا ئەوانیش کۆتاییان پێ دێت.

هەربۆیە؛ کە دوورگەی عەرەبی لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە لەبەر بارودۆخی کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ)، گوتاری ئیسلامی ڕاستەوخۆ لەدوای گیرسانەوەی خەلافەت لەسەر دەستی ئەبووبەکری سدیق جێگای خۆی تێدا گرتەوە.

لە گشت حاڵێکیشدا و هەرچەندێکیش دیاردەی زێدەڕەوی مەدەنی دیاردەیەکی کاتی بێت بەو پێیەی کە پەیوەندیدارە بە چەند زەمینەی ڕووداوێکی ئەمنییەوە؛ ئێمە هێشتا لەسەرمانە دەستپێشخەری بکەین بۆ لێکدانەوە و توێکاریکردن پێکهاتە ناوەکییەکەی و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی کە سەرقاڵیان کردوە و گوتارەکانی نێو ڕۆژنامە و گوتوبێژە ئەلیکترۆنی و لێدووانەکانی سەر شاشەی کەناڵە ئاسمانییەکانی پێ پڕدەکاتەوە. ئەوەش چونکە ئێمە -پێش هەموو شتێک- وای دادەنێین کە چەند کارتێکەرێکی بابەتی بوونیان هەبێت کە لە ساتەوەختێکی مێژووییدا واتایەکی دیاریکراویان بەو پرسیارە هەسانکراوانە دابێت، بونیاد لەسەر ئەمەش ناگونجێت بێبایەخ و ساردوسڕانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین.

# ٤- یاسای بەشوێنیەکداهاتووی هزری

وەختێک پەرتووکەکانی سەبارەت بە مێژووی هزر و ڕێچکە و بۆچوونە فەلسەفییە گوازراوەکان لە سەرجەم گەلانەوە دەخوێنیتەوە؛ زۆرجار تووشی سەرسوڕمان دێیت لە نامۆیی هەندێک لە هزر و بۆچوونەکان لە وێنەی کۆتاییاندا و دژبەریان لەگەڵ چەندین بابەتی بەڵگەنەویستی دیاردا، پرسیار لە مێشکت دروست دەبێت چۆن بووە ئەو کەسانە بەم جۆرە باوەڕە سەیروسەمەرەیە گەیشتوون؟! چۆن شتە ڕوون و ڕەوانەکانیان ئاوا لێ گۆڕاوە؟!

واقیع ئەوەیە کە: زۆرێک لە هزر و بۆچوونەکان کە لە وێنەی دواییاندا ڕەزاقورس و بێزراون، یاخود لەگەڵ ئەلفوبێی وەحی و عەقڵانییەت دژبەرییان هەیە، بەوە دەستیان پێ کردووە کە پابەندی پرەنسیپێکی تیۆری دیاریکراو بوون بەبێ هێنانەڕووی تەواوی شوێنەوار و سەرەنجام و لێکەوتە کۆتاییەکانی، لەدرێژەی ڕێگای چەلەحانێ و پێکدادان لەگەڵ ناکۆکاندا خاوەنی بۆچوون بە ئامانجی پاراستنی توخمی دامەزراوبوون و نەنواندنی دژیەکی؛ پەلکێشی پابەندبوونی بەرەبەرەی دەرهاویشتەکانی ئەو پرەنسیپەی خۆی دەکرێت، ئەوەش دەیگەیەنێتە ڕێگە و ڕای وەها نەشیاو و ناقۆڵا کە بۆخۆشی گومانی وا نەبووە ڕۆژێک لە ڕۆژان پێی بگات، کە دەکرێت ئەوەش ناو لێ بنێین یاسای بەشوێنیەکداهاتووی هزری.

لە مێژوویەکی زوودا وەختێک پێشەوا ئیبن قوتەیبە (ک:٢٧٦ک) سەرنجی لادانەکانی موتەکەللیمینی سەردەمی خۆی دەدا، تێبینی ئەم بەزنجیرەهاتنەی پەرەسەندنی بۆچوونە لاڕێبووەکانی کرد و ئەوەش کە ئەوە -زۆرجار- بە ئامانجی چەسپان و پابەندبوونە، هەروەک ئیبن قوتەیبە لەبارەیانەوە دەفەرمووێت:

"خۆیان دووچاری بڕیارگەلێکی هەڵەی زل و زەبەلاح کردووە لەپێناو چەسپاندن و پەتبەردان بۆ پێوانەی خۆیان"[١]، کە ئەمە تێبینییەکی ئەوپەڕی ورد و قووڵە لە مێژووی هزرەکاندا.

پێشەوا ئیبن تەیمییەش زۆرجار ئاماژەی بەم دیاردە زانستییەی پەرەسەندنی هزرەکان دەکرد لەمیانەی گوتووبێژکردنی لەسەر بۆچوونە فەلسەفییەکان، کە ئەو لە بلیمەتترین توێژەرانی زانستی مێژووی بۆچوون و ڕەوتەکانە، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە -بەنموونە- لەوپەڕی وردیدا دەفەرمووێت:

"بنچینەی ئایینەکەیان نەبوو کە پێغەمبەر بەدرۆبخەنەوە و هەواڵ و دەقەکانی ڕەت بکەنەوە، بەڵام کۆمەڵێک بەڵگەی عەقڵییان کە هێنایەوە و جێگیریانکرد، کە یان لەخۆیانەوە دایانهێنابوو، یاخود لەوانەی غەیری ئەهلی ئیسلام وەریانگرتبوو کە وەک بەڵگە دایاننابوو، جا ناچار بوون بنچینەی بۆچوونەکانیان دەست بۆ بەردەن و لەگەڵی بڕۆن؛ تاکوو لە کەموکوڕی و هەڵوەشانەوە پارێزراو بێت، ئەوەبوو لەدواییدا کەوتنە چەندین جۆر لە دژبەریکردن و ڕەتکردنەوەی واتای هەواڵە خوداییەکان و بەدرۆخستنەوەی فەرموودە نەبەوییەکان".[٢]

نموونەی ئەمەش لەناو توێژینەوە و دەستبردنەکانی ئیبن تەیمییە بۆ شیکاری تەوژمە هزرییەکان زۆرە، وەک ئەوەی دەفەرمووێت: "خۆ ئەوان خاوەن پێگە و خاوەن عەقڵ بوون، ناچار بوون مل بدەن بۆ پەت شلکردنی و چەسپاندنی لێکەوتەکانی، بەو هۆیەوە بوو بەو ئەنجامانە گەیشتن لە ڕا و بۆچوونیان کە تێکڕای مسوڵمانان لە هاوەڵانی زانست و ئایینداری نکۆڵی لێ بکەن".[٣]

لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرمووێت: "هەر کەسێکیش پشتگیری لە

---

(١)ابن قتيبة، "تأويل مختلف الحديث"، تحقيق: محمد الأصفر، المكتب الإسلامي، (ص ١١٤).

(٢)ابن تيمية، "درء تعارض العقل والنقل"، تحقيق: محمد رشاد سالم، (٧/١٠٦).

(٣)ابن تيمية، "درء تعارض العقل والنقل"، تحقيق: محمد رشاد سالم، (ص ٢/١٠٢).

بۆچوونێكی لەڕولاواز بكات؛ تەنها دوو ڕێگای بۆ دەمێنێتەوە: یان تووشی دژیەكی دێت، یاخود پابەندی لێكەوتگەلێک بێت كە زۆر بەڕوونی ناڕاست و ناڕەوان، چونكە ئەو ئەگەر بەڵگە و بەهانەی خۆی دەست بۆ شل بكات، ئەم لێكەوتانە یەخەی پێ دەگرن، ئەگەریش وا نەكات، دژیەكی یەخەی دەگرێت".[١]

بەڵكوو پێشەوا ئیبن تەیمییە سەرنجی ئەوەشی داوە كە بەشوێنیەكداهاتووی هزری تەنانەت لە پەیوەندی نێوانی نەوە هزرییەكانیشدا دیاردەدات، هەروەک دەفەرموویت: "خۆ ئەگەر هەڵە لە خۆیدا بستێک بێت، لە شوێنكەوتوواندا دەبێت بە گەزێک، لەپاشان دوو گەز، تاوەكوو بەم ڕۆژەی دەگات".[٢]

پێشەوا ئیبن تەیمییە لە شوێنێكی دیكەدا دەفەرموویت: "داهێنراوەكان لە سەرەتایاندا هێندەی بستێک دەبن، لەپاشاندا و لەناو شوێنكەوتوواندا دەبنە چەندین باڵ و میل و فەرسەخ".[٣]

لە واقیعیشدا: یاسای بەشوێنیەكداهاتووی هزری، وەک نموونەیەكی شیكاری یارمەتیدەرمان دەبێت بۆ تێگەیشتن لە پەرەسەندنەكانی دیاردەی گوتاری مەدەنی و ئەوەی كە چۆن بوو بە چەند پرسێكی نوێگەری ئیجتیهادی ستایشكراو دەستیپێكرد، كەچی لە دواییدا زۆرێک لە نووسەرانی بە سەرەنجامگەلێكی بێزراوی بەئازار گەیشتن، جا زۆرینەی ئەو گەنجانە كە دەستیان بە خوێندنەوەی بەرهەمەكانی قوتابخانەی فڕانكفۆنی كردووە، هاندەری سەرەكییانە لە سەرەتادا بۆ مەبەستێكی جوان و ماقووڵانە بوو، كە بریتیبووە لە گەشەپێدانی توانا لێكدانەوەییەكانیان و بەدەستهێنانی كەرەستە هزرییەكان بە ئامانجی بەهێزكردنی گوتاری ئیسلامی و پاڵپشتیكردنی بەڵگەیەتی، زۆرینەشیان هێشتا

---

(١) ابن تيمية، "العقود"، تحقيق: محمد حامد الفقي، (ص ٨٥).

(٢) ابن تيمية، "بغية المرتاد"، تحقيق: موسى الدويش، مكتبة العلوم والحكم، الطبعة الثالثة، (١٤٢٢م)، (ص ٤٥١).

(٣) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى"، (٨/٤٢٥).

ئەو بابەتانە نەگەیشتبووە گەروویان بوون بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەمیان: ئاگاداری پووچییێتی ئەو بنچینە ناوەڕۆکییە بوویەوە کە ئەم توێژینەوانەی لەسەر دامەزراوە کە بریتییە لە بە ئامانج دانانی شارستانییەت، یاخود سەنتەربوونی مەدەنییەت (بە پێناسە ماددییەکەی)، جا بنیاد لەسەر ئەوە زۆرینەی ئەنجامەکانیش کە ئەم توێژینەوانە لەخۆیان گرتبوو بەتاڵبوویەوە، هەر لە بەسووک تەماشاکردنی توراس و بەگەورەدانانی ڕۆژئاوا، لەپاشان وریابوونەوە لە دوو ئامڕازی هەرە کاریگەر لەم قوتابخانەیەدا بۆ پەڕاوێزخستنی توراس کە ئەوانیش: ئامڕازی بەسیاسیکردن، و ئامڕازی قەرزاربارکردنەوەن.

جا ئامڕازی بەساسیکردن، واتە: دووبارە لێکدانەوەی سیاسی بۆ تیۆرە شەرعییەکان و جووڵەکانی کەسایەتییە ناسراوەکانی ناو توراس و هەوڵدان بۆ بەستنەوەی بە ململانێی سیاسییەوە لەژێر ناونیشانی هیومانیزەیشن (مرۆڤاندن)، ئامڕازی قەرزاربارکردنەوەش بە واتای: هەوڵدان بۆ بەستنەوەی سەرجەم چەمک و بنەما شەرعییەکان -کە فەقیهەکانی ناو توراس دایانڕشتۆ- بە ڕۆشنبیرییەکانی پێش ئیسلامەوە، وێناکردنی وەک تەنها قەرزکردنێکی کەلتووری و خواستنێکی مەعریفی و ڕۆشنبیری، لە ڕۆشنبیرییەکی هاوردەوە وەک ڕۆشنبیرییەکانی هیرەمسی و غونووسی و فارسی و یۆنانی، ڕوونکردنەوەی زیاتریش لەسەر ئەم دوو ئامڕازە دێت.

بەڵام کۆمەڵی دووەم -کە زۆرینە بوون-: نائاگایانە خۆیان ڕادەستی بنچینەی ناوەڕۆکی ئەم توێژینەوانە کرد، کە بریتییە لە سەنتەربوونی مەدەنییەت (بە پێناسە ماددییەکە)، بەڵام وەک نیازپاکییەکیش هەوڵی بەرگریکردنیان لە ئایین و کەلەپوور و ئوممەتی خۆیان داوە، لەڕێی جەختکردنەوە لەوەی گوایە وەحی و توراس لەپێشینەیەتی مەدەنییەت و شارستانییەتیان لەخۆ گرتووە، لەپاشان گواستیانەوە بەرەو ئەندێشەی لێکدانەوەی مەدەنی بۆ کەلەپوور.

ئەوجا دەستیان کرد بە گەڕان لەناو ناوەڕۆکەکانی وەحی و توراس بەشوێن هەر بەڵگە و نیشانەیەک کە لەگەڵ مەدەنییەتی ماددی نوێدا بگونجێت، هاوکات ڕەخنەگرتن لە هەرچی واتا و ناوەڕۆکی دیکەی ناو توراس کە لەگەڵ ئەوەدا ناگونجێت، ئیدی خەمی سەرزەنشتکردنی ئیسلامییەکانیان هەڵگرت، تاوەکوو خۆیان لە سیمایەکی مەدەنیانەدا دەربخەن کە لەگەڵ سەلیقەی مەدەنی نوێدا بگونجێت.

بە سروشتی حاڵیش: لەگەڵ گشت پڕۆسەکانی سەرلەنوێ تەئویلکردنەوە کە ئەم گوتارە لەسەر وەحی و توراس جێبەجێی دەکرد، بە هەرچی لەخۆی دەگرێت لە زەقکردنەوە یاخود دوورخستنەوەی بەمەبەست بۆ کۆمەڵێک دەق و کەسایەتی دیاریکراو، بە ئامانجی پێکسازان لەگەڵ شێوازی نوێی مەدەنییەتی ماددیدا؛ بەڵام سروشتی وەحی و توراس لە خودی خۆیدا ژێرباری ئەمە نەبوو و ناوەڕۆکی جەوهەری وەحی هەر بەزیندوویی ماوەتەوە و نەشاردراوەتەوە. جا لەگەڵ ئەو هەموو دەقانەدا کە پەلەپروزێ شرۆڤەیان کردبوو -بەنموونە- لە دەقی نووسینەکانی ئیبن ڕوشد یاخود شاطبی یان ئیبن خولدوون یاخود ئیبن حەزم و جگە لەمانەش، هێشتا خودی دەق و نووسراو و وتەی ئەم زانایانە ئەنجامە کۆتاییەکانی ئەم قوتابخانەیە هەڵدەوەشێننەوە، ئەمە سەرباری وێنەی چاخە زێڕینەکان، بگرە خودی دەقەکانی وەحیش کە لە دواتردا هەوڵی خستنەڕووی هەندێک لەوە دەدەین.

بەڵکوو وێنەی خودی گوتارەکە لەئێستادا وێنەیەکی بەزۆر گونجاندن و کزۆڵە کە هەر لەناو پێکهاتەی ناوەکی خۆیدا بەدەست فشۆڵییەکی زانستی قووڵەوە دەناڵێت، لە ئەنجامی پشتبەستنی بە بڕین و لێکدان و ونکردنێکی نائەکادیمی و دوور لە پێوەرگەلێکی ڕۆشن کە بکرێتە دادوەر بەسەریەوە، بەو واتایەی کە: بۆتە تێکەڵەیەک لە کۆمەڵێک ئەنجام کە دەکرێت پێچەوانەکەشی بسەلمێنرێت، یانی نەیارانی دیدگای ئیسلامی دەتوانن سادەوئاسان خوێنەری پێ بێننە

پێکەنین، چونکە ئەو ژمارە زۆرە لە ئایەتەکانی سەبارەت بە سەنتەربوونی ژیانی ڕۆژی دوایی و لۆمەکردنی دنیا و خۆشگوزەرانییەی و ئەو زمانە غەیبی-پەنهانییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ دیاردەکاندا، هەروەها ئەو پێوەرە ئایینییە بۆ شێوازەکانی پەیوەندی و ڕوونکردنەوەی بێنرخی مرۆڤی بێباوەڕ و دابەزاندنی بۆ ئاستی وڵاغ و گیانەوەران، پۆلێنکردنی زانستەکانی بێباوەڕان بە زانستگەلێکی ڕواڵەتی و شێوەی ڕاشکاوانەی سنووری سزا تاوانکارییەکان، زۆری دیکەش جگە لەمانە کە سەرجەم توانا فریاگوزارییەکانی گوتاری مەدەنی لە دووبارە لێکدانەوەی کەلەپووردا بەرگەی ناگرن.

مەبەستیش لێرەدا: ئاماژەکردنە بە پەرەسەندنەکانی ئەم گوتارە نوێیە مەدەنییە و ئەوەی کە زۆرینەی لادانە کۆتاییەکانی تەنها کۆمەڵێک هەوکردن و پەرچەکرداری زۆروزەبەندەی تێکەڵ و پێکەڵن کە بەناویەکدا شەپۆڵ دەدەن، لەگەڵ بوونی جیاوازییەکی توند و قووڵیش لەناو خۆیاندا.

جا سەرەتای زۆرێک لەمانە -پیاو بۆ خوا بڵێ- سەرەتایەکی باش بووە کە وایان دیوە ناتوانین پەیامی ئیسلامی خۆمان و سەربەرزی کۆمەڵگاکەمان بڵاوبکەینەوە مەگەر لەڕێگای ئامرِاز و توانا نوێکانەوە، لەپاشان توێژینەوەیان لەسەر شارستانییەت و هەستانەوە و توانا مادديیە نوێکان کاری بەوە گەیاندن کە بە شێوەیەکی کرداری ناوەڕۆکی ئەو ڕەگەزانە لە خودی خۆیاندا لەلایان ببێتە ئامانج، دوابەدوای ئەوەش وەختێک بینیان کە ڕەخنەگرتن لە ڕۆژئاوا دەبێتە کۆسپ و پەردە لەنێوان لاو و شارستانییەتی ڕۆژئاواییدا و مەرجەعییەتی دەهەژێنێت؛ زێدەڕەوییان کرد لە پاکانەکردن بۆ لادانەکانی شارستانییەتی ڕۆژئاوایی و دەستیان بۆ ئەو بەڵگانە برد کە لەگەڵ ئەو دۆخەی ئەواندا تەبایە. لەپاشان کاتێکیش لە ئەنجامی هەوڵەکانی سازاندنی حوکمەکان لەگەڵ ئەنجامەکانی ڕۆژئاوادا ماندوو و شەکەت بوون، تووشیان بە تووشی زۆر چەمکی شەرعی خاوەن ڕەگی ئایینی/پەنهانییەوە بوو لە وێنەی بابەتە باوەڕییەکان

و دروشمەکان و حوکمە شەرعییە وردەکارەکان و وێناکارییە پەنهانییەکان و نموونەی ئەوانە، جا زۆرێکیان هەوڵی جێگیرکردنی ئەوەیان دا کە ئەسڵەن مەبەستی کۆتایی هەموو ئەم تەشریعانە بریتییە لە: ئاوەدانکردنەوەی زەوی و بنیادنانی شارستانییەت. بەو شێوەیە ئەم چەمکە شەرعییانە ئیدی لە خودی خۆیاندا و لە سێبەری ئامرازێتی پەتییان بەرەبەرە بەهایان بێتە خوارەوە و هاوکات بەهای مەدەنییەتی ماددی ڕۆژئاوایی بچێتەسەرەوە بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە مەبەستی کۆتایی بەدیهێناوە کە ئەویش شارستانییەتە، لەدواتریشدا دۆخەکە لە سەرسامبوون بە شارستانییەتی هاوچەرخی ڕۆژئاواوە بەرەو سەرزەنشتکردنی جووڵانەوەی ئیسلامی و زبری نواندن لەگەڵیدا پەرەیسەند، بەپێی نزیکبوونەوە یاخود دوورکەوتنەوەی لە شارستانییەتی هاوچەرخی ڕۆژئاوایی، لەوەشەوە دیاردەکانی جیابوونەوە و ترازان لە مەشخەڵەکانی باوەڕ و ئامۆژگاری و یادهێنانەوە هاتنە بوون. ئیدی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پشکۆی ئیمان بێسۆتر دەبوویەوە و ملکەچی ساردوسڕتر و بەندایەتی خامۆشتر دەبوویەوە.

دواتر هەندێکیان کاریان بە زۆر لەوە خراپتریش گەیشت، کە دەستیان بە گەڕان کرد بەشوێن کۆسپ و تەگەرە بۆ واتا ناوەڕۆکییەکانی خودی شەریعەت خۆی، تاوەکوو هەندێکیان بەوە گەیشتن کە گرفت لە سوننەتی نەبەویدایە، کە خەڵکی لە کەیسی شارستانییەت لاداوە بەرەو وردەکارییە بچووکەکان، بەم شێوازە دۆخەکە لە خراپەوە بۆ خراپتر درێژە دەکێشێت.

وەک ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی ستەمگەلێکی ئەلیکترۆنی کە هەندێک لەم نووسەرانە ڕووبەڕووی بووبوونەوە لە سەرەتای نووسینەکانیاندا، وەک دانەپاڵی هەندێک دەرهاویشتە و ئەنجام و گومڕاکردنیان پێی کە خۆیان پێی ڕازی نەبوون و ڕایان لەسەر نەبوو، یاخود بەستنەوەیان بە لایەنێکی دەرەکییەوە بە بوهتان و نارەوایی، زۆرێکیان ململانێی نەیارانیان پلەپلە بردنی بەرەو هەڵگەڕانەوە بەسەر دیدگای ئیسلامیدا و حەزێکی شاراوەی بەهێز بۆ جەختکردنەوە

لە خۆجیاکردنەوە، بە بۆنە و بەبێ بۆنەوە، تا ئەوەی کاری هەردوو گرووپی ستەمگۆڕەوە بەوە گەیشت پەنابەرنە بەر یەکێک لە دوو باڵەکەی دەوڵەت دژ بە گرووپەکەی دیکە.

لە حەقیقەتدا: کەوتنە ناو ستەم و زێدەڕەوی لەلایەن هەندێک لەوانەوە کە خۆیان داوە تەپاڵ فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە، نەریتێکی مێژوویی بووە. پێشەوا ئیبن تەیمییە لە زۆرێک لە کتێبەکانیدا ئاماژەی بەمە کردووە، لەوانە ئەوەی کە دەفەرموێت: "هەروەها وەک چۆن لەوانەیە هەندێک لەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ سوننەت ستەم لە هەندێکی دیکەیان بکەن، یاخود لە جۆرێک لە بیدعەچییانی بکەن، بە زیاد لەوەی پەروەردگار فەرمانی پێ کردووە، ئەویش ئەو زێدەڕەوییەیە کە قورئان لەسەر زمانی باوەڕداران دەفەرموێت: «پەروەدگارمان لە تاوانەکانمان و لە زێدەڕەویکردنمان لەم کارەماندا خۆش ببە.»"[1]

بگرە کۆمەڵێکیان لە بابەتی وەهادا هێرش دەکەن و توندی دەنوێنن کە لە بنەڕەتدا بەڵگەیان لەسەری لەلا نییە، بەڵکوو دەشێت ڕای بەهێز ئەوەی لای بەرانبەرەکانیان بێت، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە لە ڕووداوێکی هاوشێوەدا دەفەرموێت: "گرۆیەک لەوانەی کە دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) پەروەردگاری بە چاوی سەر بینیوە گرۆی بەرانبەریان تەکفیردەکەن، بنیاد لەسەر ئەوەی کە وا دەزانن چەند فەرموودەی ڕاست و چەسپاو لەو بارەوە هاتووە، وەک ئەبولحەسەن عەلی کوڕی یەشکور کردوویەتی کە پیاوێکی زۆر بەدەسوبردە بۆ تەکفیرکردنی هەرکەس کە پێچەوانەی ڕای ئەو وەربگرێت لەوەی کە ئەو وا بانگەشە دەکات کە لە سوننەتە، کە لەوانەشە هەڵە بێت تێیدا، یان بەهۆی بەڵگەهێنانەوەی بە فەرموودەگەلێکی لاواز، یاخود فەرموودەگەلێک کە چەسپاون بەڵام بەڵگە نین

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى"، (١٤/٤٧٣).

بۆ مەبەستەکەی ئەو".[١]

بەڵام خۆ خاوەن عەقڵ ناچێت لە شەرع لابدات بۆ تۆڵەسەندنەوە و لە ڕقی هەڵەی هەندێک لەوانەی خۆیان دەدەنە پاڵ شەرع، بەڵکوو تەواوی باوەڕ لەوەدایە کە ژێر تەماشای ئامۆژگارییەکە بکات و داوای لێخۆشبوون بۆ ئەوانە بکات کە هەڵەیان بەرانبەر کردووە و پێداچوونەوەش بۆ پەیوەندی خۆی لەگەڵ پەروەردگاری بکات، جا ئەگەر لەسەر حەق بوو بەردەوام بێت و ئەگەریش لەسەر هەڵە بوو بکشێتەوە و تەوبە بکات.

لەپاشان ئەوەشی کە زیاتر ئاگری ئەم لەدەستبەربوونە گەنجانەیەی خۆشتر کرد پێشوازی گەرمی زۆرێک لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بوو، بە پاڵنەری تۆڵەسەندنەوە و بەتاڵکردنەوەی داخ و زووخاوی دڵیان بەرانبەر بەوەی کە ناویان لێناوە «ئیسلامی سیاسی»، ئەوەشی کە وابزانێت کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن تەنها بریتین لە کەشێکی ڕۆشنبیری پەتیی، ئەوە لە وەهمێکی گەورەدا دەژییێت. بێگومان کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بوونەوەرانێکی سیاسین کە ئەجێندا و مەرامی تایبەت و لایەنداری قووڵی خۆیانیان هەیە، لەهەمان کاتیشدا خاوەن ئامرازی تایبەتن بۆ لەخۆگرتن و گلێرکردنەوە و بەکارهێنان و پێدانی هەلی کار بەو جۆرەی کە لەگەڵ پێکهاتەی خۆیاندا دەگونجێت وەک پێگەی نووسەرێکی ستوونی ڕۆژنامەگەری، یاخود سەرپەرشتیاریی پەیجێکی ڕاگۆڕینەوە، یاخود پێشکەشکارێکی تەلەفیزیۆنی، یاخود ئامادەکارێکی بەرنامە، یاخود میوانێکی هەمیشەیی کە لەژێر ناوەکەیدا دەنووسن «شارەزا لە بزاڤە ئیسلامییەکاندا»، هەروەها نموونەی ئەمانە لە پێگە و پۆستەکانی ڕاگەیاندن کە لە سەردەمی

---

(١)ابن تيمية، "مجموع الفتاوى"، (١٦/٤٣٣).

ئەم کابرایەش ئەبولحەسەن عەلی کوڕی یەشکور قازییەکی شافیعی مەزهەبی میسری بووە، قوتابی (حافظ عبدالغني مەقدیسی) بووە، کتێبێکی لە سوننەت و سیفاتدا هەیە، ساڵی ٦١١ک وەفاتی کردووە.

هەژموونی شاشەدا دەست بە سەر ئاوەزی لاواندا دەگرن.

لەپاش ئەم نمایشکردنە کورتەی ڕێڕەوی مێژوویی ئەم دیاردەیە و پەرەسەندنەکانی، دەچین بە لای گوتووبێژکردنێکی بابەتیانەوە سەبارەت بە گرفتەکانی ئەم گوتارە و پەیوەندییان بە بنەماکانی وەحییەوە، هەوڵیش دەدەین تیشک بخەینەسەر نمایشکردنی ئەو حەقیقەتانەی وەحی کە ئەم گوتارە ونی کردوون و تێیاندا دۆڕاوە و لە کێشمەکێشی باڵگرتنەوەی مەدەنی خۆیدا کاڵ و کز و شاراوە و بگرە نادیاری کردوون کە ئەویش بابەتی بەشی دووەمە.

# ١- فرمانی مرۆڤ

فرمانی مرۆڤ چییە؟

ئەمە ئەو پرسیار/دەلاقەیەیە کە ڕاجیاییە جەوهەرییەکانی ئاڕاستە هزرییەکانی بۆ دەگەڕێتەوە -وەک لە پێشووتردا ئاماژەمان پێ دا- دوو ئاڕاستەی سەرەکیش لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا هەن:

**یەکەمیان:** ئاڕاستەی مەدەنی کە وایدەبینێت فرمانی بەدیهێنانی مرۆڤ بریتییە لە ئاوەدانکردنەوە. بێگومان بە پێناسە ماددییەکەی، گشت شتەکانی دیکەش جگە لەو تەنها ئامرازە بۆ ئەوە، جا وەحی و شەریعەتەکان و پەرستشەکان هەموو ئەوانە تەنها ئامرازن بۆ هێنانەدی ئاوەدانکردنەوە و شارستانییەت و مەدەنییەت، ئاوەدانکردنەوە ئامانجی جەوهەری و لەپێشینە و سەرەکی مرۆڤە، بنیاد لەسەر ئەمەش ئەم گوتارە ئیتر سەرقاڵبوو بە بابەتی بەمەدەنیبوون و ئاڕاستەکردنی سەرجەم پێدراوەکانی دیکە بەرەو ئەو و شلگیری و لێخۆشبوون لە گشت شتەکانی دیکەی بەدەر لەو، دوابەدوای ئەوەش هەڵسەنگاندنی کۆمەڵگاکان و ڕۆشنبیرییەکان و کەسایەتییەکان بەپێی پێگەیان لەم مەدەنییەتە دنیاییەدا.

مەدەنییەتیش بەپێی ئەم ئاڕاستەیە چەمکێکی گشتگیرە کە هەر شتێک خۆشگوزەرانی مرۆیی و خۆشبەختی ڕەگەزی مرۆڤایەتی بێنێتەدی لە گشت گۆڕەپانەکانی ژیانی دنیادا لەخۆیدەگرێت، هەروەها پێشکەوتن لە زانستە فەلسەفی و مرۆیی و سروشتی و هونەرەکان و وێنەکانی ئەوانەدا.

**ئاڕاستەی دووەمیش:** کە ئاڕاستە شەرعییەکەیە، وای دەبینێت کە فرمانی

مرۆڤ بەندایەتییە، بەو واتایەی کە خودا مرۆڤی دروستکردووە و پەیامبەرانی ناردووە و پەرتووکەکانی دابەزاندووە تاکوو خودا و بەندایەتیکردن بۆ خودا بە خەڵک بناسێنن، وردەکاری ئەوەی شایستەی زاتی بەرزی پەروەردگارە و ئەوەی شایستەی نییە و دوورە لێیەوە نیشانیانی بدەن و بۆیان ڕوون بکەنەوە، هەروەها یاساکانی ڕێکخستنی مافەکانی بەندەکان و تاکو بڵێن هەرچی لەم دونیایەدا هەیە تەنها بریتییە لە گاڵتەوگەپ و یاری و سەرقاڵی و خۆشگوزەرانییەکی پڕوپووچی کاتی، جا دەبێت هەرچی تیایدا پێویست و یارمەتیدەرە بۆ بەندایەتی (اللّه) وەربگیرێت و بەکاربهێنرێت. هەرچییەکیش لە پەرستش بۆ خودا یارمەتیدەر نییە و بەرەو ئەو مەبەستە ناچێت ئەوەیان لەنێوان دوو ئاستدایە و سێیەمیان نییە، یاخود حەرامە و دەبێت دەستی لێ هەڵبگیرێت، یاخود تەنها زیادە و سەرقاڵییە هەڵوێستی شەرعی لەهەمبەریدا ئەوەیە هەتا دەگونجێت دەستی لێ بگیرێتەوە.

جا ئاوەدانکردنەوە و شارستانییەت و مەدەنییەت بە مانا ماددییەکانیان تەنها ئامرازن بۆ سەرخستن و دەرخستنی ئایین و بەرپاکردنی دروشم و شەریعەتەکان، لەم مەدەنییەتەش تەنها ستایشی ئەو بەشەی دەکرێت کە ئەم ئامانجە بێنێتەدی، پێگەی مەدەنییەتیش -لەوپەڕی کورتی و پوختیدا- لەو پرەنسیپە ئوسووڵییە بەناوبانگەدا خۆی دەنوێنێت کە بە پێشەکی واجب ناسراوە، ئەوەی کە بە دەق دەڵێت: "هەر شتێک کە واجب تەنها بەو بێتەجێ؛ ئەوا ئەو شتە بۆخۆشی دەبێتە واجب"، بەم مانایەش، ئەگەر بەبێ ئەو واجبەکە دەهاتەدی، ئەوکات ئەو نابێتە واجب.

کاتێکیش پێشەوا ئیبن تەیمییە لە دیدگای ئیسلامییەوە باس لە فرمانی دەوڵەت دەکات لە کتێبەکەیدا (السياسة الشرعية) پوختەیەکی گرینگ لەپێشدا دەخاتەڕوو کە بە ئامرازبوونی مەدەنییەت وەدەردەخات و ئەوەی کە وابەستەی ئامانجە ئایینییەکەیە، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرموێت:

"جا مەبەستی واجب لە دەمسپێتی و سەرپەرشتیارییەکان:

ڕاستکردنەوە و ڕاگیرکردنی ئایینی خەڵکە کە ئەگەر بیدۆڕێنن ئەوە دۆڕان و شکستی گەورە و ئاشکرا خۆیەتی، هەرچیش لە نیعمەت و خۆشی دونیایان هەبێت ئەوکات سوودیان پێ ناگەیەنێت.

ڕاستکردنەوە و ڕاگیرکردنی ئەو بەشە لە دونیا کە کاری ئایینیانی لەسەرڕاوەستاوە و بەوەوە بەندە."[١]

بەندایەتیش بەپێی ئەم ئاڕاستەیە سیستمێکە لە کۆمەڵە لقێکی پلەبەندیی گشتگیر و فراوان کە بەرزترینیان: وشەی (لا إله إلا الله) و نزمترینیان: لادانی ئازار و زیانێکە لەسەرڕێگاکان. جا لەیەکتاپەرستی بۆ پەروەردگار و یەکلاکردنەوە و پەتیبوونەوەی دڵ بۆی دەست پێ دەکات، بەشوێنیدا فەرزە عەینی-خودی-یەکان، بەشوێنیدا فەرزە کیفائی-لەبرێتی-یەکان کە سوود و بەرژەوەندییە گشتییەکانی ئادەمیزاد دێننەدی.

کاتێکیش دوو بەش یان دوو لق لە بەش و لقەکانی بەندایەتی جێیان بە یەک لێژ کرد، ناچین بەڕەهایی بەرژەوەندییە مەدەنییەکان پێش بخەین، بەڵکوو یاساگەلێکی وردی شەرعی هەن لە کێشان و بەراوردکردنی نێوان ئاست و گرینگیپێدان و کار و بابەتە گشتییەکاندا، وەک پێشخستنی پاراستنی پاکیزەیی بەسەر ئازادی هونەریدا، پێشخستنی فەرزی عەینی بەسەر کیفائیدا، پێشخستنی سوودی تێپەڕ بەسەر سوودی کەسی و تایبەتدا و پێشخستنی واجب بەسەر مەندوباتدا و نموونەی ئەمانە.

هەر لەبەر ئەمەش؛ زۆرینەی کردەوە پەتییە پەرستشییەکان دەچنە ژێر حوکمە تەکلیفییەکان(ڕاسپاردەییەکان)ەوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە

---

(١) ابن تيمية، "السياسة الشرعية"، دار عالم الفوائد، (ص ٣٠).

ئەوانە وێنەی کۆتایین بۆ مەبەستی خودایی، هەروەها زۆرینەی کارە دونیاییە مەدەنییەکانیش دەچنە ژێر حوکمە وەضعییەکان(دانراوەکان)ەوە، وەک سەبەب -هۆ-، شەرط -مەرج-، عیللەت -پێناو-، مانیع -ڕێگر-، بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئەمانە ئامرازن بۆ حوکمە تەکلیفییەکان.

دوابەدوای ئەوەش هەڵسەنگاندنی کۆمەڵگا و ڕۆشنبیری و کەلتوور و کەسایەتییەکان بەپێی پێگە و جێگەیان لەم بەندایەتییەدا و لەسەر ئەم دیدگایە بنیات دەنرێن.

بە چڕۆکردنی لقوپۆپێکی زۆر لە جیاوازی ئەم دوو ئاڕاستەیە لە دیاریکردنی ئامراز و ئامانجدا، زۆرینەی وردەکارییە ناکۆتاکان و جیاوازییە مەزنەکان وەک لێکەوتە و دواهاتیان هاتوونەتەکایەوە، ئەوەش جیاوازی زۆری لە هەڵوێستیشدا لەگەڵ خۆی هێناوە، جا هەر دۆسیەیەکی هزری کە خەڵک ڕاجیادەبن تێیدا، گرۆیەک دەبینیت کە کاریگەری ئەم هەڵوێستە لەسەر بەندایەتی و پاکیزەیی ڕەچاودەکات؛ لەو سایەشدا هەڵوێستێکی دیاریکراو تێبینی دەکات، گرۆیەکەی دیش پەیوەندی ئەم دۆسیە بە شارستانییەت و مەدەنییەت تێبینی دەکات و ئەویش هەڵویستێکی پێچەوانە وەردەگرێت، جا هەر گرۆیەک وابەستە و بایەخدەرە بە ئامانج و مەبەستی دوایی خۆی.

لەڕاستیشدا: پەرتووکەکەی (اللّٰه) ئەم بابەتەی بە گرێکوێرەیی یاخود تەماوی و نادیار و ئەگەری بەجێنەهێشتووە، بەڵکوو بە شێوەیەکی دڵنیایی و یەکلایی و ڕوون و ڕاشکاو خستوویەتیە ڕوو، هەروەها ئامانجی بەدیهێنانی مرۆڤی بە زمانێکی چێوەکراو و ڕۆشن باس لێ کردووە کە پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ [الذاريات: ٥٦] «بەڕاستی ئەمن جندۆکە و ئادەمیزادم بۆ جگە لە بەندایەتیکردن بۆ خۆم دروست نەکردووە.»

هەروەها ڕوونی کردووەتەوە کە مرۆڤی لەم دونیایەدا دروستکردووە و

لەپاش مردنیشی زیندووی دەکاتەوە تاکوو لەسەر ئەم مەبەستە سەرزەنشتی بکات کە بریتییە لە هەستان بە بەندایەتی و بەرپاکردنی، هەروەک پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿الَّذِى خَلَقَ المَوتَ وَالحَياةَ لِيَبلُوَكُم أَيُّكُم أَحسَنُ عَمَلًا وَهُوَ العَزيزُ الغَفورُ﴾ [الملك: ٢] «ئەو خودایەی کە مردن و ژیانی بەدیهێناوە تاکوو تاقیتان بکاتەوە کامەتان باشترین کردەوە ئەنجامدەدەن.»

کردەوەی باشیش لەم ئایەتە و ئایەتەکانی هاوشێوەیدا بریتییە لە باوەڕ و کردەوەی چاکە بەپێی پلە شەرعییەکانی خۆی، خۆ ئەگەر ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە شارستانییەت و بەمەدەنیبوون و زانستە دونیاییەکان بە پێناسە ماددییەکانیان مەبەستی سەرەکی و لەپێشینە بوونایە لە کردەوەی باش؛ ئەوکات پەروەدگار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا پەیامبەرانی هەر لە بنەڕەتەوە نەدەنارد؛ کە خودا بۆخۆی ناوازەیی و پێشکەوتنی ئەو گەلانەی پێغەمبەرانی بۆناردوون لە ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی و قووڵی زانستیاندا بە دونیا تاریف لێ کردووە، وەک لەبارەی ئوممەتانی پێشووەوە دەفەرموویت: ﴿كانوا أَشَدَّ مِنهُم قُوَّةً وَأَثارُوا الأَرضَ وَعَمَروها أَكثَرَ مِمّا عَمَروها﴾ [الروم: ٩] «لەمان بەهێزتر بوون و سەرزەوییان کێڵا و چاند و-کۆشک و تەلارییان سازدا- ئاوەدانیانکردەوە.»

لەبارەی زانستی مەدەنیشیانەوە دەفەرموویت: ﴿يَعلَمونَ ظاهِرًا مِنَ الحَياةِ الدُّنيا﴾ [الروم: ٧] «زانستیان تەنها بە شتێکی ڕواڵەتی و دەرەکی ژیانی دونیا هەیە.»

هەروەها فرمانی پەیامبەریێتییەکان و پەرتووکە ئاسمانییەکان و شەریعەتەکانی ڕوونکردووەتەوە کە هەموویان ئامانجیان جەختکردنەوەیە لە بەندایەتی بۆ خودا و ئامادەسازی بۆ ژیانی داهاتووی دوای مردن، نەک کێبڕکێی جیهانی لە مەدەنییەت و شارستانییەتی دنیاییدا، هەروەک پەروەردگار لەبارەی فرمانی پێغەمبەرانەوە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَد بَعَثنا فى كُلِّ أُمَّةٍ رَسولًا أَنِ اعبُدُوا

اللَّهَ وَاجتَنِبُوا الطَّاغوتَ﴾ [النحل: ٣٦] «بەڕاستی کە ئێمە لەناو هەر گەلێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە کە (اللّٰه) بپەرستن و توخنی طاغووت نەکەون.»

هەروەها باسی لە پرسیاری خودایی سەبارەت بە هێنانەدی ئەم ئامانجە کردووە کە دەفەرموویّت: ﴿يا مَعشَرَ الجِنِّ وَالإِنسِ أَلَم يَأتِكُم رُسُلٌ مِنكُم يَقُصّونَ عَلَيكُم آياتي وَيُنذِرونَكُم لِقاءَ يَومِكُم هذا﴾ [الأنعام: ١٣٠] «ئەی کۆمەڵی جنۆکە و مرۆڤ ئەرێ پەیامبەرانێکتان لە خۆتان بۆ نەهات کە ئایەتەکانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوە و ئاگاداریان دەکردنەوە لە دیدار و وادەی ئەمڕۆژەتان -کە ڕۆژی دواییە.»

هەروەها لە ڕوونکردنەوەی فرمانی شەریعەتەکاندا دەفەرموویّت: ﴿وَما أُمِروا إِلّا لِيَعبُدُوا اللهَ﴾ [البينة: ٥] «فەرمانی هیچێکیشیان پێ نەکرابوو ئەوە نەبێت کە (اللّٰه) بپەرستن.»

جگە لەمانەش زۆرن لەو ئایەتە چەسپاو و ڕۆشنانەی وەحی کە بە شێوەیەکی بڕاوە و یەکلاکەرەوە ئامانجی دروستکردنی مرۆڤیان خستووەتەڕوو، ئەوەشی لێرەدا مەبەستمانە تەنها نیشاندانی چەند نموونەیەکە، نەک کۆکردنەوە و ئەژمارکردن و تۆمارکردنی هەمووی.

# ٢- ئامانجییێتیی شارستانییەت لە پەیژەی وەحیدا

بە تەواوی ڕوونی و ڕاشکاوی و بەبێ هیچ پێچوپەنایەک.

شارستانییەت بە واتا بەربڵاوەکەی کە بریتییە لە زانستە مەدەنییە دنیاییەکان بۆ خوڵقاندنی خۆشگوزەرانی مرۆڤ، لە وەحی خودایدا خاوەن پێگەیەکی لاوەکی و شوێنکەوتەییە، نەک ئامانج، نەک لەپێشینە بێت یاخود دۆسیەی سەرەکی، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە ئێمە پێمان خۆشە وا بیخەینەڕوو.

دەزانم ئەمە زۆر کەس بێزار دەکات، بگرە ئازاریان دەدات، چونکە دەیانەوێت بەوپەڕی نیازپاکییەوە هاوسۆزی توێژی ڕۆشنبیران بۆ ئیسلام دەستەبەر بکەن، بەڵام ئەمە ڕاستییەکەیە.

ئێمە دەبێت ئینتیما و هاوسۆزی و دڵی خەڵک بۆ ئیسلام و قورئان و موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ) وەک خۆیان دەستەبەربکەین، واتە: چۆن بوون لە خودی خۆیاندا بەو شێوازە، نەک وەک ئەوەی ئێمە دەیهێنین لە ڕێگای پرۆسەکانی دووبارە سازاندن و پێکهێنانەوە و بەپێی ئاواز و مەیلی بەکاربەران، ئیسلام لە شێوە ڕاستەقینە ڕاستاڵەکەی خۆیدا، نە ئەو ئیسلامەی کە گوێگران حەزی جۆرێک لە بیستنیان بۆی هەیە، موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ) بەو ژیانەی لە گەرما و گڕەکانی تەیبەدا بەسەری برد، نە ئەو وێنە و وێنایەی پێغەمبەر (ﷺ) کە بەپێی سەلیقەی فڕانکفۆنی دیزاینکراوە.

ئەو شاهێدی و بەڵگە و ڕەهەندانەی ماناگەیێنیش کە ئەوە دەسەلمێنن کە مەدەنییەتی ماددی بەهایەکی لاوەکی هەیە و بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە تەنها ئامڕازێکی شوێنکەوتەیە بۆ ئامانجی سەرخستنی ئیسلام و چەسپاندنی

شەریعەتەکەی، نەک لە خودی خۆیدا ئامانج بێت، یاخود بوارێک بێت بۆ کێبڕکێکاری نەتەوە و گەلان لە بەدەستهێنانی دونیادا؛ شاهێدی زۆروزەبەندە و لە ئەژمار نەهاتوون.

قورئان بە شێوەیەکی ڕوون هاتووە بە جێگیرکردن و چەسپاندنی سەنتەربوونی ڕۆژی دوایی لەبەرانبەر سەنتەربوونی دونیا، ئەمە بەجۆرێکی ڕاشکاو هاتووە لە قورئاندا کە شەرم بکەین لەوەی بەڵگەی بۆ بێنینەوە، بەڵام ئێمە زۆرجار وامان پێخۆشە خۆمان لەوە بێئاگا بکەین و بەزۆر و زۆرکاری هەرەمی گرینگی پێدانە قورئانییەکان ئاوەژوو بکەینەوە.

هەوڵدان بۆڕازیکردنی ئەوانی تر زۆرجار وامان پاڵ پێوەدەنێت کە قورئان وا نمایش بکەین کە پەیامە سەرەکییەکەی ئاوەدانکردنەوەی ماددییە! حەقیقەتیش ئەوەیە کە: ئێمە درۆ دەکەین بە ناوی قورئانەوە و لە شوێنێکی دادەنێین کە خۆی بۆ ئەوە نەهاتووە خۆی لەوێدا دابنێت.

نا، هەرگیز، قورئان بە پەیامی لەپێشینەیەتی ئاوەدانکردنەوەی ماددی نەهاتووە، بەڵکوو ڕاست و ڕێک بە پێچەوانەی ئەوەوە هاتووە، بۆ بنچینەسازی سەنتەربوونی ژیانی دوایی لەبەرانبەر سەنتەربوونی دونیادا، قورئان هاتووە تاکوو دونیا لە ئامانجێکەوە بکاتە تەنها ئامرازێک.

بەڵکوو باسکردنی قورئان لەمەڕ مەترسی دونیا لە گومڕاکردنی خەڵک لە ڕێگای خودا زیاترە لە باسی پێویستی ئاوەدانکردنەوەی و دونیا لە دیدگای قورئانیدا تەنها ئامرازێکی مەترسیدارە کە دەبێت بە وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، نەبادا لە ژیانی نەبڕاوەی داهاتووی پاشەڕۆژمان لابدات و پێمانی لە کیس بدات.

بەڕاستی کە دیارترین پڕەنسیپی عەقڵانی بریتییە لە پێشخستنی بەرژەوەندیی هەتاهەتایی بەسەر بەرژەوەندیی کاتیدا، هەربۆیە قورئانیش

بە جەختکردنەوە لەم حەقیقەتە عەقڵییە و بەهێزکردنی دەرەنجامەکانییەوە هاتووە، جا خۆشبەختی ماوە و نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی خستووەتە پێش خۆشییە کاتی و دواهاتووەکانی دونیا.

زۆرێک لە توێژی ڕۆشەنبیران هەست بە بێزاری دەکەن وەختێک فەرمایشەکانی نێو قورئان دەبیستن لەبارەی زەمکردنی ژیانی دونیاوە، چونکە لەوە دەترسن کە خەڵک واز لەم ئامرازە بێنن و ئێمەش هەروا وەک کۆمەڵگایەکی لاواز بمێنینەوە، کە ئەو بیرکردنەوە و هەڵوێستەشیان جۆرێکە لە کارڕاستکردنەوە بۆ پەروەردگار!

هەربۆیە؛ سەرچاوەی لادانی ڕۆشنبیری هەر ئەوە بووە و هەر ئەوەش دەمێنێتەوە کە -زۆر بەپوختی- بریتییە لە سەرسامبوون بە دیاردە ماددییەکان لە ئاوەدانی و مەدەنییەت و شارستانییەتی ماددی دونیایی و بێنیازی لە واتا و ناوەڕۆکەکانی وەحی لە زانستە خوداییەکان و حەقیقەتەکانی باوەڕ و پەنهانەکان و مامەڵە لەگەڵ زاتی بەرز و پیرۆزی پەروەردگار.

زۆرجار قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە هەرچی لەسەر ڕووی ئەم زەمینەیە لە سامان و سەرچاوەی سروشتی ماددە بەردەستەکان، مەبەست لێیان خۆشگوزەرانی مرۆڤەکان نییە، بەڵکوو مەبەست لێی تاقیکردنەوەی خەڵک و لەبێژنگدانیانە کە ئاخۆ باوەڕ دێنن و ڕوو لە پەروەردگار دەکەن، یاخود پشتی لێ دەکەن؟ هەروەک (اللّٰه) دەفەرموویت: ﴿إِنَّا جَعَلنا ما عَلَى الأَرضِ زِينَةً لَها لِنَبلُوَهُم أَيُّهُم أَحسَنُ عَمَلًا﴾ [الكهف: ٧] «ئێمە هەرچی لەسەر ڕووی زەویدایە کردوومانەتە مایەی ڕازانەوە و سەرنجڕاکێشان بۆی تاکوو تاقییان بکەینەوە کامێکیان باشترین کار وە پێش خۆ دەخەن.»

باسیشی لە فرمانی بژێوییە مەدەنییەکان و گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی کردووە کە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَد مَكَّنّاكُم فِي الأَرضِ وَجَعَلنا لَكُم فيها مَعايِشَ

قَلِيلًا ما تَشكُرونَ﴾ [الأعراف: ١٠] «بەڕاستی ئێوەمان لەسەر زەویدا دەسەڵات پێ داوە و ڕاممان کردووە و بۆتان بژێویمان لێ داناوە، چەندە کەم و هیچە سوپاس و شوکرانەبژێریتان.»

بەڵکوو پەروەردگار ئاماژە بە مەزنی و قووڵیی ئەم دەسەڵاتدارییە مەدەنییە دەکات کە دەفەرموویێت: ﴿وَلَقَد مَكَّنّاهُم فيما إِن مَكَّنّاكُم فيهِ وَجَعَلنا لَهُم سَمعًا وَأَبصارًا وَأَفئِدَةً فَما أَغنى عَنهُم سَمعُهُم وَلا أَبصارُهُم وَلا أَفئِدَتُهُم مِن شَيءٍ إِذ كانوا يَجحَدونَ بِآياتِ اللَّهِ وَحاقَ بِهِم ما كانوا بِهِ يَستَهزِئونَ﴾ [الأحقاف: ٢٦]، «بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوەمان توانایی پێدا بە جۆرێک کە بە ئێوەشمان نەداوە، بیستن و بینین و دڵمان بۆ گێڕان بەڵام سوودی بۆیان نەبوو بیستن و بینینەکان و دڵەکانیان وەختێک ئەوان نکۆڵییان لە ئایەتەکانی (اللّٰه) دەکرد و بەرۆکی گرتن ئەوەی کە گاڵتەیان پێی دەهات.»

بڕوانە چۆن خودا بژێوییە دونیاییەکانی وەک نیعمەتێکی خۆی نیشانداوە کە بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکن، نەک داخوازییەکی شەرعی سەرەکی بن، لەپاشان لە شوێنێکی دیکەدا جەخت لە ئامانجی بەرزڕاگرتنی دروشمەکانی ئایین و ڕێگری لە خراپە و برەودان بە چاکە دەکات لە نیعمەتی دەسەڵاتداریی سیاسی، وەک دەفەرموویێت: ﴿الَّذينَ إِن مَكَّنّاهُم فِي الأَرضِ أَقامُوا الصَّلاةَ وَآتَوُا الزَّكاةَ وَأَمَروا بِالمَعروفِ وَنَهَوا عَنِ المُنكَرِ وَلِلَّهِ عاقِبَةُ الأُمورِ﴾ [الحج: ٤١] «ئەوانەی کە ئەگەر دەسەڵاتدار و پێقایمان کردن لەسەر زەویدا نوێژ بەرپادەکەن و زەکات دەدەن و فەرمان دەکەن بە چاکە و ڕێگری دەکەن لە خراپە، سەرەنجامی گشت کارەکانیش هەر بۆ لای خوایە.»

کاتێکیش پەروەردگار وێنەیەکی بەرز و بەپێزی باوەڕدارمان بۆ نمایشدەکات جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەو پیاوەی چالاکی ئابووری سەرقاڵی ناکات لە ئامانجی پەرستشی ڕاستەقینە و دونیا لە دەستیدایە نەک لە دڵیدا، چونکە

چاوی لەسەر ئەو وادەیەیە کە تێیدا دەگات بە پەروەردگاری، (اللّٰه) دەفەرمووێت: ﴿رِجالٌ لا تُلهيهِم تِجارَةٌ وَلا بَيعٌ عَن ذِكرِ اللَّهِ وَإِقامِ الصَّلاةِ وَإيتاءِ الزَّكاةِ يَخافونَ يَومًا تَتَقَلَّبُ فيهِ القُلوبُ وَالأَبصارُ﴾ [النور: ٣٧] «پیاوانێک کە نە بازرگانییەک نە کڕین و فرۆشتنێک لە یادی خودا و بەرپاکردنی نوێژ و زەکاتدان سەرقاڵیان ناکات، ترسی ڕۆژێکیان هەیە کە دڵ و چاوەکان تێیدا هەڵدەگەڕێنەوە.»

پەروەدگار لە زۆر شوێنی وەحیدا ئاگاداری ئەوەمان دەکاتەوە پێگە و پایەی ڕاستەقینە لەلای پەروەردگار نە بەپێی هەبوونە ماددییە مەدەنییەکانە نە توانا ئابووری و دیمۆگرافییەکانیش، کە دەفەرمووێت: ﴿وَما أَموالُكُم وَلا أَولادُكُم بِالَّتي تُقَرِّبُكُم عِندَنا زُلفى﴾ [سبأ: ٣٧] «نە پارەوپوول و سامانتان و نە ماڵومنداڵتان ئەوە نین کە لە ئێمەتان نزیک بکەنەوە.»

ئەوەش لە ئەنجامی بێئەرزشیی سامانە ماددییەکان لە **تەرازووی پەروەردگاردا،** جا ئاخۆ بڵێی تەرازووەکانی ئێمەش شوێنکەوتەی ئەوەی پەروەردگار بێت، **یاخود** پێوەرگەلێکی تایبەتی خۆمان دەبێت؟!

پەروەردگار لە زۆر شوێندا پڕوپووچییێتی ئەم دیاردە ماددییانەی لە زۆرڕووەوە بەدەرخستووە، خەریکە هیچ کۆمەڵە ئایەتێک نەبینیت باس و ئاگادارییەکی سەبارەت بە سووکی دونیا تێدا نەبێت و هەروەها ئەوەی کە تەنها بریتییە لە گەمە و گاڵتە و خۆشی و ڕازانەوەیییەک و نموونەی ئەم نازناوانە، کۆکەرەوەی هەموو ئەم وەسفانەش ئەوەیە کە دونیا: چێژێکی کاتییە.

هەروەها وەحی لە چەن شوێنێکدا ڕوونکردنەوەی بە «ڕێسای لادان» داوە لە مێژوودا کە خەریکە قورئان سەرجەم دیاردەکانی گرفتی بیروباوەڕی و ڕەوشتی بەووە ببەستێتەوە، کە ئەویش سەرسامبوونە بە دیاردە ماددییەکان و بەگەورە تەماشاکردنیان و تژی بوونی دڵ لێیان و وابەستەبوونی پێیانەوە، لە واقیعی ئەمڕۆی خەڵکیش ڕابمێنە پێکانی وردی ئەم بەستنەوە قورئانییە دەبینیت کە

نزیکە بڵێیت هەموو گومڕاییەکی هزرییان لادانێکی ڕەوشتی لە بەگەورەبینینی دونیاوە هەڵقووڵاوە، هەروەک لەو فەرمایشتەی پەروەردگاردا هاتووە: ﴿كَلَّا بَل تُحِبّونَ العاجِلَةَ(۝) وَتَذَرونَ الآخِرَةَ﴾ [القيامة: ٢٠ - ٢١] «نا، بەڵکوو ئێوە دونیاتان خۆشدەوێت و پێ خۆشترە * وازیش دێنن لە ژیانی دوایی.»

هەربۆیە؛ بەراوردکردنی قورئان لەنێوان دەستکەوتی دونیایی و دەستکەوتی قیامەتیدا زۆرە، لە نموونەی ئەوەی پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَما أوتيتُم مِن شَيءٍ فَمَتاعُ الحَياةِ الدُّنيا وَزينَتُها وَما عِندَ اللَّهِ خَيرٌ وَأَبقى﴾ [القصص: ٦٠] «جا هەرچییەکتان پێ درابێت، ئەوە خۆشی ژیانی دونیایە، ئەوەشی کە لەلای خودایە باشتر و ماوەترە.»

هەروەها ڕوونی دەکاتەوە کە دوو ڕێگا هەیە، ڕێگای دەستکەوتی دونیایی و ڕێگای دەستکەوتی دواڕۆژی، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿مَن كانَ يُريدُ حَرثَ الآخِرَةِ نَزِد لَهُ في حَرثِهِ وَمَن كانَ يُريدُ حَرثَ الدُّنيا﴾ [الشورى: ٢٠] «هەرکەس کێڵان و بەری دواڕۆژی بوێت لە کێڵان و بەرهەمی زیاد دەکەین، هەر کەسیش کێڵان و بەری دونیای بوێت، بەشی دەدەین لێی.»

لە سێ ئایەتی سەرسوڕهێنەری سوورەتی ئیسرایشدا پەروەردگار مەشخەڵەکانی ئەم دوو ڕێگایە دەخاتە ڕیزەوە، جا لەبارەی ڕێگای دەستکەوتی دونیاییەوە دەفەرمووێت: ﴿مَن كانَ يُريدُ العاجِلَةَ عَجَّلنا لَهُ فيها ما نَشاءُ لِمَن نُريدُ ثُمَّ جَعَلنا لَهُ جَهَنَّمَ يَصلاها مَذمومًا مَدحورًا﴾ [الإسراء: ١٨] «هەرکەس ژیانە بەپەلەکەی دونیای بوێت، زوو بۆی دێنین، چیمان بوێت و بۆ هەرکەس کە بمانەوێت، لە دواییشدا دۆزەخ دەکەین بە بەشی و بە لۆمەکراوی و دوورخراوەیی بچێتە ناوی.»

لەپاشان لە ئایەتی دوای ئەودا ڕێگای دەستکەوتی دواڕۆژ ڕوون دەکاتەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن أَرادَ الآخِرَةَ وَسَعى لَها سَعيَها وَهُوَ مُؤمِنٌ فَأُولئِكَ كانَ سَعيُهُم مَشكورًا﴾ [الإسراء: ١٩] «هەرکەسێکیش دواڕۆژی بوێت و هەوڵی شایانی خۆی

بۆ بدات و لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕدار بێت، ئەوا ئەوانە هەوڵیان سوپاسکراو و جێپاداشتە.»

لەپاشان لە ئایەتی سێیەمدا پاشکۆیەکی ئەوپەڕی پاراو و تێروتەسەل بەشوێن هەردوو دیمەنەکەدا دێنێت: ﴿كُلًّا نُمِدُّ هؤُلاءِ وَهؤُلاءِ مِن عَطاءِ رَبِّكَ وَما كانَ عَطاءُ رَبِّكَ مَحظورًا﴾ [الإسراء: ٢٠] «لە بەخشینی پەروەدگارت بەشی ئەوانەش و ئەوانەش هەموویان دەدەین کە بەخشینی پەروەردگارت گیراوە و یاساغ نییە.»

لە زەمانێکی ڕوون و ڕاشکاویشدا کە هەرچی لەم ژیانی دونیایەدایە تەنها خۆشییەکی کاتییە و سامان و سەرچاوەی وشکنەکردوو هەمیشە لەبەرڕۆشتوو تەنها لە پاشە ڕۆژدایە، قورئان دەفەرمووێت: ﴿فَما أوتيتُم مِن شَيءٍ فَمَتاعُ الحَياةِ الدُّنيا وَما عِندَ اللَّهِ خَيرٌ وَأَبقى﴾ [الشورى: ٣٦] «جا هەرچییەکتان پێ درابێت، ئەوە خۆشی ژیانی دونیایە، ئەوەشی کە لەلای خودایە باشتر و ماوەترە.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَما أوتيتُم مِن شَيءٍ فَمَتاعُ الحَياةِ الدُّنيا وَزينَتُها وَما عِندَ اللَّهِ خَيرٌ وَأَبقى﴾ [القصص: ٦٠] «هەرچییەکتان پێ درابێت، ئەوە خۆشی ژیانی دونیایە، ئەوەشی لەلای خودایە باشتر و ماوەترە.»

لە شوێنیکی دیکەدا دونیا بە گەمە و یاری و سەرقاڵی وەسف دەکات لەبەرانبەر ژیانی ڕاستەقینەی دواڕۆژدا، کە دەفەرمووێت: ﴿وَما أوتيتُم مِن شَيءٍ فَمَتاعُ الحَياةِ الدُّنيا وَزينَتُها وَما عِندَ اللَّهِ خَيرٌ وَأَبقى﴾ [القصص: ٦٠] «ژیانی دونیا هیچ نییە جگە لە گەمە و سەرقاڵی، ژیانی ماڵی دواییش باشترە بۆ ئەوانەی لەخواترسییان هەیە.»

لە دیمەنی کەمکردنەوەی نرخی ئەوانەشدا کە دڵەکانیان پڕبووە لە شایی و شادی و لە خۆشی دەستکەوت و هەبوونە ماددییەکانەوە دەفەرمووێت: ﴿وَفَرِحوا بِالحَياةِ الدُّنيا وَمَا الحَياةُ الدُّنيا فِي الآخِرَةِ إِلّا مَتاعٌ﴾ [الرعد: ٢٦] «شاد بوون

بە ژیانی دونیا کە ژیانی دونیا لەچاو دوارۆژدا جگە لە چێژێکی کاتیی دواهاتوو، هیچی دی نییە.»

هەروەها پەروەردگار ئاماژەی بەوە کردووە کە هەموو ئەم سامانە ماددییانە، خاوەنەکانی ماڵاوایی لێ دەکەن لەگەڵ یەکەم هەنگاوی ڕێگای ژیانی داهاتوویان بەجێی دێڵن، کە دەفەرموویت: ﴿وَتَرَكتُم ما خَوَّلناكُم وَراءَ ظُهورِكُمْ﴾ [الأنعام: ٩٤] «ئەوەیشی پێمان دابوون لە پشت خۆتانەوە بەجێتانهێشت و ئیدی نەما.»

نموونەی ئەم واتایانەش لە فەرمایشتەکانی پەروەدگار و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەوەدا نییە بژمێردرێت، لە موسڵمانیش شاراوە نییە، سوپاس بۆ خوا، بەڵام تەنها ویستمان ئاماژە بە چەند شاهێدێک لە واتا گشتییەکانی و ئەو بڕە هاوبەشەی لەسەری هاتوون، بکەین. بەڵام وەک تاک تاکی بەڵگەکان، ڕێگایەک بۆ سنووردارکردن و ژماردنی تەواویان نییە مەگەر خودا بیهەوێت.

# ٣- هەڵوێستی پەیامبەریەتییەکان لە هەمبەر شارستانییەتەکاندا

ئەرشیفی مێژووی مرۆڤایەتی پڕە لە زۆر ئەزموونی شارستانی و مەدەنی بەپێی چوارچێوەی مێژوویی خۆیان کە مەدەنییەت بەراوورد ناکرێت بە پەرەسەندنەکانی پاش خۆی، بەڵکوو بە دۆخی مێژوویی خۆی و بە چوارچێوەی مەعریفی داوەر بەسەر ئەو ساتەی چاخی خۆیدا بەراوورد دەکرێت، جا داهێنانی مەدەنی بڕیارێکی ڕێژەییە قورسایی خۆی لە قەبارەی ئەو دوورییەوە وەردەگرێت کە لە ساتێکی مێژووییدا دەیبڕێت، ئیدی خوێندنەوەمان **بۆ مێژووی** شارستانییەتەکان خوێندنەوەیەکی هێڵی بێت یاخود پچڕپچڕ، **یەکسانە؛ هێشتا** ئەوەی لەپێشدا هاتووە وەک مەرج دەمێنێتەوە بۆ بوونی **ئەوەی پاش خۆی،** بەشێوەیەک کە بەشوێنیەکداهاتنی زنجیرەیی بۆ پرسیار و **وەڵامەکان ئاشکرای** دەکەن.

بەم لەبەرچاوگرتنەش؛ مێژوونووسە ئینسکلۆپیدییەکان ساتەکانی کەڵەکەبوونی مەدەنییان لە شارستانییەتەکانی پێشوودا تۆمارکردووە، وەک شارستانییەتی سۆمەری، میسری، ئیغریقی، ڕۆمانی، فارسی، هیندی، چینی و لەدواییشدا شارستانییەتی نوێی ڕۆژئاوایی، ئەوەشی تێیدایە لە فەلسەفە و لۆژیک و هونەرەکان و ئاوەدانکردنەوە و هەڵکۆڵین و نەخشاندن و جگە لەوانەشیان تۆماریان کردووە.

هێشتاکە هەندێک لە پاشماوەی ئەو شارستانییەتانە و توخمە سەرسوڕهێنەرەکانیان لە مۆزەخانە جیهانییەکان و دیمەنە گەشتیارییەکاندا تا ئەمڕۆش ماونەتەوە، بگرە هەندێک لە تیۆرەکانیان تا ئێستاش لە زانستە

نوێکاندا توێژینەوەی لەسەر دەکرێت، یاخود وەک زەمینەی بەڵگەنەویستیان لێ هاتووە بۆ تیۆرگەلێکی دیکە، هەر بەو هۆیەوە؛ نزیکە بڵێین هیچ زانستێک لە زانستە هاوچەرخەکان نابینیتەوە کە لە کاتی خوێندنی دەروازە و پێشەکییەکەیدا ڕەگ و ڕیشەکانی لەنێو شارستانییەتەکانی پێشوو باس دەکرێت، ئەمە لەگەڵ فتوحاتە جەوهەرییەکانی کە بە پەرەسەندنی ئەمڕۆیان گەیاندووە، بەتایبەت بەستنەوە بە شارستانییەتی یۆنانی لەبەر گرینگیدانی بە بابەتە عەقڵییەکان لەلایەک و لایەنگیرییەکانی ڕۆژئاوا بۆی لەلایەکی دیکەوە.

لە واقیعیشدا: هەندێک لە لاوانی مسوڵمان هێشتا بە گەرموگوڕی دەپرسن کە ئایا هەڵوێستی شەرعی پەسەند لە هەمبەر شارستانییەتی ئەمڕۆدا چییە؟ وەڵامی یەکلا و بڕاوە بۆ ئەم پرسە کامەیە؟

ڕاستییەکەش ئەوەیە کە: هەرکەس ڕاستگۆیانە و بێلایەنانە ڕابمێنێت و وردبێتەوە لە مامەڵەی پێغەمبەران لەگەڵ دەستکەوتە شارستانییەکان و سەرمایەی زانستی و هونەرە مەدەنییەکان لە چاخی خۆیاندا؛ ئەو ڕێبازە مامەڵەییەی بۆ ڕوون دەبێتەوە کە پەروەردگار پێی ڕازییە کە وەک هەڵوێست وەری بگرین لەهەمبەر شارستانییەتی هاوچەرخدا. لێرەدا فرمێسک لە دڵی گەرمەوە سەردەردێنێت کە ئەوە لەخۆیدا بەسە بۆ نیشاندانی مەبەست و بێنیازمان دەکات لە سەرجەم وردەکارییەکانی ئەم توێژینەوەیە.

جا پێغەمبەر (ﷺ) نێردرایە ناو خەڵک کە لەو چاخەدا چوار ئیمپراتۆرییەت هەبوون کە دنیایان لەخۆیان بەشکردبوو، ڕۆمانی و فارسی و هیندی و چینی. کە یەکەمیان هەتا ئەورووپا درێژ ببوویەوە، دووەمیشیان لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا بوو، دووانەکەی دیکەش نیمچە دابڕاو بوون، پەیمانگاکانی زانستیش تێیاندا ئاوەدان بوون، جگە لە عەمبارێکی شارستانی کەڵەکەبوو لە شارستانییەتی میسری و ئیغریقی.

بەڵکوو زانستە مەدەنییەکان بەر لە هاتنی (ﷺ) گەیشتبوونە ئاستێکی بەرز و ناوازە لە وردەکاری بابەتە عەقڵییەکاندا، وەک ڕێسا جەوهەرییەکانی عەقڵ، ڕێسای شوناس، دژیەکی و سێیەمی بەرزکراوە، تیۆری دەوڵەت و دابەشکردنی شێوەکانی دانەپاڵی دەسەڵات، وردەکارییەکانی ئەندازیاری و دیاریکردنی هەندێک بەهای بیرکاریانە، هونەرەکانی ئاوەدانکردنەوە، شانۆ، شیعر، ئەدەب، بنەماکانی پزیشکی، پێوانی مەودا فەلەکییەکان، دیاریکردنی وادەکانی گیرانی خۆر و مانگ، داهێنانی قیبلەنما و بەرزکەرەوەکان و زۆری دیکەش جگە لەوانە کە ئەمانە تەنها چەند نموونەیەکن کە ئاستەکانی توێژینەوەی مەدەنی دەردەخەن، سەرجەم ئەم زانست و داهێنراوە مەدەنیانەش لە وەختی هاتنی پێغەمبەردا (ﷺ) خرابوونە ڕوو.[١]

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا؛ پەروەردگار کاتێک پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە دوورگەی عەرەبیدا نارد، ڕای نەسپارد بە خەڵک بڵێت: "هۆ کۆمەڵی عەرەب! ئێوە بەدەست دواکەوتنی مەدەنییەوە دەناڵێنن، بۆیە پێویستە لەسەرتان ڕەقوتەقی و وشکی عەرەبییێتیتان تێپەڕێنن و لە گەلانی پێش خۆتانەوە فێربن!" یاخود پێیان بڵێت: "سەرەتا دەبێت ئێوە وەک قوتابی دەستەونەزەر بۆ زانستی مەنطیق و پزیشکی و فەلەکناسی و فەلسەفە و ئەوانە بوەستن، ئەوجا بانگەوازیی خەڵک بکەن!"، یاخود: "پێویستە بەشداری خێزانی نێودەوڵەتی بن لە خۆشبەختیی ڕەگەزی مرۆڤایەتی لە ڕێگای داهێنانی مەعریفییەوە!"

نەخێر، هیچێک لەوانە ڕووینەدا، بەڵکوو پەروەدگار بەتەواوی پێچەوانەی

---

(١) پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا نێردراوە، بە دیاریکراویش لەساڵی: (٧١١ ک)دا، خوێنەر دەشتوانێت چاوێک بە مێژووی زانست و داهێنان و دەستکەوتە مەدەنییەکانی بەر لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا بخشێنێت لە توێی ئەم سەرچاوانەدا:
_ Lenberg& Numbers (eds), The Cambridge History of Scinence, 8 vols. , 2002.
_ Bunch &Hellemans, The History of Science and Technology, Houghton Miffli, 2004.

ئەوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاگەیاند، هەواڵی پێدا سەبارەت بەو بێبەهایی و ئاست نزمییەی کە سەرجەم ئەو مەدەنییەتانەی هاوچەرخی هاتنی نەبەوی لە تەرازووی پەروەردگاردا هەیانە، بەڵکوو هەواڵی ئەوەی پێ داوین کە ڕقی لێیانە و خەشمی لێ گرتوون، ئیدی چ ئەدیبەکانی عەرەب، یاخود فەیلەسووفەکانی ئەسینا، چ پزیشکانی میسرِ و چ داناکانی هیندستان و چ غەیری ئەوانیش.

هەروەک پێشەوا موسلیم لە سەحیحەکەیدا لە فەرموودەی عیاضی موجاشیعییەوە گێڕاویەتییەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێکیان لە وتارەکەیدا فەرمووی: "پەروەردگار سەیری خەڵکانی سەرزەوی کرد، جا ڕقی لێیان بوویەوە، عەرەب و عەجەمیان، جگە لە هەندێک پاشماوەی پاکی ئەهلی کیتاب، فەرمووی من تۆم ناردووە تاکوو تاقیت بکەمەوە و بە تۆش غەیری تۆ تاقیبکەمەوە."[١]

جا لەگەڵ هەرچی کە لەسەر ئەم زەوییەدا هەیە لە زانستی مەدەنییەکان و فەیلەسووف و ئەدیبەکان، ئەوانە هیچ قورساییەکیان لە تەرازووی پەروەردگاردا نییە، چ عەرەب چ عەجەمیان، هیچیشی لێ جیانەکردنەوە جگە لە کۆمەڵێکی کەم لە خەڵک بە هۆی ئەوەوە کە لایان مابوویەوە لە پاشماوەی پەیامبەرییەتییەکان و هەندێک شوێنەواری وەحی، جا پاشماوەی پەیامبەرییەتییەکان و ئەوەی لەخۆی گرتووە لە زانستە خوداییەکان، ئەوە دەروازەی ڕاستەقینەی ڕۆشنگەرییە لە سەرزەویدا، نەک ڕۆشنگەری بریتی بێت لە خۆهەڵکێشان لە فەلسەفە و مەدەنییەتدا، شاهێدی ئەم گوتارە نەبەوییەش لە پەرتووکەکەی خودادا ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێت: ﴿الر كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ [إبراهيم: ١] «ئەلیف لام ڕا، پەرتووکێک کە دامانبەزاندووە بۆ تۆ تاکوو خەڵک لە تاریکاییەکانەوە بەرەو ڕووناکی دەربێنیت."

کەواتە پەروەردگار ناوی ئەو دۆخەی کە هەموو مرۆڤایەتی تێدا بوو پێش

---

(١) صحيح مسلم (٢٨٦٥).

هاتنی ئەو بە تاریکییەکان بردووە و ئەو ڕۆشنگەرییەش کە پێویستیانە بریتییە لەڕۆشنایی وەحی، هەروەک لە جێگایەکی دیکەدا دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذى يُنَزِّلُ عَلَى عَبدِهِ آياتٍ بَيِّناتٍ لِيُخرِجَكُم مِنَ الظُّلُماتِ إِلَى النّورِ﴾ [الحديد: ٩] «ئەوە ئەو زاتەیە کە ئایەتی ڕوون و ڕۆشن دادەبەزێنێتە سەر بەندەکەی (موحەممەد) تاکوو ئێوە لە تاریکاییەکانەوە بەرەو ڕووناکی دەربێنێت.»

لە جێگایەکی دیکەشدا دیسان جەخت لەوە دەکاتەوە کە ڕۆشنگەری ڕاستەقینە ڕۆشنایی وەحییە، وەک دەفەرمووێت: ﴿يَهدى بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضوانَهُ سُبُلَ السَّلامِ وَيُخرِجُهُم مِنَ الظُّلُماتِ إِلَى النّورِ بِإِذنِهِ وَيَهديهِم إِلى صِراطٍ مُستَقيمٍ﴾ [المائده: ١٦] «پەروەردگار ڕێنمایی هەرکەسێکی پێ دەکات کە شوێن ڕەزامەندیی ئەو کەوتبێت بەرەو ڕێگاکانی ئاسایش و سەلامەتبوون و لە تاریکییەکانەوە بەرەو ڕووناکی دەریاندێنێت و ڕێنماییيان دەکات بەرەو ڕێگایەکی ڕاست.»

هەرکەسیش پشت لەم وەحیە بکات هەر بە چەقیوی لەنێو **تاریکاییەکاندا** دەمێنێتەوە، جا ئیتر هەرچەندیشی لە زانستە مەدەنییەکان پێ درابێت، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذينَ كَذَّبوا بِآياتِنا صُمٌّ وَبُكمٌ فِي الظُّلُماتِ﴾ [الأنعام: ٣٩] «ئەوانەشی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆخستەوە؛ کەڕ و لاڵ و نیشتەجێی ناو تاریکییەکانن.»

پێشەوا ئیبن تەیمییەش ئاماژەی بەم ڕۆشنگەرییە هەڵگۆزراوە لە وەحی کردووە کە دەفەرمووێت: "موسڵمانانیش هێندەی کە لە زانستی خودایی بە میرات لە خاتەمی پێغەمبەرانەوە (علهم السلام) بۆیان ماوەتەوە، جیهانی پڕکردووە لەڕێنمایی و ڕۆشنایی".[١]

جا لە وتارەکەی پێشووی پێغەمبەر (ﷺ) ڕابمێنە چۆن ڕۆحی شکۆمەندی و باڵاڕووانین دەکات بەبەر هاوەڵانیدا بەو زانستە خوداییانە لەچاو ئەو مەدەنیاتە

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٢/٨٤).

بچووک و چرووکەی کە هیچ نییە لە ئاست مەزنیی مەعریفەی خودایی، هەروەها ئاگاداری کردنەوە لە ڕۆشنگەری ڕاستەقینە کە ڕۆشنایی وەحییە و هاوەڵانی لەسەر ئەوە پەروەردە کرد کە ئەو کۆمەڵگا مەدەنییانە پێویستییان بە ئێوەیە چەند قاتی ئەوەی ئێوە پێویستتان بەوان بێت، چونکە ئەوان تەنها ئامرازەکانیان لە دەستدایە ئێوەش ئامانجەکانتان لەلایە، نێوانی ئامراز و ئامانجیش ئاسمان و ڕێسمانە!

بەڵکوو هەرکەس چاوی بە ئینسکلۆپێدیای (المفصل في تاريخ العرب قبل الإسلام)ی «جەواد عەلی» (١٩٨٧ز) مێژوونووسی بەناوبانگی عێراقی کەوتبێت کە لە دە بەرگدا نووسیویەتی، هەروەها خوێندبێتییەوە کە چی لە دوورگەی عەرەبیدا هەبووە لە ڕەنگی جیاوازی ئەدەب و هونەر و دانایی، لەپاشان بەراوردی بکات بەو هەڵسەنگاندنەی لە قورئاندا کراوە بۆ ئەم حاڵەتە عەرەبییەی بەر لە هاتنی پەیامبەر، ئەوکات بەدڵنیاییەوە پێگەی دیاردە و زانست و هونەرەکانی دونیا و مەدەنییەتەکەی لە تەرازووی خوادا دەزانێت، کە لەگەڵ ئەو هەمووە داهێنانە عەقڵی و ئەدەبییەی عەرەب کە ئەو ئینسکلۆبێدیا مێژووییە ئاشکرای کردووە؛ کەچی هێشتا پەروەردگار ئەو واقیعە عەرەبییە بە گومڕایی ئاشکرا وەسف دەکات هەروەک دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذى بَعَثَ فِى الأُمِّيّينَ رَسولًا مِنهُم يَتلو عَلَيهِم آياتِهِ وَيُزَكّيهِم وَيُعَلِّمُهُمُ الكِتابَ وَالحِكمَةَ وَإِن كانوا مِن قَبلُ لَفى ضَلالٍ مُبينٍ﴾ [الجمعة: ٢] «ئەوە ئەو زاتەیە کە لەناو ئوممەتە نەخوێندەوارەکەدا (عەرەب) پێغەمبەرێکی لەخۆیان بۆ ناردن کە ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا بخوێنێتەوە و بژاری دەروونیان بکات، هەروەها کتێب (قورئان) و دانایی (سوننەت)یان فێر بکات کە بەڕاستی لەوەوپێش لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون.»

ئاوای وەسفکردن لەکاتێکدا ئەدیب و شاعیر و گوتاربێژ و سوارچاک و خوڕەوشتی مەردانە و بەخشندەیی میوانداریيان لەوپەڕیدابوو، بگرە دانای وەهایان تێدابووە کە تا ئەمڕۆش وتە و پەندەکانیان لەسەر زاری خەڵکە، لە

وێنەی «قیسسی کوڕی ساعیدە و ئەکسەمی کوڕی سەیفی» و جگە لەوانیش.

بەڵکوو ئەو کەسایەتییەی کە عەرەب بە باڵادەستی بواری داهێنانی هونەری دەیبینن و خاوەن ناوازە ئەدەبییەکانە لە پێغەمبەری خواوە گێڕدراوەتەوە کە لەبارەیەوە فەرموویەتی: «ئیمرِوئولقەیسی ئاڵابەدەستی شیعر؛ لە ئاگردایە.» [1]

ئەم باڵاڕوانییە شەرعییە بەسەر ئەو دەستکەوتە شارستانی و هونەرییانەی پێش هاتنی (ﷺ) بەکەم تەماشاکردنی ئەو دەستکەوتانە نییە لە خودی خۆیاندا، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە ئەو کەسانە پاکژ و چاوڕۆشن نەبوونەتەوە بە وەحی و زانستە خوداییەکان، نەگەیشتوونەتە بڵندی و بەرزیی ڕاستەقینە کە پێگە و ئاستی بەندایەتییە، هێشتا لە قوڕاوی ململانێی دونیاییدا مابوونەوە.

پاک و بێگەردی بۆ (اللّٰه)! لە تەرازووی خوادا ئەم زانستە دونیاییانە چەندە بێنرخن لەئاست ناوەڕۆک و واتاکانی وەحیدا.

لەڕاستیشدا: ئەم هەڵوێستە نەبەوییە لە وردترین خاڵی ڕوونکەرەوەی ئەوەیە کە سوودوەرگرتن لە خەڵکانی دیکە مانای ئەوە نییە سەرسامیان بیت و زەمکردنی واقیعی ئەوان پێکدژ نییە لەگەڵ ئەوەی سوود ببینیت لەو زانست و داناییانەی کە ونبووی موسڵمانە لە هەرکوێ دەستی بکەوێت، هەوڵیش دەدەین لە بڕگەیەکی پاشتردا ئەوە ڕوونتر بکەینەوە.

مەبەستیش لێرەدا ئەوەیە کە هەرکەس لێرە و لە شوێنەکانی دیکەی هاوشێوەی ئێرە وردبێتەوە، ئەوڕێبازە مامەڵەییەی بۆ دەردەکەوێت کە خودا بۆ موسڵمانی دەوێت و پێی ڕازییە لەهەمبەر شارستانییەتەکانی دیکە، ئەم ڕێبازەش زۆر بەکورتی ئەوەیە کە سوودیان لێ وەربگرێت لەوەدا کە پاڵپشتییە

---

(١) رواه الإمام أحمد في "المسند": (٧١٢٧)، وقال الهيتمي: "وفي إسناده أبو الجهيم شيخ هشيم بن بشير، ولم أعرفه، وبقية رجاله رجال الصحيح"، "مجمع الزوائد"، دار الفكر: (٨/٢٢١).

بۆ ئامانجەکەی خۆی، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی کردوویانە، بەڵام نەکەوێتە ناو داوی گەورەکردن و سەرسامبوون و دەمداچەقاندن بەدیاریەوە لەکاتێکدا ئەوان لە ئیسلام گومڕابوون، بەڵکوو هەمیشە هۆشی بە دواکەوتوویی و دابەزین و تاریکپەرستییانەوە هەبێت و چاوی لەسەری بێت، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی چاویان لەسەری بوو و ئاتاجییان بە ڕۆشنگەری ڕاستەقینە کە تەنها بە سینە کرانەوە بۆ ئیسلام دێتەجێ، هەروەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدرَهُ لِلإِسلامِ فَهُوَ عَلى نورٍ مِن رَبِّهِ﴾ [الزمر: ٢٢] «ئەرێ کەسێک کە (اللّٰه) سینەی بۆ ئیسلام ئاوەڵا کردبێت جا لەسەر ڕۆشناییەک لە پەروەردگاریەوە ڕێ بکات (یەکسانە لەگەڵ کەسێک کە ئەوە بەشی نەبێت؟).»

بەڵکوو ئوممەتێک لەو ئوممەتانە نابینیتەوە کە خودا پێغەمبەرانی بۆ ناردبن و لە یەکێک لە هونەرە مەدەنییەکاندا داهێنانیان نەبووبێت. لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردووە تاکوو لە تاریکی بەرەو ڕووناکی دەریان بێنن، خوێنەری ساتەکانی پەیامبەرییەتی لە قورئاندا هەمیشە تێبینی ئەوە دەکات کە قورئان وێنای ئەو گەلانە بەوە دەکات کە لە گومڕایی و تاریکایی و داڕووخاندا بوون سەرەڕای ئەو هێز و توانایی و سەرمایە و دیاردە زلە ماددییانەی لە چنگیاندا بوون و پێغەمبەران جەجتیان لەوە کردووەتەوە کە ئێوە زۆر ئاتاجن بە ڕووناکییەکانی وەحی.

هەرکەسیش وردتر تێبینی دیمەنەکانی ڕەوانەکردنی پێغەمبەران بۆ گەلان بکات دەرهاویشتەیەکی مەترسیداری دیدگای زێدەڕەوانی گوتاری مەدەنی بۆ ئاشکرا دەبێت کە ئەگەر مەدەنییەتی ماددی لەپێشینەی بەرزوبڵند بێت؛ ئەوکات ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە کە پەروەردگار پێغەمبەرانی بە بابەتی پەراوێزخراو و لاوەکی ناردووە، بە دۆسیە مەزنەکانی ڕانەسپاردوون! جا چ سووکایەتییەک لەمە گەورەتر بە پێغەمبەرانی خوا؟!

واقیعیش ئەوەیە کە: ئەگەر خودای مەزنی داناترینی دانایان و داوەران پێغەمبەرانی هەڵبژاردبێت و پاڵاوتبێت و بەسەر جیهانیاندا و کردبنی بە نموونە و مەشخەڵی بەرزی و شەرەفمەندی بەسەر تەواوی مرۆڤایەتییەوە؛ ئەمە مانای ئەوەیە کە بە گرینگترین داخوازییەکانیش ڕەوانەی کردوون و گرینگترین داخوازیش لە پڕۆژە گۆڕانخوازییەکانیانەوە وەردەگیرێت.

ئەم دەرهاویشتە مەترسیدارەش زێدەڕەوانی مەدەنییەت جیاوازی لە هەڵوێستیاندا هەیە بەرانبەری کە هەندێکیان لە بنەڕەتەوە بیریان بەلایدا نەچووە، ئەمەش لەوانەدا زۆرە کە قسە و گوفتارێک دەکەن بۆخۆشیان ئاگایان لە دەرەنجام و دەرهاوێشتەکانی نییە، کە زۆرێک لە لێکۆڵەران ئاماژەیان بەوە کردووە، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "هەستکردن پلە و ئاستی جیاوازی هەیە، کە لەوانەیە مرۆڤ هەست بە شتێک بکات بەڵام هەست بە زۆرێک لە دواهاتەکانی نەکات، لەپاشان لەوانەیە هەست بە هەندێک لە دەرهاویشتەکان بکات و بە هەندێکیشی هەست نەکات."[١]

هەندێکیشیان بەم سەرەنجامەیان زانیوە، بەڵام هەوڵدەدەن پاساو و دەرچەیەکی فریاگوزاریانەی بۆ بدۆزنەوە، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "خەڵکانی جگە لە پێغەمبەران، دەکرێت قسەکانیان ئەنجامگەلێکیان لێ بگیرێت کە خۆشیان بیریان لێ نەکردووەتەوە، ئەگەریش بیریان بۆی بچێت و پێی بزانن یان ئەوەیە پابەندی دەبن و قەبووڵیانە، یاخود پەسەندی ناکەن و لە پێشەکییەکەشی دەست هەڵدەگرن، یاخود هەر لێی ناگەڕێنەوە، بەڵام پێیان وایە کە ئەو قسانە ئەو دەرهاویشتە و دەرەنجامانەیان لێ ناگیرێت."[٢]

---

(١) ابن تيمية، "درء تعارض العقل والنقل" تحقيق: محمد رشاد سالم (١٠/١٢١).

(٢) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى (٣٥/٢٨٨).

جا هەندێکیان ئەگەر بەم دەرهاویشتانە بزانێت؛ پاساوبازی بۆ دەکات، دەڵێت: پێغەمبەران حاڵەتێکی تایبەتن قیاسیان لەسەر ناکرێت، یاخود پێغەمبەران لای خوداوە ڕاستکردنەوەیان بۆ دەکرێت بەپێچەوانەی ئێمەوە، یاخود پێغەمبەران دۆخی مێژوویی خۆیانیان هەیە و نموونەی دیکەی ئەم بەهانانە کە ئەمەش دەرگای بەپێشەنگگرتن دادەخات و فرمانی پەیامبەرییەتی هەڵدەوەشێنێتەوە، بگرە مانای ئەوەیە کە هیچ پێویستییەک نییە بۆ خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) و هیچ سوودێکیش لە شوێنپێ هەڵگرتنی هەڵوێستەکانی وەرناگیرێت، لەکاتێکدا پەروەردگار لەبارەی پێغەمبەرانەوە دەفەرمووێت: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾ [الأنعام: ٩٠] «ئائەوانەن کە (اللّٰه) ڕێنومایی کردوون جا تۆش ڕێنومایی ئەوان بە پێشەنگ بگرە.»

هەندێکی دیکەش لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی دەرکی ئەم دەرەنجامانە دەکەن، پابەندیشی دەبێت -پەنا بەخوا- جا لەمیانەی دەربڕینەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات کە مرۆڤایەتی بەر لەم شارستانییەتەی هاوچەرخ هیچێکی پێ نەبووە، خەڵک سەرجەمیان لە تاریکی و کۆڵەواری و دواکەوتوویی وەحشییێتی و ئەفسانەگەریدا بوون بەر لەم نموونە مرۆییە تاقانەیە، چاکەخوازانیش بەر لەم پەرجووە شارستانییە هاوچەرخە سەرکەوتوو نەبوون لە سازاندنی ژیانێکی ناوازە و ڕۆشنی وەک ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین.

هەرکەسیش لە نموونەی ئەم گوتار و بیر و بۆچوونانە وردبێتەوە، لەوە دڵنیا دەبێتەوە کە زێدەڕەوی مەدەنی سەرچاوەی لادانی ڕۆشنبیرییە، هەروەها ئەوەی کە زێدەڕەویکردن لە دۆسیەی شارستانییەتی ماددیدا بەرپرسی یەکەمی ئەم گرفتە کارەساتبارەیە.

# ٤- ئاشووب و فریوی هێزی ماددی نەیارانی پێغەمبەران

وەختە کرۆکی ململانێ لە قورئاندا لە بنچینەوە بکەوێتە نێوان «دیاردە ماددییەکان» و «بنەمای ئایینی»، یاخود ئەوەی کە قورئان ناوی لێ دەنێت دونیا/ دوارۆژ، لە توندترین هۆکارەکانی هەڵگەڕانەوە و فریوخواردنی خەڵک لە ئاست حەقیقەتەکانی وەحییش ئەوە بووە کە زۆرجار پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان لە کادیرانی دڵسۆزیی بانگخوازی و گەیاندنی ئەم وەحیە سیما دیارەکانی هێزی ماددییان لەلا نەبووە وەک ئەوەی لە دەست ناموسڵماناندا بووە.

ئەمەش یاسایەکی مێژوویی و ڕێسایەکی گەردوونی دووبارەبووەیە کە هەرچەند لە ئەرشیفە بەتەمەنەکەیدا سەربێنیت و ببەیت سەرسامیت دوایی نایەت کە زۆرینەی بانگخوازان و ڕێبوارانی ڕێی گەیاندنی پەیامی خودا هەر لە بەرەبەیانی پەیامبەرییەتییەکانەوە و هەتا ئەم ساتەی کاری هاوچەرخی ئیسلامیش هەمیشە ڕووبەڕووی کۆمەڵێک هێزی گەورەی ماددی بوونەتەوە کە زۆر لەپێش ئەوانەوە بووە و بووەتە مایەی لەڕێلادانی خەڵک لەئاست وەڵامدانەوەی ئەو وەحییەی کە ئەمان پێیان بووە؛ خۆ ئەگەر پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان خاوەن سەرمایەی ماددی و بودجەی زەبەلاح بووانە، تەنانەت تاقێکیش لەو خەڵکە لە مزگەوتەکان دوانەدەکەوتن.

بنوارە لە ئەزموونی پێغەمبەران و ئەوەی لەخۆیگرتووە لە هۆشیاری بانگخوازی، دەیبینیت کە هەمووی خەریکە ببێتە پەیکەرێکی ئاخێوەر لەسەر ململانێی نێوان بانگخوازی وەحی خودایی و فریودەری هێزی ماددی، دەبینیت چۆن هێزی ماددە دڵی خەڵکی کەمەندکێش کردووە و بینایی لێ سەندوونەتەوە

و لایان دەدات لە ملکەچکردن و خۆ ڕادەستکردن بە وەحی، دەبینیت چۆن کادیرانی بانگەواز گیریان خواردووە بە دەست فریوخواردنی خەڵکی بە سیما ماددیگەراییەکان.

جا پێغەمبەر نووح (سەلامی خوای لێ بێت) گەلەکەی بەڕاشکاوی و بەوپەڕی ماددیگەراییەوە پێیان وت: ﴿وَما نَراكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذينَ هُم أَراذِلُنا بادِيَ الرَّأيِ وَما نَرى لَكُم عَلَينا مِن فَضلٍ﴾ [هود: ٢٧] «وا نابینین جگە لە هەژار و لاوازان و پێگەنزمانی ناومان کەسی تر شوێنت کەوتبن، ئەوانیش هەروا بە بیرێکی سادە و ساویلکە ئەو بڕیارەیان داوە، واش نابینین ئێوە هیچتان (لە ماڵی دنیا) بەسەر ئێمەوە هەبێت.»

ئەم هەستەشیان هەمیشە ئامادەگی هەبوو بەرانبەر بە باوەڕداران بە وەحی، تا ئەو ئاستەی کە وەک بەڵگە دەیانهێناوە و نمایشیان دەکرد، هەروەک پەروەردگار لە سوورەتی شوعەرا لەبارەیانەوە دەفەرمووێت: ﴿قالوا أَنُؤمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الأَرذَلونَ﴾ [الشعراء: ١١١] «وتیان ئەرێ دەتەوێت باوەڕت پێ بێنین لەکاتێکدا هەژاران و لاوازان شوێنت کەوتوون.»

هێندەی ئاسمان بارانی گرتەوە و ئاوی لافاوەکە نغرۆی زەوی بوو و نەوەکانی نووح چوونە ناو پەڕاوەکانی لەیادچوونەوە، گەلی عادی یەکەم جڵەوی جێنشینی سەرزەمینیان گرتە دەست، هەروەک پەروەردگار لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿وَاذكُروا إِذ جَعَلَكُم خُلَفاءَ مِن بَعدِ قَومِ نوحٍ﴾ [الأعراف: ٦٩] «-ئەی گەلی عاد- یادی ئەوە بکەنەوە کە خودا لەپاش گەلی نووح ئێوەی کردە جێنشین.»

جا باشووری دوورگەی عەرەبییان لە ناوچەی ئەحقاف و ئیرەم ئاوەدانکردبووەوە و هێزێکی ماددی سەرسوڕهێنەریان هەبوو، بنیادێکی لاشەیی ناوازە، لەگەڵ چڕییەکی دانیشتووان کە خۆشگوزەرانی بژێوی و هونەرەکانی تەلارسازی بۆ لواندبوون، هەروەها تاکڕەوی هێز و پڕچەکی سەربازی بەسەر گشت جیهاندا،

ئەم هێزە ماددییەش تووشی لووتبەرزی کردبوون و لە باوەڕهاوردن بە وادەی گەیشتن بە خودا و ملکەچبوون بۆ وەحی لادابوون، هەروەک پەروەردگار لە باس و وەسفی هێزی لاشەییبیان لە سوورەتی ئەعرافدا دەفەرموێت: ﴿وَاذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ قَوۡمِ نُوحٖ وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗ﴾ [الأعراف: ٦٩] «یادی ئەوە بکەنەوە کە لەپاش گەلی نووح ئێوەی کردە جێنشین و لە بونیادی لاشەتاندا توانایەکی زیاد و فراوانی پێدابوون.»

لە سوورەتی فەجریشدا جەختی لەو بونیادە لاشەییبە ناوازەیان کردووەتەوە: ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ (٦) إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ (٧) ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ [الفجر: ٦ - ٨] «ئەرێ نازانیت پەروەردگارت چۆنی بەسەر عاددا هێنا؟ ئیرەمی خاوەن هێز، ئەوانەی کە لە شاراندا لە وێنەی بەهێزی ئەوان بەدی نەهێنرابوو.»

هەروەها قورئان لە سوورەتی شوعەرادا باس لە کۆشک و تەلار و دامەزراوە زل و زەبەلاحەکان و دەستوەشاندنی سەربازییان دەکات، کە دەفەرمووێت: ﴿أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةٗ تَعۡبَثُونَ (١٢٨) وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمۡ تَخۡلُدُونَ (١٢٩) وَإِذَا بَطَشۡتُم بَطَشۡتُمۡ جَبَّارِينَ﴾ [الشعراء: ١٢٨ - ١٣٠] «ئەرێ ئێوە لە هەچ بەرزاییەکدا تەلارێکی بەرز و دیار و نیشان بۆ لووتبەرزی و خۆنواندن و ئازاردانی خەڵکان دادەمەزرێنن. بینای تۆکمە و قایم دەسازێنن وەک بڵێی نامرن و دواتان نایە. وەختێکیش دەست دەوەشێنن لە خەڵکێک بە فەلاقەیان کوشتن، نارەوا و ستەمکارانە دەیکەن.»

ئەم دیاردە ماددییانەش چاویانی بە چاوبەستی لووتبەرزی داگرتبوو، هەتاکوو ئەوەی بەرانبەر بە پێغەمبەرەکەی خودا (سەلامی خوای لێ بێت) ئەو پرسیارە نابەجێ فوولە خۆکەرە فریوخواردووەیان کرد، بەوپەڕی کش و فشی سیاسییەوە گوتیان کێ لە ئێمە بەهێزترە؟

وەک پەروەردگار ئەو قسەیانمان بۆ دەگێڕێتەوە: ﴿وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً

أَوَلَم يَرَوا أَنَّ اللَّهَ الَّذى خَلَقَهُم هُوَ أَشَدُّ مِنهُم قُوَّةً﴾ [فصلت: ١٥] «گوتیان کێ لە ئێمە بەهێزترە؟ ئەرێ نەیانزانی کە ئەو خودایەی ئەوانی دروستکردووە، لەوان بەهێزترە؟!»

توخوا دیسان لەو پرسیارە پڕ لە کەش و فشەیان وردبەوە کێ لە ئێمە بەهێزترە؟

ئەوجا بنوارە لە وەڵامی خودای خاوەن هێزی ئاسمانەکان و زەوی کە بە مەزنی خودایی خۆیەوە وەڵامیان دەداتەوە و دەفەرموویێت: ﴿أَوَلَم يَرَوا أَنَّ اللَّهَ الَّذى خَلَقَهُم هُوَ أَشَدُّ مِنهُم قُوَّةً﴾ [فصلت: ١٥] «ئەرێ نەیانزانی ئەو خودایەی کە ئەوانی دروستکردووە لەوان بەهێزترە؟!»

توانا ماددییەکانیان وایکردبوو کە لەبەر لووتبڵندییان بەرچاو خۆیان نەبینن، جا دیداری خوایان بەدرۆخستەوە و بەگاڵتە و توانجەوە گوتیان: ﴿أَيَعِدُكُم أَنَّكُم إِذا مِتُّم وَكُنتُم تُرابًا وَعِظامًا أَنَّكُم مُخرَجونَ(٣٥) هَيهاتَ هَيهاتَ لِما توعَدونَ﴾ [المؤمنون: ٣٥ - ٣٦] «ئەرێ بەڵێنی ئەوەتان پێدەدات وەختێک کە مردن و بوونە خۆڵ و ئێسقان لەپاشدا دەردەهێنرێنەوە بە زیندوویی؟ ئای چەندە دوورە چەندە دوورە ئەوەی ئێوە بەڵێنیتان پێدراوە.»

چینە خۆشگوزەران و دەوڵەمەندەکەی ناو گەلی عادیش، وەک ڕێسای مێژوو هەمیشە وابووە، توندتر نەیارییتی بانگەوازیی وەحیان دەکرد، وەک پەروەردگار لە سوورەتی موئمینووندا لەبارەیانەوە دەفەرموویێت: ﴿وَقالَ المَلَأُ مِن قَومِهِ الَّذينَ كَفَروا وَكَذَّبوا بِلِقاءِ الآخِرَةِ وَأَترَفناهُم فِي الحَياةِ الدُّنيا ما هذا إِلّا بَشَرٌ مِثلُكُم يَأكُلُ مِمّا تَأكُلونَ مِنهُ وَيَشرَبُ مِمّا تَشرَبونَ﴾ [المؤمنون: ٣٣] «ئەو دەمسپی و سەرگەورانەی ناو گەلەکەی کە بێباوەڕ و بەدرۆخەرەوەی دیداری دوارۆژ بوون و خۆشگوزەرانمان کردبوون لە ژیانی دونیادا گوتیان: ئەم کابرایە (هودی پێغەمبەر) جگە لەوەی وەک ئێوە مرۆڤێکە و لەوەی ئێوە دەیخۆن و دەیخۆنەوە ئەویش هەر لەوە

دەخوات و دەخواتەوە، هیچێکی تر نییە.»

خۆری عادیش هێشتا ئاوا نەببوو لە کارەساتی باهۆزە بەناوبانگەکەدا کە هەفتەیەک بەسەریەکەوە بەردەوام بوو، شارستانییەتی مەدائین لە حیجر و لە باکووری دوورگەی عەرەبی سەری دەرهێنا و دیسان هەمان زنجیرەی درامای لەخۆباییبوون و کەشوفشکردن بە هێزی مەدەنیی ماددییەوەی دووبارە کردەوە.

کە سەموودیش بە هەمان شێوەی گەلی عاد و لەپاش ئەوان ببوونە خاوەن جێنشینی سەرزەمین، دەستیشیان دابوویە هەمان هونەرەکانی هەڵکۆڵین و تەلارسازی و تێیدا بلیمەت بوون، هەندێک لە پاشماوەکانی ئەمڕۆیان گەواهی بۆ مەدەنییەتە وێران و ئاوابووەکەیان دەدات، کە (اللّٰه) لەبارەی جێنشینی و کۆشک و تەلاریانەوە فەرموویەتی: ﴿وَاذكُروا إِذ جَعَلَكُم خُلَفاءَ مِن بَعدِ عادٍ وَبَوَّأَكُم فِي الأَرضِ تَتَّخِذونَ مِن سُهولِها قُصورًا وَتَنحِتونَ الجِبالَ بُيوتًا﴾ [الأعراف: ٧٤] «یادی ئەوە بکەنەوە کە پەروەردگار لەپاش عاد ئێوەی کردە جێنشین و کردنیە خاوەنی زەوی لە تەختی و دەشتاییەکانی کۆشک سازدەدەن و بە هەڵکۆڵینیش کێوەکان دەکەنە ماڵ و لانە.»

لە سوورەتی شوعەرائیشدا لە تاریفی خۆشگوزەرانی و هەڵکۆڵینەکانیانەوە دەفەرمووێت: ﴿أَتُترَكونَ في ما هاهُنا آمِنينَ(١٤٦) في جَنّاتٍ وَعُيونٍ(١٤٧) وَزُروعٍ وَنَخلٍ طَلعُها هَضيمٌ(١٤٨) وَتَنحِتونَ مِنَ الجِبالِ بُيوتًا فارِهينَ﴾ [الشعراء: ١٤٦ - ١٤٩] «ئەرێ دەتانەوێت ئاوا لێرە و بەمجۆرە وازتان لێ بهێنرێت؟ لە باخات و بێستان و کانی و سەرچاوە، لە کشتوکاڵ و دارخورما و بۆڵداژەندووی قورس و پڕ و تەواو، بەوپەڕی لێزانی و کارامەییشەوە کێوەکان هەڵدەکۆڵن و بە ماڵی دەکەن.»

داهێنانیشیان لە داتاشینی شاخەکاندا سەقامگیرییەکی ئەمنی بۆ فەراهەم کربوون وەک لە سوورەتی حیجردا ئاماژەی پێ دەدات: ﴿وَكانوا يَنحِتونَ مِنَ الجِبالِ بُيوتًا آمِنينَ﴾ [الحجر: ٨٢] «ماڵ و ئاوەدانی ئارام و بەئاسایشیان لە شاخەکان

دادەتراشی.»

لە ئاماژەدان بە ئاوەدانکردنەوەشیان بۆ دونیا دەفەرموویت: ﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخاهُم صالِحًا قالَ يا قَومِ اعبُدُوا اللَّهَ ما لَكُم مِن إِلٰهٍ غَيرُهُ هُوَ أَنشَأَكُم مِنَ الأَرضِ وَاستَعمَرَكُم فيها﴾ [هود: ٦١] «بۆ سەموودیش صالحی برایانمان نارد، پێی وتن ئەی گەلەکەم (اللّٰه) بپەرستن کە جگە لە ئەو پەرستراوێکی حەقی دیکەتان نییە، ئەوە کە هێنانەدی ئێوەی لە سەرزەوی دەستپێکردۆ و کردوونیەتیە ئاوەدانکەرەوە تێیدا.»

جا توانای ماددی و پێشکەوتنی مەدەنییان بەسەر ڕکابەرانیاندا فریویدان و بە پێوەری سەرمایە دونیاییەکان تەماشایان دەکرد، نکۆڵییان لەو وەحییە کرد کە پێغەمبەر سالح (سەلامی خوای لێ بێت) هێنابووی. بگرە نکۆڵی ئەوەشیان دەکرد کە کەسێک گەر سەرمایەیەکی مەزنی ماددی نەبێت خودا تایبەتمەندی بکات بە پێغەمبەرایەتی و وەحی، وەک پەروەردگار لە سوورەتی قەمەردا لە باسی بەڵگەهێنانەوە ماددییەکەیاندا دەفەرموویت: ﴿كَذَّبَت ثَمودُ بِالنُّذُرِ(٢٣) فَقالوا أَبَشَرًا مِنّا واحِدًا نَتَّبِعُهُ إِنّا إِذًا لَفي ضَلالٍ وَسُعُرٍ(٢٤) أَأُلقِيَ الذِّكرُ عَلَيهِ مِن بَينِنا بَل هُوَ كَذّابٌ أَشِرٌ﴾ [القمر: ٢٣ - ٢٥] «سەموودیش ئاگادارکەرەوانیان بەدرۆخستەوە، گوتیان ئەرێ یەک مرۆڤێک لە ئێمە بێت و ئێمە شوێنی بکەوین خۆ ئەوسا ئێمە لە گومڕایی و شێتیداین، لەناو هەمووماندا وەحی بۆ سەر ئەو دابەزیوە؟! بەڵکوو کابرایەکی درۆزنی خۆسەپێنە.»

بەڵام، وەک ڕێسای گەردوون و یاسای مێژوو لەسەری ڕۆیشتووە، دیسان جڵەوبەدەستانی ڕووبەڕووبوونەوە و ئازاردانی سالحی پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێ بێت) کاربەدەست و سەرگەورە و هاوەڵانی موڵک و ڕواڵەتە ماددییەکان بوون، پشتیوانانیشی هەژاران و لاوازان بوون، هەروەک پەروەردگار ئەو وتووێژەمان لە سوورەتی ئەعرافدا بۆ دەگوێزێتەوە: ﴿قالَ المَلَأُ الَّذينَ استَكبَروا

مِن قَومِهِ لِلَّذينَ استُضعِفوا لِمَن آمَنَ مِنهُم أَتَعلَمونَ أَنَّ صالِحًا مُرسَلٌ مِن رَبِّهِ قالوا إِنّا بِما أُرسِلَ بِهِ مُؤمِنونَ(٧٥) قالَ الَّذينَ استَكبَروا إِنّا بِالَّذي آمَنتُم بِهِ كافِرونَ﴾ [الأعراف: ٧٥ - ٧٦] «ئەوانەی لووتبەرز و دەمارزلی ناو گەلەکەی بوون بە لاواز و چەوساوەکانیان وت: ئەرێ زانیوتانە سالح لای پەروەردگاریەوە نێردراوە؟ گوتیان: ئێمە باوەڕدارین بەوەی پێی نێردراوە، سەرگەورە و لووتبەرزانیش گوتیان: ئێمە بەوەی پێی نێردراوە بێباوەڕین.»

بەبۆنەی قسەکردنیشەوە لەسەر توانا ماددییەکانی عاد و سەموود، تێبینییەکی بێوێنەی زانای مەزن، ئیبن خەلدوونم وەبیردێتەوە کە لە موقەددیمەکەیدا دەیفەرموێت:

"بنیاد و هەیکەلە مەزنەکانی دەوڵەت بەپێی ڕێژەی بەهێزی دەوڵەتەکەن لە بنچینەکەیدا؛ چونکە ئەوانە بە هەماهەنگی و کۆبوونەوەی هێزی زۆری مرۆیی و دەستی کار نەبێت نایەنەدی، جا ئەگەر دەوڵەتەکە گەورە و بەرفراوان بوو، موڵک و زەوی وهەروەها دانیشتووانی زۆر بوون، دەستی کاریش زۆر دەبێت، لە پەڕ تا پەڕی وڵاتەوە کۆدەکرێنەوە و کارەکە لە تۆکمەترین هەیکەلدا دێننە جێ، نابینیت دامەزراوە و تەلارە مەزنەکانی هۆزی عاد و سەموود، چۆن قورئان سەربووردەیانی گێڕاوەتەوە، بەچاوی سەریش بنواڕە لە هۆتاقی کیسرا و ئەو هێزو هونەرەی فارسەکان نواندوویانە تێیدا، تەنانەت هاڕوونەڕەشید پێی داگرت لەسەر ئەوەی بیڕووخێنێت، زۆریشی لەسەر قورس بوو، دەستیشیان تێ برد بەڵام هێزیان لێ بڕا و کۆڵیان دا، تەماشا چۆن دەوڵەتێک دەستی دەگاتە کارسازییەک لە بینادا کە دەوڵەتێکی پاش خۆی تەنانەت بۆشی خاپوورنەکرێت، لەگەڵ جیاوازی گەورەی نێوان بنیادنان و ڕووخاندندا."[1]

بەهەرحاڵ، ئەوەندەی نەبردبوو کە قەڵەڕەشی دوورگەی عەرەبی بەسەر

---

(١) ابن خلدون، «المقدمة»، تحقيق: الشدادي، بيت الفنون، (٢٠٠٥م): (١/٢٩٩).

کەلاوەکانی عاد و سەموودەوە قریشکاندی و هەرچی دیاردەی هێزیش کە هەیانبوو، ئەمجارەیان مووسای پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەنێوان ئەهرامەکانی میسردا ڕووبەڕووی شارستانییەتی فیرعەونی دەبوویەوە بە هەرچی قورسایی مێژوویی و توانای ئیمپراتۆرییەوە کە هەیانبوو، تاکوو دیسان زنجیرە درامای پێراکێشانی هێزی مەدەنی و فریوخواردنی لەهەمبەر وەحیدا دووبارە ببێتەوە.

فیرعەون لەسەر نووسینگەی کۆشکی سپی بەڕێوەبردنی جیهانی ئەوکات؛ چوارمشقی دابوو، وەک ناوخۆی شاهانەیی لە سوورەتی غافیردا ئاماژەی پێ دەکات: ﴿يا قَومِ لَكُمُ المُلكُ اليَومَ ظاهِرينَ فِي الأَرضِ﴾ [غافر: ٢٩] «ئەی گەلەکەم وا ئەمڕۆ موڵک و سامان هی ئێوەیە و زاڵ و دەسەڵاتداری سەرزەوی خۆتانن.»

فیرعەون کەشوفشێکی لەڕادەبەدەری بە توانا سیاسییەکانییەوە دەکرد، وەک پەروەردگار لە سوورەتی زوخڕوفدا لەبارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿وَنادى فِرعَونُ فى قَومِهِ قالَ يا قَومِ أَلَيسَ لى مُلكُ مِصرَ﴾ [الزخرف: ٥١] «فیرعەون هاواری کرد بەناو گەلەکەیدا، گوتی: ئەرێ گەلۆ موڵک و سەرمایەی میسر هەر هی من نییە؟»

سەرسوڕمان دوایی نایە لە ڕادەی تێگەیشتنی قووڵی مووسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) و تێبینیکردنی بۆ ئەوەی کە چۆن شارستانییەتی فیرعەونی و هێزە ماددییەکەی خەڵکی فریوداوە و چۆن ئەو پێوەرە ماددییە ڕەگ و ڕیشە داکوتراوانە لە دەروونی مرۆڤەکاندا لایداون لەڕادەستبوون بۆ وەحی، مووسای کەلیموڵڵا ئەم یاسا مێژووییەی دەربڕیوە سەبارەت بە گەورەترین ئاڵنگاری کە ڕووبەڕووی بانگەوازەکان دەبێتەوە، وەک لەوێدا کە پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَقالَ موسى رَبَّنا إِنَّكَ آتَيتَ فِرعَونَ وَمَلَأَهُ زينَةً وَأَموالًا فِي الحَياةِ الدُّنيا رَبَّنا لِيُضِلّوا عَن سَبيلِكَ﴾ [یونس: ٨٨] «مووسا گوتی پەروەردگارمان تۆ ڕازانەوە و ماڵ و سەرمایەیەکی دونیات بە فیرعەون و دارودەستەکەی داوە،

پەروەردگارمان تاکوو خەڵک لە ڕێگای تۆ گومڕا بکەن.»

جا کاتێک پەروەردگار مووسای نارده ناو ئەم کۆمەڵگا میسرییە پێی نەفەرموو بڕۆ گەلەکەی خۆت بەئاگا بێنەوە با لە شارستانییەتی میسری کەڵک وەربگرن، بەڵکوو ناردی تاکوو لە تاریکایی شارستانییەتی خۆیان بە وەحی چاوڕۆشنیان بکاتەوە، وەک دەفەرموویت: ﴿وَلَقَد أَرسَلنا موسى بِآياتِنا أَن أَخرِج قَومَكَ مِنَ الظُّلُماتِ إِلَى النّورِ﴾ [إبراهيم: ٥] «بەڕاستی کە ئێمە مووسامان بە ئایەتەکانی خۆمانەوە نارد کە گەلەکەت لە تاریکاییەنەوە بەرەوڕووناکی دەربێنە.»

بەڵکوو پەروەردگار بە تەرازووی خۆی بەنی ئیسرائیلی بەو زانستە خوداییانەی کە لەلایان بووە؛ بە گەورەتر و خاوەن پێگەتر بەسەر فیرعەونەکان پۆلێنکردووە لەگەڵ ئەو شارستانییێتەشی هەیانبووە، وەک دەفەرموویت: ﴿وَلَقَد آتَينا بَني إِسرائيلَ الكِتابَ وَالحُكمَ وَالنُّبُوَّةَ وَرَزَقناهُم مِنَ الطَّيِّباتِ وَفَضَّلناهُم عَلَى العالَمينَ﴾ [الجاثية: ١٦] «بەڕاستی کە ئێمە پەرتووک و کار و داوەریکردن پێی و پێغەمبەرایەتیمان بەخشی بە بەنی ئیسرائیل و کردماننە خاوەن پێگە بەسەر جیهانیانەوە.»

جا ئەگەر خوێنەر لێرەدا وردبێتەوە کە چۆن ڕۆشناییەکانی پەیامبەرییەتی و پەرتووک هۆکاری بە خاوەنپێگەبوونی بەنی ئیسرائیل بوون و چۆن شارستانییەتی فیرعەونەکان سەرکەوتوو نەبوون لە دەرهێنانیان لە تاریکییەکان، ئەوکات تەرازووی خوداییان بۆ بەدیاردەکەوێت لە هەڵسەنگاندنی کۆمەڵگا و کەلتوور و کەسایەتی و شارستانییەت و مەدەنییەتەکاندا، کە تەرازووی موسڵمانیش شوێنکەوتەی تەرازووی پەروەردگارە.

بارودۆخەکەش تازە نەبوو بۆ پێغەمبەری خۆشمان موحەممەد (ﷺ) کە نکۆڵیکارانی پەیامبەرییەتی و ئەو وەحییەی کە پێی بوو؛ بۆ پشتلێکردنی پەنایان دەبردە بەر بەڵگەهێنانەوە بە لاوازییە ماددییەکەی، هەروەها ئەوەی

کە ئەو سەرمایانەی هێز و خۆشگوزەرانی لەلا نییە کە هەندێک لە دەوڵەمەندە گەورەکانی حیجاز لەلایانە و خاوەنین و وایاندەبینی کە ناکرێت مل بۆ پێغەمبەرێک کەچ بکرێت مەگەر لە خانەدانەکانی ناو چینی ئەرستۆکراتییەک لە دوو پایتەختەکەی حیجاز بێت مەککە یان تائیف، وەک لە سوورەتی زوخرڕوفدا لەوبارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿وَقالوا لَولا نُزِّلَ هذَا القُرآنُ عَلى رَجُلٍ مِنَ القَريَتَينِ عَظيمٍ﴾ [الزخرف: ٣١] «وتیان دە با ئەم قورئانە دابەزیبایەتە سەر پیاوێکی مەزن لە دوو دێهاتەکە.»

مەبەستیان لە دوو پیاوەکە، وەلیدی کوڕی موغەیرە و عورِوەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بوو.

زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویش ئەوەیان پێ وت کە ئەو سەرمایەیەکی ماددی وای نییە کە شایانی ئەوە بێت ئەوان شوێنی بکەون، وەک هەندێک لە بەڵگەهێنانەوەکانیانی هێناوە لەوێدا کە دەفەرمووێت: ﴿أَو يُلقى إِلَيهِ كَنزٌ أَو تَكونُ لَهُ جَنَّةٌ يَأكُلُ مِنها﴾ [الفرقان: ٨] «... یاخود گەنجینەیەکی بۆ بنێردرایە، یاخود باخێکی هەبووایە لێی بخواردایە.»

ڕاستەوخۆ لە پاشکۆی ئەم ئایەتەشدا پەروەردگاروەڵامی ئەو بەڵگەهێنانەوە ماددییە بێمانایەیان دەداتەوە کە ئەو بێدەسەڵات نییە لەئاست ئەو بەخشش و تواناییانە، بەڵام ویستی لەسەر ئەوە بووە ئەوان تاقیبکاتەوە، کە دەفەرمووێت: ﴿تَبارَكَ الَّذي إِن شاءَ جَعَلَ لَكَ خَيرًا مِن ذلِكَ جَنّاتٍ تَجري مِن تَحتِهَا الأَنهارُ وَيَجعَل لَكَ قُصورًا﴾ [الفرقان: ١٠] «هەر لە مەزنی و زۆر و زیادبووندا بن فەڕ و بەخششەکانی ئەو پەروەردگارەی کە ئەگەر بیهەوێت لەوە چاکترێکیشت پێ دەدات، باخاتێک کە ڕووبارەکانی بەژێردا بڕۆن و چەندان کۆشک و تەلاریشت پێ بدات."

بەڵام پەروەردگار لە شوێنێکی دیکەدا پێغەمبەرەکەی لەوە ئاگاداردەکاتەوە کە فریو نەخوات بە وابەستەبوونی ئەوان بە ماددەوە و دووبارە ڕێسا مێژووییە

بانگخوازییەکانی بەیاد دێنێتەوە کە ململانێی نێوان وەحی و ماددەیە و ئاڵنگاری باوەڕ لەهەمبەر سیما ماددییگەراییەکان، وەک لە سوورەتی هوددا دەفەرمووێت: ﴿فَلَعَلَّكَ تارِكٌ بَعضَ ما يوحى إِلَيكَ وَضائِقٌ بِهِ صَدرُكَ أَن يَقولوا لَولا أُنزِلَ عَلَيهِ كَنزٌ﴾ [هود: ١٢] «خۆ لەوانەیە تۆ واز لە هەندێک لەوە بێنیت کە بۆت وەحی دەکرێت، و سینەت پێی تەنگ بێتەوە کە ئەوان بڵێن با گەنجینەیەکی بۆ دابەزێنرایە.»

بەڵکوو پەروەردگار وای بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) داداوە کە زۆر بە ڕوون و ڕاشکاوی بە قورەیش بڵێت: کە ئەو هێزی ماددی و گەنجینە و داراییەی لەلا نییە کە پێوەر و تەرازووی ئەوانە، ئەو تەنها بانگخوازێکە بۆ وەحی، هەروەک بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرمووێت: ﴿قُل لا أَقولُ لَكُم عِندى خَزائِنُ اللَّهِ وَلا أَعلَمُ الغَيبَ وَلا أَقولُ لَكُم إِنّى مَلَكٌ إِن أَتَّبِعُ إِلّا ما يوحى إِلَىَّ﴾ [الأنعام: ٥٠] «بڵێ من پێتان ناڵێم کە گەنجینەکانی خودا لەلای منە، یان پەنهانەکان دەزانم، یاخود ناڵێم من فریشتەم، من جگە لەوەی بۆم وەحی کراوە شوێنی هیچێکی دیکە ناکەوم."

جا بنوارە چۆن لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) لایاندابوو تەنها لەبەرئەوەی کە کۆمەڵە سیمایەکی ماددی وەهای نییە کە شایانی ملکەچ کردن بێت بۆی، بەڵکوو تەماشای سەیرتر لەوە: ئەوەی کە ئەوە بۆخۆی کرۆکی تاقیکردنەوەی خودایی بوو بۆیان، کە خۆداماڵین بوو لە وابەستەبوون بە ماددیگەرایی و ڕادەستبوون بوو بە وەحی، هەربۆیە پەروەردگار پێغەمبەرەکەی ئاگادارکردووەتەوە کە دڵتەنگ نەبێت بە هەندێک لە وەحی بەهۆی ئەوەی ئەو سیما ماددیگەراییەی نییە کە پێوەری ئەوانە بۆ گوێڕایەڵبوون، ئەوەیش کە خودا وەڵامی ئەو داواکاریانەیان نەداتەوە کە وەک پێوەری ماددی بە مەرجی شوێنکەوتنیان داناوە، جا دەبێت یان ڕێگای وەحی هەڵبژێرن یاخود ڕێگای ماددە!

لەڕاستیشدا: خۆ ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر تەختی هێز و دارایی شانی دادایە، ئەو دەمە هیچ یەک لە نەیارانی لێی دوانەدەکەوتن، نەک لەبەر ئەو حەقە

پاشەڕۆژیەی کە پێیەتی، بەڵکوو لەبەر ئەو هێزە دونیاییەی کە لەدەستیدایە، جا چ واتایەکی تاقیکردنەوە و لەبێژینگدان و پوختکردنەوە لە شوێنکەوتنی زلهێز و هەژموونداردا هەیە؟

هەربۆیە؛ کاتێک سولەیمانی پێغەمبەر (علیه السلام) لەسەرزەویدا پادشایەک بوو کە هەرچی ئامرازی دەسەڵات هەبوو لەدەستیدا بوو، یەکێک لە خەڵکی لە باوەڕپێهێنانی دوانەکەوت، نە لە جنۆکە و نە لە مرۆڤ، زەبوون و ملکەچی ئاماژەیەکی بوون، جا کاتێکیش بەلقیسی شاژنی سەبەء هەندێک لە باوەڕپێهێنانی خۆی دوادەخست و دەیویست بە دیاری و دارایی گەورە گەورە تاقی بکاتەوە کە وتی: ﴿وَإِنِّي مُرسِلَةٌ إِلَيهِم بِهَدِيَّةٍ فَناظِرَةٌ بِمَ يَرجِعُ المُرسَلونَ﴾ [النمل: ٣٥] «من دیاریەکی بۆ دەنێرم، جا چاوەڕوان دەبم بزانم نێردراوانم بەچی وەڵامێک دێنەوە.»

سولەیمانی پێغەمبەر (علیه السلام) هەڕەشەی لێ کرد بە خستنەڕێی لەشکری زل و زەبەلاح هەروەک فەرمووی: ﴿ارجِع إِلَيهِم فَلَنَأتِيَنَّهُم بِجُنودٍ لا قِبَلَ لَهُم بِها﴾ [النمل: ٣٧] «بگەڕێرەوە بۆ لایان، سوێند بێت بە سەربازانێکی وەها بۆیان بێین کە توانای بەرەنگاربوونەوەیان نەبێت.»

جا بەلقیس کە هاتە خزمەتی و سەری سوڕمابوو لەو تەلار و باڵەخانە شووشەییانەی کە بینی و ملکەچی پێغەمبەری خوا بوو (علیه السلام)، وەک پەروەردگار دەیگێڕێتەوە: ﴿قيلَ لَهَا ادخُلِي الصَّرحَ فَلَمّا رَأَتهُ حَسِبَتهُ لُجَّةً وَكَشَفَت عَن ساقَيها قالَ إِنَّهُ صَرحٌ مُمَرَّدٌ مِن قَواريرَ قالَت رَبِّ إِنّي ظَلَمتُ نَفسي وَأَسلَمتُ مَعَ سُلَيمانَ لِلَّهِ رَبِّ العالَمينَ﴾ [النمل: ٤٤] «پێی گوترا بچۆ ناو کۆشکەکەوە جا کاتێک کە چاوی پێی کەوت وایزانی ئاوێکی بەخوڕ و جووڵەیە و قاچەکانی هەڵکرد و بەدەریخست (بۆئەوەی تەڕ نەبێت)، سولەیمان پێی گوت: ئەوە تەختێکی شووشەیە و ئاو لەژێریدایە، بەلقیس گوتی پەروەرودگارم من ستەمم لە خۆم

کرد (بە بێباوەڕبوونی پێشووم)، وا من لەگەڵ سولەیمان و لەشوێن ئەوەوە ملکەچی پەروەردگاری جیهانیان بووم.»

ئەم ڕێسا مێژووییەی پەیامە ئاسمانییەکان کە فریوخواردنی خەڵکە بە ڕواڵەتی ماددی نەیارانی پێغەمبەران، هەرکەس چمکێکی مێژووی پەیامبەرییەتییەکانی ئاگا لێبێت ئاشنایە پێی، جا بانگخوازانی وەحی -زۆرجار- لە لاوازیی ماددیدان، جگە لە هەژار و نەدارانیش خەڵکێکی دیکە لەڕیزیاندا نییە، لەکاتێکدا سەرگەورە و سەرمایەدار و دەسەڵاتداران ئازاریان داون و گێچەڵیان پێ کردوون.

هەربۆیە؛ وەختێک کە هیرەقل شارەزای مێژووی پەیامبەرییەتییەکان بوو پرسیارێکی زۆر بەجێ و ماناداری پرسی، تێبینییەکی بلیمەتانە و زیرەکانەتریشی بەشوێنیدا وت، وەک لە دوو سەحیحەکەدا هاتووە کە هیرەقل بە ئەبوو سوفیانی وت: "لێم پرسیت: سەرگەورە و خانەدانەکان شوێنی کەوتوون یاخود لات و هەژاران؟ وتت: کە لات و هەژاران شوێنی کەوتوون، کە هەر ئەوانەشن شوێنکەوتووانی پێغەمبەران."[١]

---

(١) "صحيح البخاري": (٧)، و "صحيح مسلم": (٤٦٠٧).

# ٥- واتای مشتومڕی مەدەنییەت/چاکییێتی

خوێنەری مێژووی دێرینی ئیسلامی تێبینی ئەوە دەکات کە ڕەهەندی مەدەنی بەرەو هەڵکشان چووە هەتا ئەوەی لە ناوەڕاستەکانی مێژووی ئیسلامی گەیشتووەتە لووتکەی خۆی، جا سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، سەردەمێک بوو کە بە سادەیی و سنووردارییێتی مەدەنی تایبەتمەند بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) ترسی ئەوەی لەسەر هاوەڵانی هەبوو کە جیاوازیی توانا مەدەنییەکان لەنێوان کۆمەڵگای موسڵمان و بێباوەڕدا ببێتە مایەی گومان و شڵەژان لە باوەڕیاندا، لەو چیرۆکەشدا کە عومەری کوڕی خەتاب دەیگوێزێتەوە سەبارەت بە شمەک و تفاقی ناوماڵی پێغەمبەر (ﷺ) و کاردانەوەی عومەر لە وەختی بینینیدا، هەروەها کاردانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرانبەریدا، چەندین مانای تێروتەسەلی لە کێشانی دیمەنەکەدا تێدایە کە بوخاری و موسلیم و جگە لەوانیش دەیگێڕنەوە لە عومەری کوڕی خەطتابەوە کە فەرموویەتی: "لە ماڵی پێغەمبەردا (ﷺ) سەرم بەرزکردەوە و نواڕیم، سوێند بە (اللّٰه) شتێکم تێدا نەبینی چاو بگێڕێتەوە (بەکەڵک بێت) جگە لە سێ تفاق، جا کاتێک جێگای حەسیرەکەم بە تەنیشتییەوە بینی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لە پەروەردگار داوا بکە کە ڕۆزی ئوممەتەکەت فراوان بکات، خۆ ڕۆزی فارس و ڕۆمی فراوانکردووە لەکاتێکدا خوداش ناپەرستن، پێغەمبەر (ﷺ) ڕاستبوویەوە و دانیشت و لە پاشان فەرمووی: ئەرێ تۆ لە گوماندای کوڕی خەتاب؟! ئەوانە خەڵکانێکن کە خۆشییەکانیان بۆ پێشخراوە لە ژیانی دونیادا."[١]

هەر کە سەردەمی پێغەمبەرایەتیش دواییهات و سەردەمی خیلافەتی

---

(١) "صحيح البخاري": (٢٤٦٨)، و "صحيح مسلم": (١٤٧٩).

ڕاشدین دەستی پێکرد، ئیدی فوتوحات دەستی پێکرد و وڵاتان ئازادکران و پارە و سامان هەڵڕژا و ڕێکخستنی دەوڵەتی ئیسلامی و نوێکردنەوەی دەزگا بەڕێوەبەرییەکان لە وێنەی دیوان و تۆمارگا و خەزێنە و بەخشینەکان و نموونەی ئەوانە زیادی کرد.

لەپاش سەردەمی خیلافەتی ڕاشدین و هاتنەکایەی دەسەڵاتی ئەمەوی و دەسەڵاتی عەبباسی؛ مەعریفە و زانستە عەقڵی و فەلسەفی و ئەزموونییەکان تەقینەوە و پرۆسە و جووڵەی وەرگێڕان گەشایەوە و پەیمانگای تایبەتمەند و پسپۆڕی بۆ بنیادنرا، دامەزراوە سیاسییەکان کەوتنە کێبڕکێ لە وەدەستخستنی پەرتووک و بەستنی کۆڕی زانست و مشتومڕ و وتووێژ و هێنانەپێشەوەی داهێنەران و لێهاتووان و ئینسکلۆپێدیای زەبەلاح لە هونەرە جیاوازەکاندا نووسرانەوە کە هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان سەرچاوەن.

بەم شێوەیە؛ خوێنەری مێژووی دێرینی ئیسلامی تێبینی ئەوە دەکات کە چۆن پێشکەوتنی مەدەنی لەگەڵ بەرەوپێشچوونی مێژوودا زیاددەکات کە دەسەڵاتی عەبباسی مەدەنیترە لە ڕووی ماددییەوە لە دەسەڵاتی ئەمەوی، دەسەڵاتی ئەمەویش لە ڕووی ماددییەوە مەدەنیترە لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدین، سەردەمی خیلافەتی ڕاشدینیش مەدەنیترە لە ڕووی ماددییەوە لە چاخی پێغەمبەرایەتی.

ئەوجا ئەگەر بێین و ئەم وێنە پەرەسەندووە بەپێی واقیعی مێژوویی لە بەها مەدەنییەکەیدا بەراورد بکەین بە بەها ئایینییەکەی بەپێی تەرازووی شەرعی؛ دەبینین کە ئەم هاوکێشە مێژووییە بەتەواوی بەپێچەوانەی تەرازووی شەرعییەوەیە، بەو واتایەی کە دژیەکییەکی مشتومڕی لەنێوان تێکڕای مەدەنییەت و تێکڕای باشێتیدا هەیە، جا لە ساتی هەڵکشانی هێڵی پۆتانی ئاستی مەدەنییەتدا؛ هێڵی پۆتانی ئاستی باشێتی دادەکشێت.

کەمبوونەوەی خێر و باشییتیش لەگەڵ بەرەوپێشچوونی کاتدا پێدراوێکە لە پێدراوە چەسپاو و بڕاوەکانی شەریعەت کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) چەسپاوە بە چەسپانێکی بڕاوە و گومان هەڵنەگر نەک وەک بابەتێکی ئیجتیهادی، زیاد لە یەکێک لە شارەزایانی بواری فەرموودەی نەبەوی لە وێنەی ئیبن تەیمییە و ئیبن حەجەر و سیوطی و جگە لەوانیش ئەوەیان وتووە کە فەرموودەی: «باشترینی سەدەکان سەدەی منە.» فەرموودەیەکی موتەواتیرە، کە سێزدە هاوەڵ لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویانەتەوە، لە هەریەکێکیش لەوانەوە کۆمەڵێک ڕاوی گێڕاویانەتەوە، هەروەها زانایانی پاشینیش کە پەرتووکی تایبەتیان بە کۆکردنەوە و دیاریکردنی تاک تاکی فەرموودە موتەواتیرەکان نووسیوە ئەوەیان بە دەق وتووە.[١]

بوخاری و موسلیم کۆمەڵێک گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەیان تۆمارکردووە، بەڵکوو دیوانە بنەڕەتییەکانی سوننەت هەموویان بەشێک لەم فەرموودانەیان تۆمارکردووە، نموونە لەوە ئەوەی کە بوخاری و موسلیم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «باشترینی ئوممەتەکەم ئەو چاخەیە کە منی تێدا نێردراوە، لەپاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، لەپاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن.»[٢] هەروەها لە سەحیحدا لە عائیشەوە هاتووە کە فەرموویەتی: «پیاوێک

---

(١) پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "بە موتەواتیری لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: باشترین سەدەکان (بە واتای نەوە و چینێکی مرۆیی) ئەو سەدەیەیە کە منیان تێدا نێردراوە، لەپاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، لەپاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن ... " "منهاج السنة": (٢/٣٥) ... ئیبن حەجەر دەفەرمووێت: "بە موتەواتیری ئەو فەرموودەیەی لێوە گێڕدراوەتەوە: باشترینی خەڵک سەدەی منن، لەپاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن ..." "الإصابة في تمييز الصحابة" دار الكتب العلمية: (١/١٦٥).

سیوطی دەفەرمووێت: "بەوە دەچێت کە ئەم فەرموودەیە موتەواتیر بێت" [موناوی لە «فيض القدير» گواستوویەتیەوە، دار الكتب العلمية: (٣/٦٣٨)، بڕوانە: الكتاني، «نظم المتناثر في الحديث المتواتر»، دار الكتب العلمية، (ص ٢١٠).

(٢) "صحيح البخاري" :(٣٦٥٠)، و "صحيح مسلم": (٢٥٣٤).

لە پێغەمبەری (ﷺ) پرسی: کام خەڵکە باشترن؟ ئەویش فەرموی: ئەو چاخەی منی تێدایە، لەپاشان دووەم، لەپاشان سێیەم.»[١]

ئەم واتایەش کە ئاماژەیە بەوەی باشیێتی لەو قۆناغە مێژووییەدا پاشەکشە دەکات بەتەنها لەسەر ئەم فەرموودە موتەواتیرە ڕانەوەستاوە، بەڵکوو بڕی هاوبەشی چەندین شاهێدی شەرعی زۆروزەبەندەیە، هەروەک بوخاری و موسلیم لە فەرموودەی ئەبوو هوڕەیرەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "لە باشترین چاخەکانی نەوەی ئادەمدا نێردراوم چاخ بە چاخ.»[٢]

دیسان لەوەش ئەوەی کە موسلیم لە سەحیحەکەیدا لە ئەبوو بوڕەیدەوە لە باوکییەوە، دەفەرمووێت: «نوێژی مەغریبمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کرد، لەپاشان وتمان: بمێنینەوە هەتاوەکوو نوێژی عیشاشی لەگەڵدا دەکەین: فەرمووی: جا ماینەوە، جا پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەرەوە و بینینی، فەرمووی: ئەوە هێشتا لێرەن؟ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! نوێژی مەغریبمان لەگەڵ کردی لەپاشان وتمان دەمێنینەوە هەتاوەکوو عیشاشت لەگەڵدا دەکەین، فەرمووی: باشتان کرد، یاخود "پێکاتان". فەرمووی: ئەوجا سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان کە زۆرجار ئاوا سەری بەرزدەکردەوە بۆ ئاسمان. ئەوجا فەرمووی: ئەستێرەکان ئاسایشن بۆ ئاسمان، جا ئەگەر ئەستێرەکان نەمان؛ ئەوەی ئاسمان وادەی پێدراوە بۆی دێت (وێران دەبێت لەڕۆژی دواییدا)، منیش ئاسایشم بۆ هاوەڵانم، جا ئەگەر من نەمام، ئەوەی وادەی بە هاوەڵانم دراوە بۆیان دێت، هاوەڵانیشم مایەی ئاسایشی ئوممەتەکەمن، خۆ ئەگەر هاوەڵانم نەمان؛ ئەوەی وادەی دراوە بە ئوممەتەکەم یەخەیان دەگرێت.»[٣]

---

(١) "صحيح مسلم": (٢٥٣٦).

(٢) "صحيح البخاري": (٣٥٥٧).

(٣) "صحيح مسلم": (٢٥٣١).

جا پێغەمبەر (ﷺ) ساتی بوون و مانەوەی خۆی بە پشتێنی سەلامەتی کۆمەڵگا دانا کە بە نەمان و ڕۆشتنی ئەوەیان دەچێت، هاوەڵانیشی لەپاش خۆی کردووە بە پشتێنی سەلامەتی شوێنکەوتووان کە ئەگەر چوون، کۆمەڵگا ئەوەشیان لەدەست دەدات. هەموو ئەوەشی چوواندووە بەوەی کە مانەوەی ئەستێرەکان سەلامەتییە بۆ ئاسمان، جا کە ئەستێرەکان لێڵ بوون وەک لە گۆڕانە گەردوونییە مەزنەکانی بەر لە هاتنی دوارۆژدا ئەوە ڕوودەدات؛ ئەو کاتە ئیدی ئاسمانیش لەت دەبێت و قڵیش دەبات وەک لە سوورەتی تەکویر و ئینفیطار و ئینشیقاق و جگە لەوانیشدا هاتووە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەو شوێنەوارەشی کردووە کە ئەم چاخە خاوەن فەزڵانە لەپاش خۆیان جی دێڵن لە بەرەکەت و دەستکەوت و سەرکەوتندا هەریەکە و بەپێی فەزڵ و پێگەی خۆیان، وەک بوخاری و موسلیم لە ئەبوو سەعیدی خودری و جابر و جگە لەوانیشەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

«ڕۆژگارێک بەسەر خەڵکیدا دێت، کۆمەڵانێک دەچنە غەزا، پێیان دەوترێت: کەستان تێدایە پێغەمبەری خوای (ﷺ) دیبێت؟ دەڵێن: بەڵێ؛ جا سەردەخرێن. لەپاشان کۆمەڵانێک دەچنە غەزا، پێیان دەوترێت: تێتاندا هەیە ئەوانەی دیبێت کە هاوەڵێتی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کردووە؟ دەڵێن: بەڵێ؛ جا سەردەخرێن. لەپاشان کۆمەڵانێک دەچنە غەزا، پێیان دەوترێت: تێتاندا هەیە یەکێک کە ئەوانەی دیبێت کە هاوەڵێتی ئەوانەیان کردبێت کە هاوەڵێتی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کردووە؟ دەڵێن: بەڵێ؛ جا سەردەخرێن.»[١]

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا:

«ڕۆژگارێک بەسەر خەڵکیدا دێت، کۆمەڵێک بۆ غەزا دەنێردرێن، جا دەڵێن:

---

(١) "صحيح البخاري": (٣٦٤٩)، و "صحيح مسلم": (٢٥٣٢).

بگەڕێن، بزانن کەستان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تێدایە؟ پیاوێک دەبینرێتەوە، جا بەو پیاوە سەردەخرێن. لەپاشان نێردەی دووەم دەنێردرێن، جا دەڵێن: تیایاندایە کە هاوەڵانی پێغەمبەری (ﷺ) دیبێت؟ جا بەوانە سەردەخرێن. لەپاشان نێردەی سێیەم دەنێردرێن، دەوترێت: بگەڕێن، بزانن ئەوانە دەبیننەوە کە ئەوانەیان دیبێت کە هاوەڵانی پێغەمبەریان (ﷺ) دیوە؟ لەپاشان نێردەی چوارەم دەنێردرێن، ئەوجا دەوترێت: بنوارن، یەکێکیان تێدا دەبیننەوە کە یەکێکی دیتبێت کە یەکێکی دیبێت کە هاوەڵانی پێغەمبەری (ﷺ) دیبێت؟ یەک پیاوێک دەبینرێتەوە؛ جا بەو پیاوە سەردەخرێن.»[١]

خۆ ئەگەر ئەو چاخانە لە خودی خۆیاندا تایبەتمەندی و فەڕ و فەزڵیان نەبا؛ بە تەنها خۆدانەپاڵ ئەوان نەدەبووە هۆکاری سەرکەوتن.

**مەبەستیش لە هەموو ئەوەدا ئەوەیە کە بەڵگەی مێژوویی بۆ سەلماندووین کە مەدەنییەت هەڵدەکشێت، بەڵگەی شەرعیش ئەوەی بۆ سەلماندووین کە باشییتی دادەکشێت و پاشەکشە دەکات. ئەم بەراوردەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شارستانییەت و مەدەنییەتی ماددی پێوەرە خوداییەکە نین بۆ نرخاندنی کۆمەڵگا و ئوممەتەکان؛ خۆ ئەگەر شارستانییەت بە مانا ماددییە باوەکەی مەبەستی بنچینەیی شەریعەت بووایە؛ ئەوکات چاخی عەبباسی کە زانستە عەقڵی و ئەزموونییەکان تێیدا گەشەیان کردبوو باشتر دەبوو لە چاخی هاوەڵان، هەروەها چاخی هاوەڵان کە تێیدا دەوڵەت و سیستەمەکانی دەوڵەت فراوانبوون باشتر دەبوو لە چاخی پێغەمبەرایەتی کە تێیدا ژیانی موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی تەنها پاروویەک بوو کە پشتیان ڕاست بکاتەوە.**

لە ڕاڤەی هەندێک لە دیاردەکانی پاشەکشێکردنی خێر و باشییتی لە چاخی عەبباسیشدا پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرموێت: "پەروەردگار لە ڕووناکی

---

(١) "صحيح مسلم": (٢٥٣٢).

پێغەمبەرایەتی خۆرێکی هەڵهێنا کە ترووسکایی ئەستێرەکانی شاردەوە، دەمێکی دوورودرێژیش پێشین لەو پایە و سایەدا ژیان و مانەوە، لەپاشان هەندێک لەڕۆشنایی پەیامبەرییەتی لاواز و کزبوویەوە، ئەوجا هەندێک لە پەرتووکی فەیلەسووفەکانی عەجەم کرایە عەرەبی، لەڕۆم و لە فارس و لە هیند، لە سەردەمی دەوڵەتی عەبباسیدا، لەپاشان لە دەوڵەتی مەئموونندا داوای ئەو پەرتووکانە کرا کە لە وڵاتی ڕۆمەوە بینێرن، ئەویش کرایە عەرەبی، خەڵکیش لێیان خوێند و خوێندەوە، جا ئیتر لەوەوە و لەوێوە ئەوەی هاتەڕوو لە بیدعە هاتەڕوو."(١)

هەندێکیش لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت ڕاشکاون و خۆیان لەوە لانادەن کە -بە نموونە- بڵێن چاخی عەبباسی مەئموون ئاست بەرزتر و باشترە لە چاخی ئەبووبەکر کە تێیدا لە ڕووداوی سەقیفە دەستگی کراوە بەسەر دەسەڵاتدا، ئەم بڕیارلێدانەش کە پێکدادانی لەگەڵ وەحیدا هەیە ڕەنگدانەوەی زێدەڕەویکردنە لە بەهای شارستانییەتی مەدەنیدا و بەکەمگرتنی ناوەڕۆکەکانی زانستە خوداییەکان، کە جەخت لەوە دەکاتەوە زێدەڕەوی مەدەنی سەرچاوەی لادانی کەلتوورییە، وەک پێشتر ئاماژەی پێ درا.

لامان گرنگە لێرەدا ئەوە وەبیربێنینەوە کە ئەو هاوکێشەیەی ئاماژەمان پێ کرد مەبەستمان لێی ئەوە نییە کە ئەوە ڕێسایەکی ڕەهای گەردوونییە، بەو واتایەی کە هەموو پێشکەوتنێکی مەدەنی پاشەکشەی شەرعی بەشوێنیدا بێت، بەڵکوو ئەوە تەنها ڕووداوێکی ڕاستەقینەی مێژووییە، کە ویستمان ماناکانی بخەینەڕوو، وانەی جەوهەریش تێیدا بە لای ئێمەوە ئەوەیە کە بەپێی وێناکردنی تایبەتی ئیسلامی ئێمە؛ باشییێتی وابەستەی کرۆکی باوەڕی و ڕەوشتی-ئیمانی و ئەخلاقییە، نەک سیما مەدەنی و ماددییەکان.

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٢/٨٤).

# ٦- خۆهەڵواسین بە دوو ئایەتی «ئاوەدانکردنەوە و بەجێنشینکرد»ندا

هەندێک لە پەڕگیرەکانی ڕێبازی مەدەنییەت کاتێک سەبارەت بە لەپێشینەبوونی شارستانییەت -بەپێناسە ماددییەکەی- وتووێژدەکەن، دوو ئایەت زۆر بەبەڵگە دێننەوە: کە بەتایبەت گرنگی بەو دووانە دەدەن، ئەوانیش: «ئایەتی ئاوەدانکردنەوە، و ئایەتی جێنشینکردن» ن، زۆر پشت بەم دوو ئایەتە دەبەستن لە بونیادنانی دیدگای خۆیاندا، جا ئایەتی ئاوەدانکردنەوە ئەوەیە کە پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَإِلَى ثَمودَ أَخاهُم صالِحًا قالَ يا قَومِ اعبُدُوا اللَّهَ ما لَكُم مِن إِلهٍ غَيرُهُ هُوَ أَنشَأَكُم مِنَ الأَرضِ وَاستَعمَرَكُم فيها﴾[1] «**بۆ سەموودیش صالحی** برایانمان نارد، گوتی ئەی گەلەکەم (اللّٰه) بپەرستن، هیچ پەرستراوێکی حەقتان جگە لە ئەو نییە ئەو بوو کە هێنانەدی ئێوەی لەسەرزەوی دەسپێکردۆ و کردوونی بە ئاوەدانکەرەوەی.» ئایەتی جێنشینکردنیش ئەوەیە کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذ قالَ رَبُّكَ لِلمَلائِكَةِ إِنّي جاعِلٌ فِي الأَرضِ خَليفَةً﴾ [البقرة: ٣٠] «یادی ئەوە بکەوە کە پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو من لەسەرزەویدا جێنشینێک دادەنێم.»

لەم دوو ئایەتەش ئەوە وەردەگرن کە خودا مرۆڤی کردووە بە ئاوەدانکەرەوەی دونیا، هەروەک کردوویەتی بە جێنشین تێیدا، ئەوەش مانای وایە کە ئاوەدانکردنەوەی ماددی بۆ دونیا و دامەزراندنی شارستانییەتی مەدەنی تێیدا مەبەستی شەریعەتە.

لەڕاستیدا گرفتی ئەم بەڵگەهێنانەوەیەش لە شاردنەوەی چەند زانیارییەکەوە

---

(١) [هود: ٦١]

هاتووە، لەوانە:

ئەوەی کە مانای ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار «کردوونی بە ئاوەدانکەرەوەی» ئەوەیە کە: کردوونی بە بنیاتنەر و ئاوەدانکەرەوە لە زەویدا، مانای ئاوەدانکردنەوەش لێرەدا لەسەر ئەو بنەمایە نەهاتووە کە داخوازییەکی شەرعی بێت، بەڵکوو ئەوپەڕی ئەوەی تێیدایە ئەوەیە وەک بەخششێکی گەردوونی هاتووە کە شایانی وەڵامدانەوەیە بە بەندایەتی و مل بۆکەچکردن، ئەوەش واتایەکی ڕوون و دیارە لە ئایەتەکەدا و حاڵیبوون لێی ماندووبونێکی زۆری ناوێت، کە لە چوارچێوەی منەتکردندا هاتووە نەک لە چوارچێوەی هاندان و داخوازیدا، کە پێغەمبەرەکەیان فەرمانی یەکتاپەرستیان پێ دەکات و ئەوەیان بەیاددێنێتەوە کە پەروەردگار ئەوانی لەم زەوییە دروستکردووە و ئاوەدانیشی کردووەتەوە پێیان، ئیدی ئەم واتایە لەکوێ و ئەوەی کە پەڕگیرانی ڕێبازی مەدەنییەت لە واتا و قاڵ و هۆسە لێیان خڕکردووەتەوە و لەسەری دایانمەزراندووە لەکوێ؟!

یەک لەو شتانەش کە لەمە دڵنیاماندەکاتەوە ئەوەیە کە ئەو فەرمایشتە «کردوونی بە ئاوەدانکەرەوەی» لە گەلی سەموودا هاتووە لە مەدائینی حیجر لەنێوان تەبووک و مەدینەدا کە لە بنچینەدا گەلی سەموود خۆیان کەمتەرخەمییان لە ئاوەدانکردنەوەی ماددیدا نەبوو، سەرباری ئەوەش پەروەردگار بە کارەساتێکی سامناک سزای دان کە لە قورئاندا بۆی گواستووینەتەوە.

با بڵێین بەوە قایلبین کە ئاوەدانکردنەوە لەم ئایەتەی پێشوودا بە واتای داخوازی هاتووە؛ ئەوا خۆ ئاوەدانکردنەوە لە قورئاندا دوو جۆرە: ئاوەدانکردنەوەیەکی ئیمانی و ئاوەدانکردنەوەیەکی ماددی. هەردووکیشیان داواکراون، بەڵام گەورەترین و بەرێزترینی دوو جۆرەکە کە ئەوەشیانە بەڕاشکاوی داواکراوە، ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوییە بە باوەڕ، هەروەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ

الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكاةَ وَلَم يَخشَ إِلَّا اللَّهَ فَعَسى أُولئِكَ أَن يَكونوا مِنَ المُهتَدينَ﴾ [التوبە: ١٨] «بەڕاستی تەنها ئەوانە مزگەوتەکانی خودا ئاوەداندەکەنەوە کە باوەڕیان بە (اللّٰه) و بەڕۆژی دوایی هێناوە و نوێژیان بەرپاکردۆ و زەکاتیان داوە و لە جگە خوداش ناترسن، جا نزیکە ئەوانە لە ڕێنومایيکراوان بن.»

ئەمەش شەرەفمەندترین پلەکانی ئاوەدانکردنەوەیە، کە ئەوانەی چاویان بە ڕۆشنایی پەیامبەرییەتییەکان ڕوون نەبووەتەوە لێی بێبەشن، وەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ما كانَ لِلمُشرِكينَ أَن يَعمُروا مَساجِدَ اللَّهِ شاهِدينَ عَلى أَنفُسِهِم بِالكُفرِ﴾ [التوبە: ١٧] «بۆ موشریکان-هاوەڵدانەران نییە کە مزگەوتەکانی خودا ئاوەدان بکەنەوە لەکاتێکدا ئەوان گەواهی کوفر و بێباوەڕییان لەسەرخۆیان داوە.»

جا هەرکەس سەرزەمینی بە ئیمان ئاوەدان نەکردبێتەوە، **هێشتا لە تاریکاییەکان و نزمبوونەوەدایە و بە ڕۆشنگەری ڕاستەقینە نەگەیشتووە.»**

دیسان لەوانەش کە ئەوە ڕووندەکاتەوە ئەوەیە کە ئاوەدانکردنەوە دژەکەی وێرانکارییە، پەروەردگاریش باسی لەوە فەرمووە کە نابووتترین جۆرەکانی وێرانکاری وێرانبوونی زەوییە بە نەمانی ئیمان، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَمَن أَظلَمُ مِمَّن مَنَعَ مَساجِدَ اللَّهِ أَن يُذكَرَ فيهَا اسمُهُ وَسَعى في خَرابِها﴾ [البقرة: ١١٤] «کێ لەوە ستەمکارترە کە ڕێگری لەوە بکات مزگەوتەکانی خودا ناوی خودای تێدا بهێنرێت و هەوڵ و کۆشش بۆ وێرانکردنی بدات.»

ئەوەی کە پەروەردگار نموونەی زۆر لە گەلانی بۆ هێناوینەتەوە کە لە ئاوەدانکردنەوەی ماددیدا داهێنەر بوون، لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگار لە ڕووی لۆمەکردن و سەرکۆنەکردنەوە چیرۆکیانی گێڕاوەتەوە، چونکە لە ئاوەدانکردنەوەی ئیمانیدا مایەپووچ بوون، هەروەک دەفەرمووێت: «ئەرێ بەسەر زەویدا نەگەڕاون جا بنوارن سەرەنجامی ئەوانەی پێش خۆیان چۆن بوو، لەمان بەهێزتر بوون و

زەوییان کێڵا و بووژاند و ئاوەدانکردەوە.»

ئەوەشی سەرنجی شارستانییەتی ئەمڕۆ بدات هەمان وێنە بە تەڕ و تازەیی دەبینێتەوە، کە بەهرەوەر و لێهاتوون لە ئاوەدانکردنەوەی ماددیدا و مایەپووچن لە ئاوەدانکردنەوەی ئیمانیدا.

ئەوەی کە ئەگەر واشی دانێین کە وشەی ئاوەدانکردنەوە لەم ئایەتەدا وەک هاندان بۆ مەدەنییەت و شارستانییەت هاتووە بە پێناسە ماددێکەی؛ ئەوا خۆ هەرەمی لەپێشینەکان و پەیژەی بەهاکان بەتەنها لە تاقە ئایەتێکی ڕاشکاوەوە وەرناگیرێت، بەڵکوو لە کۆی هەڵوێستەکانی شەریعەت و پوختەی هاوسەنگی دەقەکانەوە وەردەگیرێت، جا چۆن ئەگەر لە بنچینەوە مانای ئایەتەکە بۆخۆشی ئەگەری زۆر هەڵگرێت، لەبەرانبەریشیدا سەدان دەقی چەسپاوی ڕاشکاو هەبن کە جەخت لەسەر لەپێشینەیەتی باوەڕ و فەریزە و پاکیزەییەکان دەکەنەوە و ئەوەی کە ئەوە ڕۆشنایی ڕاستەقینە و ئاوەدانکردنەوەی شەرەفمەندانەیە و هەرچیش جگە لەوەیە لە دونیا تەنها ئامرازێکە و هیچیتر.

ئەوجا ئایەتی بەجێنشینکردن، کە زۆرێک لە پەڕگیرانی ڕێبازی مەدەنییەت ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار: «من لەسەر زەویدا جانشینێک دادەنێم» بە بەڵگە دێننەوە لەسەر چەمکی جێنشینبوونی مرۆڤ، جا هەمیشە ئاماژە بەوە دەکەن کە پەروەردگار ئادەمی کردووەتە جێنشینی خۆی لەسەرزەویدا، کە بەو واتایە دێت: مرۆڤ بریکاری خودایە لە ئاوەدانکردنەوەی زەویدا، کەسێکیش کە لە ماناکانی ئەم جێنشینێنبوونە وردبێتەوە لە چوارچێوەی گوتاری مەدەنیدا؛ دەبینێت کە ئەم ئایەتە لە دوو بواردا بەبەڵگە دێننەوە: یەکەمیان، لەپێشینەیەتی ئاوەدانکردنەوە. دووهەمیان، تەوەریێتی (سەنتەربوونی) مرۆڤ.

لە واقیعدا: ئەم بەڵگەهێنانەوەیە بەم ئایەتە، چەند زانیارییەکی گرنگ و جەوهەریی حەشارداوە کە وا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

ئەوەی ڕای بەهێزە لە ڕاڤەی مانای جێنشین لەم ئایەتەدا ئەوە نییە کە ئادەم جێنشینێکە لەبری خودا لەسەرزەویدا، بەڵکوو واتاکەی جێگرتنەوەی مرۆڤەکانە هەندێکیان بۆ ئەوانەی بەر لە خۆیان بەو واتایەی کە ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەستاودەستکردنی جێنشینی و بەمیرات وەرگرتنەوەی زەوی دەنوێنن لەناو خۆیاندا، زۆرێکیش لە زانایانی ئیسلام جەختیان لە هەڵبژاردنی ئەم ڕایە کردووەتەوە.

ئەو دۆخانەشی دەبنە بەڵگە بۆ بەهێزیی ئەم تێگەیشتنە، فرە و زۆرن کە هەر بە لێرامانی ڕێڕەوی هاتنی خودی ئایەتەکە ڕووندەبنەوە، هەروەها کۆکردنەوە و لەخۆگرتنی کۆی دەقەکانی شەریعەت و پوختکردنەوەی مەبەستیان لە چەمکی جێنشینییێتی مرۆڤەکاندا، لەو ڕوونکەرەوانەش ئەوەیە کە جێنشینییێتی و بریکارێیتی تەنها لە بری زاتێکی نائامادە دەبێت، پەروەردگاریش نائامادە نییە، بەڵکوو شاهێد و ئاگادار و چاودێرە (الشهيد الرقيب)، ئەوەش واتا و لێکەوتەی ڕاوێستاوییێتی و کاربەدەستییێتی ئەوە (القيومية)، سا جێنشینی نییە، یاخود بریکارێک کە لەبری ئەو بە کارەکانی هەستێت پاکوبێگەردی بۆ (اللّٰه)، پەروەردگاری حەق بۆخۆی ئاماژەی بەوە کردووە کە دەفەرمووێت: ﴿وَما تَكونُ فى شَأنٍ وَما تَتلو مِنهُ مِن قُرآنٍ وَلا تَعمَلونَ مِن عَمَلٍ إِلّا كُنّا عَلَيكُم شُهودًا إِذ تُفيضونَ فيهِ﴾ [يونس: ٦١] «هیچ کارێک ناکەن کە ئێمە لە وەختی دەستبرتاندا بۆی و سەرگەرمبوونتان پێی، بەسەرتانەوە شاهێد و ئامادە نەبین.» درێژەی ئایەتەکە.

هەروا دەفەرمووێت: ﴿ما يَكونُ مِن نَجوى ثَلاثَةٍ إِلّا هُوَ رابِعُهُم وَلا خَمسَةٍ إِلّا هُوَ سادِسُهُم وَلا أَدنى مِن ذٰلِكَ وَلا أَكثَرَ إِلّا هُوَ مَعَهُم أَينَ ما كانوا﴾ [المجادلة: ٧] «سیان ناچپێنن کە ئەو چوارەمیان نەبێت، یاخود پێنج کە ئەو شەشەمیان نەبێت، نە لەوە خوارتر و نە لەوەش زیاتر مەگەر ئەو هەر لەگەڵیانە لە هەر کوێیەک بن.»

هەر لەبەر ئەمە؛ پێغەمبەر (ﷺ) نزیکییێتی پەروەردگاری فێری هاوەڵانی دەکرد، هەروەها ئامادەگی و شاهێدبوون و ونبوونی و کاریگەری ئەوەش

لەسەر شێوازی پەرستش، هەروەک لە دوو سەحیحەکەدا لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە کە دەفەرموویّت: «ئەریٚ خەڵکەکە! لەسەرخۆتان؛ خۆ ئێوە هاوار لە کەڕیاخود نائامادەیەک ناکەن، ئەو خوایەی بانگی لێدەکەن نزیکترە لە هەریەکێکتانەوە لە ملی وشترەکەی.» (١)

هەربۆیە پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرموویّت:

"گونجاو نییە و ڕێی تێناچێت بەکارهێنانی جێنشین لەبری پەروەردگار ...، جێنشین (جێگر) لە هەلومەرجی نەبوونی جێگیراوەدا دەبێت، بە مردن یان دیارنەمان و ئامادەنەبوون، ناویشی لێنراوە جێنشین؛ چونکە جێگای ئەو کەسە دەگرێتەوە کە چووەتە غەزا، ئەویش لەجێی ئەو ڕاوەستاوە، گشت ئەم واتایانەش لەبارەی پەروەردگارەوە ئەستەمن و ڕێی تێناچێت، ئەوە دوورە لە زاتی بەرز و پاکی (اللّه)وە."(٢)

سا کاتێک کە پەروەردگار شاهێد و ئامادە و چاودێر بێت نەک نائامادە، ئەوجا نابێت جێنشین لەبری ئەو هەبێت؛ کە جێنشینی تەنها لەبری نائامادەیەک دەبێت کە زۆرێک لە دەقەکانیش واتای بەکارهێنانی جێنشینیان لەبری نائامادەیەک گەیاندووە، وەک ئەوەی پەروەردگار دەفەرموویّت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَارُونَ اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي﴾[الأعراف: ١٤٢] «مووسا بە هاڕوونی برای وت تۆ ببە جانشینم لەناو گەلەکەمدا.»

فەرمانی پێ کرد کە لە نائامادەیی ئەودا جێی بگرێتەوە، هەروەها ئەوەی کە دەفەرموویّت: ﴿سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ﴾ [الفتح: ١٥] «بەجێماوەکان پێتان دەڵێن ئەگەر دەرچوون بۆ وەرگرتنی دەستکەوتێک بهێڵن ئێمەش لەگەڵتاندا بێین.»

---

(١) "صحيح البخاري": (٢٩٩٢)، و "صحيح مسلم": (٢٧٠٤).

(٢) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٣٥/٤٥).

هەروا بوخاری و موسلیم لە سەحیحەکانیاندا لە فەرموودەی ئەبوو هورەیرەوە هێناویانە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «بەنی ئیسرائیل پێغەمبەران بەرێوەیان دەبردن، کە پێغەمبەرێک وەفاتی دەکرد یەکێکی دیکە دەبووە جێنشینی.»[١] جا ئەو پێغەمبەرەی کە دەبووە جانشینی ئەوەی پێش خۆی تەنها لە نەمان و ونبوونیدا ئەم دەهاتە جێی.

لە سەحیحی موسلیمیشدا لە فەرموودەی زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «هەرکەس غەزاکارێکی ڕێگای خودا پڕچەک و ئامادە بکات ئەوا خۆشی غەزای کردووە، هەرکەسێکیش جێنشینی غەزاکارێک بکات لە ماڵومناڵیدا بە چاکە لەپاش دەرچوونی ئەو، ئەویش هەر غەزای کردووە." [٢] جا فەرمووی کە هەستان بە کاروباری خێزانی موجاهیدان جێنشینییە چونکە موجاهیدەکە ئیدی دەڕوات و ئامادەیی نابێت.

سوننەت و دابی پێغەمبەریش (ﷺ) وابوو کە وەختێک لە مەدینە دەرچووبا، بۆ جیهاد یاخود حەج یاخود جگە لەوەش؛ یەکێکی دەکردە جێنشینی خۆی لەسەر مەدینە، وەک ئیبن ئوم مەکتوم و عەلی کوڕی ئەبوو تالیب و جگە لەوانیشی داناوە، ئەوەش بەهۆی ئامادەنەبوونییەوە، جا کە تەشریفی دەهاتەوە سیفەتی جێنشینی لە جێنشینەکەی وەردەگیرایەوە؛ بەهۆی نەمانی هۆکارەکەیەوە کە ئەویش نائامادەییە.

بگرە دەقە شەرعییەکان بەتەواوی پێچەوانەی ئەو واتا لاوازەیان چەسپاندووە، کە پەروەردگار جێنشینی مرۆڤە لە حاڵی دیارنەمانیدا، نەک ئەوەی مرۆڤ جێی پەروەردگاری بگرێتەوە، کە پێشەوا موسلیم لە فەرموودەی ئیبن عومەرەوە گێڕاوێتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر بچوایەتە سەفەر، دەیفەرموو: «پەروەردگارم

---

(١) "صحيح البخاري": (٣٤٥٥)، و "صحيح مسلم": (١٨٤٢).

(٢) "صحيح مسلم": (١٨٩٥).

ئەتۆ هاوەڵی لە سەفەردا، ئەتۆش جێنشینی لە ماڵومناڵ و لانەدا.»[١]

ئەم تێگەیشتنەش بۆ ئایەتەکە شوێنپێهەڵگرتنی سەرجەم ئایەتەکانی دیکە کە چەمکی جێنشینیان بەکارهێناوە؛ پاڵپشتی لێ دەکات؛ وەختێک قورئان کە فەرمایشتی پەروەردگارە هەندێکی ڕاڤەیە بۆ هەندێکی تری، زۆرجار ئەو مانایانەی لە شوێنێکی دیاریکراودا گشتی و نارِوون بن، لە شوێنێکی دیکەدا ماناگەلێکی ڕوونکەرەوە دەیخەنەڕوو، ئەم واتایەش کە بریتییە لەوەی کە ڕەگەزی مرۆڤەکان هەندێکیان دەبنە جێنشینی هەندێکی تریان، لە زۆر شوێنی پەرتووکەکەی پەروەردگاردا زۆر و بەربڵاو هەیە، لەوانە ئەوەی کە دەفەرموویێت: ﴿قالَ عَسى رَبُّكُم أَن يُهلِكَ عَدُوَّكُم وَيَستَخلِفَكُم فِي الأَرضِ فَيَنظُرَ كَيفَ تَعمَلونَ﴾ [الأعراف: ١٢٩] «مووسا وتی بەشکوو پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناوبدات و ئێوە بکاتە جانشین لە زەویدا ئەوجا بڕوانێت (بیخاتەدەر) چ کارێک دەکەن.»

جا ئەم جێنشینییە لەپاش فەوتانی ئەوانەی پێش خۆیانەوە هاتەجێ، هەر لەم وێنەیە دەفەرموویێت: ﴿فَكَذَّبوهُ فَنَجَّيناهُ وَمَن مَعَهُ فِي الفُلكِ وَجَعَلناهُم خَلائِفَ﴾ [یونس: ٧٣] «جا نووحیان بەدرۆخستەوە، جا ئێمەش ئەو و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ڕزگارمان کردن لە کەشتییەکەدا و کردیشمانن بە جانشین.»

بە ڕامانیش لە ئایەتەکانی جانشینێتی مرۆڤ دەبینیت کە ئاماژە بە واتای لەپاشیێتی و بەشوێنداهاتن دەدەن، بەجۆرێک کە ئەم جانشینێتییە لەپاش خەڵکانی پێشووەوە دەبێت، واتە ئاماژە بە دەستاودەستکردنی جێنشینی لەنێوان نەوەکانی ئادەمدا دەدات نەک جێنشینی لەبری خودا، جا هەندێک لە نموونەی ئەو ئایەتانە دێنینەوە کە ئاماژەیان بە چەمکی دەستاودەستکردنی جێنشینێتی و بەشوێنداهاتن تێیدا کردووە، لەوانە ئەوەی کە پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿ثُمَّ جَعَلناكُم خَلائِفَ فِي الأَرضِ﴾ [یونس: ١٤] «لەپاشان ئێوەمان کرد بە جانشین لە سەر زەویدا لەپاش ئەوان.»

---

(١) "صحيح مسلم": (١٣٤٢).

هەروا دەفەرمووێت: ﴿فَخَلَفَ مِن بَعدِهِم خَلفٌ﴾ [مريم: ٥٩] «جا جانشینێک لەپاشی وان بوونە جانشین.»

دیسان دەفەرمووێت: ﴿وَاذكُروا إِذ جَعَلَكُم خُلَفاءَ مِن بَعدِ قَومِ نوحٍ﴾ [الأعراف: ٦٩] «یادی ئەوە بکەنەوە کە لەپاش گەلی نووح ئێوەی کردە جانشین.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَاذكُروا إِذ جَعَلَكُم خُلَفاءَ مِن بَعدِ عادٍ﴾ [الأعراف: ٧٤] «یادی ئەوە بکەنەوە کە لەپاش عاد ئێوەی کردە جانشین.»

جا گشت ئەم ئایەتانە ئاماژەن بە مانای لەپاشییێتی کە ئەویش مانای بەشوێنداهاتن دەدات.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ الَّذي جَعَلَكُم خَلائِفَ الأَرضِ﴾ [الأنعام: ١٦٥] «ئەو بوو کە ئێوەی کردە جانشینانی زەوی.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَيَجعَلُكُم خُلَفاءَ الأَرضِ﴾ [النمل: ٦٢] «هەروەها دەتانکاتە جانشینانی زەوی.»

ئیدی ئەم شاهێدە ڕوونکەرەوانە لە وەحی، مانا ئەگەری و گشتییەکان دەخەنەڕوو لە نموونەی فەرمایشتی: «من لەسەر زەویدا جانشینێک دادەنێم»، کە مەبەست لێی دەستاودەستکردنی جێنشینی و بەشوێنداهاتنە تێیدا لەناو ڕەگەزی مرۆڤایەتی خۆیدا، نەک جێنشینییەتی لەبری (الله).

لەپاشان لەو شتانەی کە جەخت لەوە دەکاتەوە کە مانای جێنشین لێرەدا مەبەست لێی تەواوی ڕەگەزی مرۆڤەکانە، نەک تەنها خودی ئادەم سەلامی خوای لێ بێت، ئەوەی کە ئەگەر مەبەست ئادەم بووایە، ئەوکات ئەو قسەیەی فریشتەکان لەجێی خۆی نەدەبوو: ﴿قالوا أَتَجعَلُ فيها مَن يُفسِدُ فيها وَيَسفِكُ الدِّماءَ﴾ [البقرة: ٣٠] «وتیان ئەرێ خەڵکانێکی لێ دادەنێیت کە خراپەی تێدا بنێنەوە و خوێن بڕێژن؟»

لەکاتێکدا کە ئادەم سەلامی خوای لێ بێت خراپەکار نەبوو لەسەر زەویدا، خوێنیشی نەڕشت، کەواتە مەبەستیان ڕەگەزی مرۆڤەکانە.

لەڕاستیشدا: ئەوەی کە زۆر سەری لە زانایانی ئەم دواییەی ڕاڤەکاری قورئان تێکداوە لە تێگەیشتنی مانای (الخلیفة-جێنشیندا) ئەوەیە کە بە تاک هاتووە، لەکاتێکدا (الخلائف-جێنشینەکان) شێوازی کۆیە!

لە واقیعیشدا: لە زمانی عەرەبدا وشەی تاک زۆرجار دێت و مەبەست لێی کۆیە، پێشەوای نەحو «سیبەوەیھ» ئاماژەی بەوە کردووە، کە فەرموویەتی: "نکۆڵی لێ ناکرێت لە زمانی واندا کە وشە تاک بێت و مانای کۆ بدات." (١)، «سەعالیبی» دەفەرمووێت: "بەشێک لە دانانی تاک لە جێی کۆدا، کە یەک لە شێوازەکانی عەرەبە."(٢)

ئەوەش ڕێبازێکی شێوازی بەکارهاتووە کە قورئانیش لە زیاد لە شوێنێکدا هێناویەتی، دوا زانای ڕاڤەوان شێخی شەنقیطی ئاماژەی بە سروشتی ئەم شێوازە کردووە، کە لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێت: "ئەوەی لە بەدواداچوونی زمانی عەرەبییەوە کە قورئانی پێ دابەزیوە بۆم بەدیاردەکەوێت ئەوەیە کە یەک لە شێوازەکانی ئەوەیە کە تاک ئەگەر ناوی ڕەگەز (اسم جنس) بوو، ئەوا بەزۆری مەبەست لێی «کۆ»یە."(٣)

لە نموونەی ئەوەش ئەوەیە کە کاتێک پەروەردگار باس لە بەخششەکانی بەهەشت دەکات دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِى جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ﴾ [القمر: ٥٤] «بەڕاستی کە لەخواترسان لە باخات و ڕووباردان»، جا «ڕووبار»ی بە شێوازی ناوی تاک هێناوە، لەکاتێکدا مەبەست لێی کۆیە. خۆ ناگونجێت ئەم ئایەتە

---

(١) سيبويه، "الكتاب"، تحقيق: عبد، السلام هارون: (١/٢٠٩).

(٢) الثعالبي، "فقه اللغة"، مؤسسة الرسالة، (ص ٣٣٥).

(٣) الشنقيطي، "أضواء البيان، طبعة المجتمع: "٥/٣١" .

بە بەڵگە بهێنرێتەوە کە لە بەهەشتدا تەنها یەک ڕووبار هەیە کە پەروەردگار فەرمووشیەتی: ﴿فيها أَنهارٌ مِن ماءٍ غَيرِ آسِنٍ﴾ [محمد: ١٥] «تێیدایە چەندەها ڕووبار لە ئاوی نەگۆڕاوی تێکنەچوو.»

ئەوەی کە لە حاڵی داننانیشدا بەڕاستی ئەو بۆچوونە لاوازەدا کە هەندێک لە زانایانی ڕاڤەکاری ئەم دواییانە هەڵیانبژاردووە کە مانای جێنشین لێرەدا: جێنشینە لەبری پەروەردگار؛ هێشتا خۆ ئەو ڕاکارانەش کە مەیلیان بە لای ئەم ڕایە لاوازەوە بووە، نەیان وتووە کە ناوەڕۆکی ئەم جێنشینییە ئاوەدانکردنەوەی ماددی سەرزەوییە، بەڵکوو ناوەڕۆکی ئەم جێنشینییەیان بە بەرپاکردنی ئایینەکەی خودا داناوە، هەروەک بەنموونە بەغەوی دەفەرموویت: "ڕاست ئەوەیە کە مرۆڤ جێنشینی خودایە لە زەوی خودادا بۆ بەرپاکردنی حوکمی خودا و بەجێگەیاندنی بڕیارەکانی".[١]

جێنشینییەتیش لە بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی پەروەردگار و بەرپاکردنی حوکمەکانیدا. مانای ئەوەیە جێنشینی لێرەدا دیسان چوویەوە سەر ئاوەدانکردنەوەی ئیمانی، نەک ئاوەدانکردنەوەی ماددی، کەوایە هیچ شتێکی نوێ لەم واتایەدا نییە.

زۆر بەکورتیش؛ ئەگەرەکانی ماناگەیێنی لەم ئایەتەدا سیانن، با خوێنەر بمانبوورێت لە چوونە ناو هەندێک وردەکاری هونەری کە ناچاری بووین بەهۆی زۆر بەڵگەهێنانەوەی پەڕگیرانی ڕێبازی مەدەنییەت بەم ئایەتە، ئەو سێ ئەگەرە واتاییەش ئەمانەن:

یاخود (جێنشین - خليفة): لەسەر کێشی (فعيلة) بێت بە مانای (مفعول- بەرکار)، واتە: جێگیراوە کە نەوەکانی ئادەم هەندێکیان جێی هەندێکیان بگرنەوە و ببنە جێنشینی یەکدی کە تێگەیشتنی بەهێز بۆ ئایەتەکە ئەمەیانە.

---

(١) البغوي، "معالم التنزيل"، تحقيق: النمر وزملائه، دار طيبة: (١/٧٩).

یاخود (خلیفة): لەسەر کێشی (فعیلة) بێت بە مانای (فاعل)، واتە: جێگرەوە و جێنشینی ئەوانەی پێش خۆی، کە ئادەم جێی بوونەوەرانێکی بەر لە خۆی گرتبێتەوە لەسەر زەویدا، هەروەک کۆمەڵێک لە پێشین ئەمەیان وتووە.

یاخود (خلیفة): جێنشین بێت لەبری خودا و بریکاری بێت لە ڕاوێستاندنی حوکمی خودادا.

جا بەپێی هەرسێ ئەگەر بۆ ئایەتەکە، بە بەهێز و بە لاوازیەوە؛ هێشتا ئەوە هەڵناگرێت کە پەڕگیرانی ڕێبازی مەدەنییەت لە واتاکانی سەنتەربوونی ئاوەدانکردنەوەی ماددی و ئامانجبوونی شارستانییەتدا و ئەوەی کە ئەوە جەوهەری فرمانی مرۆڤە لێیان خڕکردووەتەوە و داویانە بە کۆڵیا.

لەبارەی بەڵگەهێنانەوەش بەم ئایەتە لەسەر ڕێزنان لە ڕەگەزی مرۆڤ بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە جێنشینی خودایە، بە چاوپۆشیکردن لە شووناسی ئایینی و بەندایەتی، ئەمەیان ئیدی ئەنجامگیرییەکی پێکدژە لەگەڵ زانیارییەکانی وەحیدا؛ چونکە جێنشینییەتی مرۆڤ -جا بە واتای جێگرتنەوەی مرۆڤەکان بۆ یەکتر، یاخود جێنشینیێتییان بۆ پەروەردگار- شەرەفمەندییەکی ڕەها نییە وەک ئەوەی پەڕگیرانی ڕێبازی مەدەنییەت تێیگەیشتوون، بەڵکوو ڕێز و بەرزییەکەی وابەستەیە بە بەجێگەیاندنی بەندایەتییەوە، خۆ ئەگەر مرۆڤ پشت لە وەحی بکات، ئەوکات شەرەفمەندی ئەم جێنشینییەتییەی لێ دەسەنرێتەوە. هەربۆیە پەروەردگار لەبارەی ڕۆڵی پشتکردن لە وەحی لە لێسەندنەوەی شەرەفی جێنشینێتیدا دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ فَمَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴾ [فاطر: ٣٩] «ئەو خودایەیە کە ئێوەی کردووەتە جانشین لەسەر زەویدا، جا هەرکەس بێباوەڕبێت، بێباوەڕێکەی لە ئەستۆی خۆیدایە، بێباوەڕانیش بێباوەڕییەکەیان لەلای پەروەردگار جگە لە بوغز و قین

هیچی دیان لێ زیاد ناکات، هەروەها بێباوەڕان بێباوەڕییەکەیان جگە لە دۆڕان و خەسارۆمەندی هیچی دیان لێ زیاد ناکات.»

هەروەها پەروەردگار شتێکی لە بەسەرهاتەکانی مێژوو باس فەرمووە، ئەوەشی کە چۆن شەرەفمەندی جێنشینی زەوی لەیەک لە گەلان دەسەندەوە وەختێک پشتیان لە وەحی و پەیامبەرییەتییەکان دەکرد و دەیخستە سەر شانی گەلێکی دیکەوە، هەروەک دەفەرموێت: ﴿وَلَقَد أَهلَكنَا القُرونَ مِن قَبلِكُم لَمّا ظَلَموا وَجاءَتهُم رُسُلُهُم بِالبَيِّناتِ وَما كانوا لِيُؤمِنوا كَذلِكَ نَجزِي القَومَ المُجرِمينَ(١٣) ثُمَّ جَعَلناكُم خَلائِفَ فِي الأَرضِ مِن بَعدِهِم لِنَنظُرَ كَيفَ تَعمَلونَ﴾ [یونس: ١٣ - ١٤] «بەڕاستی کە ئێمە چاخانێکمان پێش ئێوە فەوتاند و لەنێوبرد وەختێک کە ستەمیان کرد و پێغەمبەرانیان بە بەڵگەی ڕوون و ڕەوانەوە بۆ هات و ئیدی لەوەدا نەبوون کە باوەڕ بێنن، ئاوەها تۆڵە لە خەڵکانی تاوانبار دەستێنینەوە. لەپاشان ئێوەمان کردە جانشین لەسەرزەویدا لەپاش ئەوان تاکوو ببینین (دیاری بخەین) ئێوە چۆن کارێک دەکەن.»

جا ئەم ئایەتە جەوهەری فرمانی بەجێنشینکردنی دەرخستووە کە بریتییە لە تاقیکردنەوە بە باوەڕ و بە کردەوەی چاکە و شوێنکەوتنی پێغەمبەران لەپاش ئەوەی کە پەروەردگار ئەوەی لە گەلانی پێشوو سەندەوە بەهۆی پشتکردنیان لێی، ئەم واتایەش سەبارەت بە فرمانی بەجێنشینکردن چەند ئایەتی دیکەش بە هەمان شێوە ڕوونیان کردووەتەوە، هەروەک پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذي جَعَلَكُم خَلائِفَ الأَرضِ وَرَفَعَ بَعضَكُم فَوقَ بَعضٍ دَرَجاتٍ لِيَبلُوَكُم في ما آتاكُم﴾ [الأنعام: ١٦٥] «ئەوە ئەو خودایەیە کە ئێوەی کردووەتە جانشین لەسەر زەویدا، هەندێکتانی بەرزکردووەتەوە بەسەر هەندێکی دیکەدا تاکوو لەوەدا کە پێیداون تاقیتان بکاتەوە.»

هەربۆیە؛ ئەو ئوممەتەی کە بەندایەتی بەدیدەهێنێت ئەو ئوممەتەیە کە

مانای بەجێنشینکردن و جێنشینییەتی ئادەمیزادی هێناوەتەجێ، هەروەک پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُم وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَستَخلِفَنَّهُم فِي الأَرضِ كَمَا استَخلَفَ الَّذِينَ مِن قَبلِهِم وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُم دِينَهُمُ الَّذِي ارتَضَى لَهُم﴾ [النور: ٥٥] «پەروەردگار بەڵێنی داوە بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە لە ئێوە و کاری چاکەیان کردووە کە سوێند بێت لەسەرزەویدا دەیانکاتە جانشین هەروەک ئەوانەی پێش ئەوانی کردووەتە جانشین و ئەو ئایینەی -کە خۆی تەنها بەوە ڕازییە لێیان- بۆیانی دەچەسپێنێت و دەسەڵات پێ دەدات.»

جا ئەوەیە جێنشینییەتی شەرعی ئیمانی ستایشکراو لە هەموو ڕەهەندێکەوە، ئەوەشە کە بە باوەڕ و کاری چاکە و بەرچاو ڕوونبووەتەوە بەڕۆشنایی پەیامبەرییەتییەکان و کارپێکردنی ئایین و چەسپاندنی دەبێت، نەک بریتیبێت لە تەنها ئاوەدانکردنەوەی ماددی.

لە واقیعیشدا: بەڵگەهێنانەوە بە ئەم ئایەتە لەسەر ڕێزنان لە ڕەگەزی مرۆڤایەتی بە چاوپۆشی لە شووناسی ئایینی، دەستوەردان و چەواشەکارییەکی توند دەنوێنێت کە سڕینەوەی ناوەڕۆکەکانی دیکەی وەحی لێ دەکەوێتەوە کە ڕۆڵی شووناسی ئایینی بەدەردەخەن لە پێکهێنانی پێوەری هەڵسەنگاندن و پەیوەندییەکاندا، ئەم پرسەش بە وردی و دووروودرێژی لە بڕگەی مرۆڤاندنی پەیوەندییەکاندا دەخەینە بەرباس.

پوختەی بابەتیش: ئەم دوو ئایەتە -مەبەستم دووئایەتی ئاوەدانکردنەوە و بەجێنشینکردنە- بۆ زۆرینەی دروشمەکانی گوتاری زێدەڕەوی مەدەنی کراوەتە بەڵگە و بنچینە، زۆرێکیشیان هەوڵی ئەوە دەدات پەیوەندی و خۆدانەپاڵێک بە شەریعەتەوە بێنێتەکایەوە لەڕێی بەزۆر دەستکاریکردن و ماناگۆڕینیانەوە، کردنیان بە زەمینەیەک بۆ هێنانەدی ژینگەیەکی لەبار بۆ چەمکەکانی زێدەڕەوی مەدەنی، پێکەوەش قەبارەی زۆر لەخۆکاری و ڕێبەخۆدانی ستەمکارانە و

لادەرمان لە گۆڕینی واتای خودی دوو ئایەتەکەدا بۆ بەدیارکەوت، سەرەڕای پێکدادانی ئەو لێکدانەوە لادەرە لەگەڵ زانیارییەکانی دیکەی وەحیدا، زۆر بەڵگەهێنانەوەی شەرعی دیکەش هەن کە هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت دووبارەی دەکەنەوە کە لەشوێنی خۆی و لە بڕگەکانی داهاتوودا ئاماژە بەوانیش دەکەین و گفتوگۆیان لەسەر دەکرێت.

# ٧- ئیسلامییەکان دژ بە شارستانییەتن

لە ئەدەبیات و کلتووری پەڕگیرانی ڕێبازی مەدەنییەتدا زۆر ئەوە دەوترێتەوە کە بزووتنەوە ئیسلامییەکان عەدەمی-نەبوونی و ڕەتکەرەوەن لەدژی شارستانییەت و مەدەنییەت و نوێگەری، تەنها کۆمەڵێک تەوژمی شووناسیین نەک ڕابوونی، تەنها میکانیزمی ڕێگریکاری و بەرەنگارییان لە هەمبەر گۆڕانکاری لە هەمبانەدایە، کۆمەڵێک بزوتنەوەی جوداخوازیی گۆشەگیرن کە بانگەواز بۆ داخراوی و خۆداشاردن دەکەن، دژن بە سوود وەرگرتن لە دەستکەوتە مەدەنییە تازەکان، نموونەی ئەم قسانەش -کە زۆرڕاشکاوانە بڵێم- بەکاربەریان لە ڕۆژگاری ئێستادا زۆربووە و جۆرێک لە نابووتیشییان بەڕوخسارەوەیە.

ئەم قسەوباسە ڕۆژنامەوانییە بەکاربراوانەش لە دوو حاڵەت بەدەرنین: یان ئەوەی کە خاوەنەکەی ئاڕاستەی ئیسلامی بەباشی نەناسیوە و خوێندنەوەی بۆی نەبووە، تەنها ئەوەیە تازەیی و بەرباسی ئەو جۆرە دەربڕینانەی چووە بە دڵدا و ئیدی لە دەمی ئەوانی دیکەی وەرگرتووە و دەیڵێتەوە، لە کاتێکیشدا -شایانی باسە- کە ئەوانە دروشمگەلێکی کۆنن کە هزری عەرەبی ماوەی چەندەها دەیەیە وەک تووتی دەیڵێتەوە، بەڵام ناوخۆی خۆماڵیمان تازەبەتازە هاوردەی کردووە و پێی زانیوە.

یاخود ئەم قسەیە بە پاڵنەری ستراتیژییەتێکی مشتومڕکاریی هاتووەتە پێش کە تێیدا نووسەر هەوڵی چەواشەکاریکردن بەرانبەر هەڵوێستی ئیسلامی و هەڵاوساندن و ئاڵۆزکردنی و وێناکردنی بە شێوەیەکی نەرێنی دەدات؛ بە ئامانجی ئاسانکاری و ڕێخۆشکردن بۆ سووککردن و لەبەرچاوخستن و هەروا وەڵامدانەوەی، جا ئەوکات ئەم نووسەرە زۆرانبازی لەگەڵ کۆمەڵێک دێو و

درنجدا دەکات کە ڕاستەقینە نین و تەنها وێنەیەکن کە خۆی دروستی کردوون تاکوو وەڵامیان بداتەوە هەروەکوو ئاشی هەوایی.

زۆرجاریش کاتێک لە پاڵنەرەکانی ئەم قسەیە دەکۆڵیتەوە، دەبینیت نووسەر خەریکە برینێکی لەخوێنگەوزاوی هەڵوێست و گرفتێکی تایبەتی خۆی پێ تیماردەکات، کە هیچ پەیوەندییەکی بە لەبەرچاوگیرییە بابەتییەکانی دۆسیەکەوە نییە، تەنها ئەوەیە دیاردەی ئیسلامی لەم حاڵەتەدا مەرامێکی تۆڵە لێسەندنەوەیە و هیچیتر.

بەهەرحاڵ، هێڵە گشتییەکانی هەڵوێستی ئیسلامییەکان لەهەمبەر شارستانییەت و ڕۆشنخوازی بەگشتی و شارستانییەتی ڕۆژئاوایی بەتایبەتی، ڕوون و ڕۆشنە و لەکەس تێکنەچووە، ڕاستە لە هەندێک لە وردەکارییەکاندا بیروڕای جیاواز هەن، بەڵام هێڵە گشتییە مەنهەجییەکانی زۆرینەی ئیسلامییە هاوچەرخەکان هاوبەشن کە نزیکە بڵێین لە هیچ چاوێکی بەویژدانەوە تەماوی نین، ئەم هەڵوێستەش لە سێ توخم پێکدێت کە لە حەقیقەتیاندا بریتین لە جیاکردنەوەی ئەکادیمی و ڕێبازی بۆ ئاستەکانی خوێندنەوە و تێکەڵاوبوون و لێوەرگرتن، هەرکەسیش ئەم سێ جیاکەرەوە مەنهەجییە وەربگرێت و باش لێی تێبگات، ئەوکات باش لە هەڵوێستی هاوچەرخی ئیسلامیش دەگات لەهەمبەر شارستانییەت و ڕۆشنبیری بەگشتی و شارستانییەتی ڕۆژئاواییش بەتایبەتی، ئەم جیاکەروە مەنهەجییانەش بەم شێوازەن:

توخمی یەکەم: «جیاکاری لەنێوان شارستانییەت وەک ئامانج و شارستانییەت وەک ئامرازدا»

کە شارستانییەت لەلای پەڕگیرانی ڕیبازی مەدەنییەت داخوازییەکی ڕەهایە کە دەیانەوێت باهۆزی توندی هەرچۆنێک و بەهەر لایەکدا بێت هەڵکات بەبێ بوونی هیچ مەرجێکی سەپێنراو بەسەریدا لەژێر سایەی ئازادی تاکەکەسیدا

تا پلەی ونبوونی واتا و لێڵی و ناڕوونی ئامانج، بەڵام شارستانییەت لە وێنای شەرعیدا: شارستانییەتێکی ئاڕاستەکراوە بە ئامانجی بەدیهێنانی بەندایەتی بە هەرچی لەخۆیگرتووە لە سەرخستن و دەرخستنی ئایین و هەستان بە دروشم و شەریعەتەکان، جا لەوێدا شارستانییەتی ستایشکراو واتە شارستانییەتی ژێربارکراو بە کۆت و پێوەندە شەرعییەکان و ئامانجدار بە سەرخستنی ئیسلام و بەدیهێنانی بەها و ناوەڕۆکەکانی، تەنانەت تاک تاکی پرس و ئاست و بەشەکانی شارستانییەت بەهای ورد و ڕاستەقینەی خۆیان بەپێی بەجێهێنان و پەیوەندی هەبوونیان بەم ئامانجەوە وەردەگرن.

هەربۆیە؛ شەریعەت چەمکی شارستانییەت یاخود مەدەنییەتی بەکارنەهێناوە، بەڵکوو دووچەمکی: «هێز» و «زاڵی» و ئەو وێنانەی بەکارهێناوە، وەک پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَأَعِدّوا لَهُم مَا استَطَعتُم مِن قُوَّةٍ وَمِن رِباطِ الخَيلِ﴾ [الأنفال: ٦٠] «بۆیان ئامادەبکەن هەرچی پێتان دەکرێت و لەتواناتاندایە لە هێز و لە دابەستنی ئەسپ و سواری» هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویت: «بەڕاستی کە هێز هاوێشتنە.»(١)

هەروەها پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَأَنتُمُ الأَعلَونَ﴾ [آل عمران: ١٣٩] «ئێوەن بەرز و زاڵ» هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: «دەستی بەرزی سەرەوە باشترە لە دەستی نەوی ژێرەوە.»(٢)

هەروەها نموونەی دیکەی ئەم دەقانە، زانراویشە کە ئەو وزە خەیاڵپێکهێنەی لە ئاماژەکانی چەمکی شارستانییەت و مەدەنییەتدا هەیە وەک ئەو واتایانە نین کە چەمکی هێز دەینوێنێت کە هێز چەمکێکی خزمەتکار و پابەندی پڕەنسیپە، بەڵام شارستانییەت چەمکێکی ئاماژەکارە بە چێژ و خۆشگوزەرانی.

---

(١) "صحيح مسلم": (١٩١٧).

(٢) "صحيح البخاري": (١٤٢٧)، و "صحيح مسلم": (١٠٣٣).

مەبەستیش لەوە: ئەوەیە کە شارستانییەت و مەدەنییەت لەلای ئیسلامییەکان داخوازییە، بەڵام داخوازی سەرەکی نییە، یاخود داخوازی جەوهەریی لەم ژیانەدا، بەڵکوو تەنها ئامرازە بۆ بەدیهێنانی ئامانجی ڕاستەقینە کە بەندایەتییە.

توخمی دووەم: «جیاکاری لەنێوان ڕەهەندی زانستی، فەلسەفی، وسیاسیدا»

زێدەڕەوانی مەدەنییەت بانگەواز دەکەن بۆ بەپیرەوەچوونی شەیدایانە و لەئامێزگرتنی دەستکەوتی ڕۆژئاوایی بە سەرجەم شێوەکانییەوە چۆن بڵێی پێدراوێکی یەکپارچەی بێجیاوازییە، نارەحەتیش دەبن بە پشکنین و توێکاری پێداگرانە و ورد، بە جۆرێک کە بە خۆدوورگرتن و عەدەمیبوون و ڕەتکردنەوەی ڕۆشنخوازی لەقەڵەمی دەدەن. هەربۆیە؛ بەشێوەیەکی کرداری بانگەوازی بۆ چاوپۆشیکردن لە کەلێنەکان دەکەن یاخود بەهانە و پاکانەی بۆ وەڕێدەخەن، بیروڕای نەشاز و ناماقووڵ و تەرەی ناو کەلەپووری بۆ دەبیننەوە تاکوو پاڵی لەسەر بداتەوە، بەڵام ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی ڕوون جیاکاری لەنێوان سێ ڕەهەندە سەرەکییەکەی شارستانییەتی ڕۆژئاواییدا دەکەن، جا هەڵسەنگاندن و پێداگری و وردەکاریان لە پشکنیندا بەوپێیە بەڕێوەدەچێت.

جا ڕەهەندی یەکەم: ڕەهەندی زانستی پەتییە بە هەرچی بەرهەمی ئەزموونی و زانستی سروشتی و پیشەسازی و تەکنۆلۆژیا و سیستمەکانی پەیوەندی و کۆمپیوتەری و نموونەی ئەوانەوە هەیە لەو بەرهەمانەی کە لایەنی کەرەستەیی و ئامرازییتی پەتییان بەسەردا زاڵە، بەجۆرێک کە هەر کەلتوورێک دەتوانێت بەپێی بەهاکانی خۆی ئاڕاستەیان بکات. جا ئەمەیان توانست و داناییەکی هاوبەشە، کە دروستی و پێکانی هزری ڕۆژاوایی تێیدا زیاترە هەتا لادان و گومڕابوونی.

بەڵکوو لەمڕۆدا کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی بەتەنها خۆی نییە لەو مەیدانەدا، کە

میللەتانی دیکەش بەشدارییان لەم بەرهەمهێنانە تەکنیکیانەدا هەیە ئەگەر لەپێشتریش نەبن تێیدا، بەتایبەت ژاپۆن و چین و هیندستان، هەروەها دیاردەی (outsourcing)پێدانی مافی خستنەسەرکار لە گرنگترین دیاردەکانە کە هەنگاوهەڵێنانەکانی خەستبوونەوەی لە ئەزموونی تەکنیکی جیهانیدا وەدەرخست، بەجۆرێک کە پەیماننامەکانی پیشەسازی دەرەکی لە ناوچەکانی کارکردنی هەرزاندا، چەندین جەمسەری نوێی ئەزموونی تەکنۆلۆژی لە دەرەوەی پێتەختە ڕۆژئاواییەکاندا دێنێتەکایەوە.

هۆکاری زاڵبوون و زۆریی دروستی و پێکان لەم لایەنەدا ئەوەیە کە ئەو بەرهەمانە لە ڕێسا گەردوونییەکانەوە وەرگیراون کە پەروەردگار لە سروشتدا دایناون، واتە بەشێکی هاوبەشن کە بەهۆی زەمینەی ئایینییەوە جیاوازییەکی ئەوتۆیان تێدا دروست نابێت.

لە واقیعیشدا: ئیسلامییەکان بە سەرجەم گرۆکانیانەوە پێش غەیری خۆیان لە توێژە ڕۆشنبیرەکانی دیکە کەوتوون لە سوود لێوەرگرتنی، بگرە زۆرێک لە سەلەفییەکان لەسەر ئەوەیان نووسیوە کە حەقیقەتەکانی ناو زانستە سروشتییەکان حەقیقەتگەلێکی شەرعیشن، بەڵکوو زانستێک لە زانستە هاوچەرخەکانی سەر ڕووی زەوی لەمڕۆدا نابینیتەوە کە هاوەڵانی لە ڕووی پڕۆگرامییەوە هێندەی زانستە شەرعییەکان خزمەتیان کردبێت.

هەروەها وێنەی لاوە ئاییندارەکان لەناو کۆلێژەکانی پزیشکی و ئەندازیاری و کۆمپیوتەر و هاوشێوەکانیاندا نەک تەنها وێنەیەکی ئاساییە، بەڵکوو وێنەیەکی شێوازگەریی چەسپاوە لەناو هۆشیاری میللیدا، تەنانەت موحەممەد ئەرەکۆنی فرانکفۆنی توندڕەو، لە چەندەها شوێن لەناو توێژینەوەکانیدا ئاماژەی بەوە کردووە، هەروەک دەڵێت: "ئێمە دەزانین کە زۆرێک لە قوتابیانی کۆلێژە زانستی

و تەکنیکییەکان سەر بە جووڵانەوە سەلەفییە ئوسوولییەکانن."[١]، دیسان ئەرەکۆن لە کتێبێکی دیکەدا دەڵێت:

"تێبینی ئەوە دەدەین کە زۆرێک لە توێژەرانی زانستە فیزیایی و بیرکاری و پزیشکی و هاوشێوەکانیان دەخزێنە ناو ڕیزەکانی ئەم تەوژمانەوە، -واتە: تەوژمە ئیسلامییەکان- زۆر زیاتر لە پسپۆڕانی زانستەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگا، لەمیانەی ئەو ململانێ و ئاڵۆزییانەش کە لە زانکۆکانی تونس و جەزائیر و قاهیرە کەوتنەوە و ... هتد، زانیومانە کە کەسانی وشک و دەمارگیر بەشێوەیەکی تایبەت سەر بە کۆلێژەکانی زانستەکانن، بەڕاستی کە دیاردەیەکی شایانی وردبوونەوە و بەدواداچوونە."[٢]

ئەمە لەپاڵ دیاردەی بەپیرەوەهاتنی ئیسلامی بۆ خولەکانی ڕاهێنانی خۆبەڕێوەبەری و زانستی سەرکەوتن و جگە لەوانەشدا، سا نازانم واتای چییە موزایەدەکردن و خۆهەڵکێشان بەسەر ئیسلامییەکانەوە و وتنی ئەوەی کە ئەوان دژ بەڕۆشنخوازی و سوودبینینن لە دەستکەوتەکان؟

ئەوجا ڕەهەندی دووەم: ڕەهەندی فەلسەفی شارستانییەتی ڕۆژئاواییە بەوەی لەخۆیدەگرێت لە پرسیارە ئەنتۆلۆژی (وجودی - بوونی)یەکان و ئەبستمۆلۆژی (مەعریفییەکان) و ئەکسیۆلۆژی (بەهاییەکان)، ئەوەشی لەدوای ئەوانەوە دێت لە بازنە گەورەکانی فەلسەفە، لە وێنەی حەقیقەتی ژیان و چەمکی بەختەوەری و حەقیقەتی مرۆڤ و ڕۆڵ و سنوورەکانی و داهاتووی مرۆڤایەتی لەپاش نەمانی و جیهانی سەرەوە و سەرچاوەیەتی ڕەوشت و ڕەهایی و ڕێژەیی بوون، هەروەها سەرچاوەکانی مەعریفەت-زانین کە بنیادی ژێرخانی فەلسەفەیە و نموونەی ئەوانە.

---

(١) أركون، "الفكر الإسلامي: قراءة علمية"، مركز الإنماء القومي، الطبعة الثانية، (١٩٩٦م)، (ص ١٨١).

(٢) أركون، "تاريخية الفكر العربي الإسلامي"، مركز الإنماء القومي، الطبعة الثالثة، (١٩٩٨م)، (ص ٢٦).

جا ئەم ڕەهەندەیان گومڕایی هزری ڕۆژئاوایی تێیدا زیاترە لە دروستی و پێکانی، بەتایبەت لە پرسە گەورەکاندا، وردەکاری و بەشە گچکەکانیشی لەوانەیە هەندێکی هاوبەش بێت و هەندێکیشی لەگەڵ وەحیدا دژبەرێتی هەبێت.

بەڵکوو خوێنەری موسڵمان نزیکە کە هیچ ئەنجامگەلێکی سەلمێنراوی تێدا نەبینێتەوە کە دڵی پێ خۆشبێت و وەک پەیامێکی کۆمەڵایەتی هەڵی بگرێت، بەڵکوو هەر فەیلەسووفێک ئەوەی کە فەیلەسووفی پێش خۆی وتوویەتی هەڵی دەوەشێنێتەوە، ئامانجی خوێنەریش لەم بابەتانەدا ئەوە نییە کە وێنا و بیروباوەڕی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست بنیادبنێت و ئیدی شتێک بۆ خۆی زیادبکات، بەڵکوو وێستگەی دوایی ئەوەیە کە نەرمییەکی زەینی و ڕاهاتنێک لەسەر گوتوبێژ و وەڵامدانەوە و هەڵوەشاندنەوەدا پەیدا بکات، لەبەرانبەریشیدا پاکیزەیی یەکلایی و یەقین-دڵنیایی لەدەست بدات کە لە گرنگترین هۆکارەکانی پێشەوایێتییە لە ئاییندا، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلنا مِنهُم أَئِمَّةً يَهدونَ بِأَمرِنا لَمّا صَبَروا وَكانوا بِآياتِنا يوقِنونَ﴾ [السجده: ٢٤] «لەوان پێشەوایانێکمان گێڕا کە بە فەرمانی ئێمە ڕێنومایی بکەن وەختێک کە ئارامیان گرت و سەبارەت بە ئایەتەکانی ئێمە یەقین-دڵنیاییان هەبوو.

ئیدی خوێنەر پڕدەبێت لە گومان و ڕاڕایی و سەرگەردانی و نەبڕاندنەوە لە گشت شتێکدا، تاوەکوو دەگاتە قۆناغێکی عەدەمی-نەبوونگەرایی کە تێیدا ناتوانێت دانی یەکلایی بە هیچ یەکێک لە پێدراوەکانی شەریعەتدا بنێت، ئەوەش دیاردەیەکی بینراوە، خۆ گومان و دوودڵی و لێهەڵەبوونیش لە بنچینە گەورەکاندا لە بەشەکانی نیفاقن، پەنا بە (الله)، هەروەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿إِنَّما يَستَأذِنُكَ الَّذينَ لا يُؤمِنونَ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ وَارتابَت قُلوبُهُم فَهُم فى رَيبِهِم يَتَرَدَّدونَ﴾ [التوبة: ٤٥] «دڵەکانیان ڕاڕابووە جا هەر لەناو گومانی خۆیاندا دێن و دەچن و سەریان لێ شێواوە.»

هەربۆیە؛ زۆرینەی زێدەڕەوانی مەدەنییەت دەبینیت کە نزیکی ئەم توێژینەوە فەلسەفیانە کەوتوونەتەوە هەر ئەوە دەڵێنەوە کە "گرنگ خستنەڕووی پرسیارەکانە نەک وەڵامەکان"، یاخود ئەوەی کە: "بەرەو نمایشکردنی پرسیاری زیاتر"، نموونەی ئەم دەربڕینانەش کە وەک هۆشبەرێک خۆیانی پێ دڵدەدەنەوە لە نەگەیشتن بە ئەنجامەکان، هەتا ئەوەی کە لەلای مێژوونووسانی فەلسەفە ئەو قسەیە زۆر بەربڵاوە کە: "فەلسەفە پرسیار پێشکەش دەکات زیاتر لە پێشکەشکردنی وەڵام"، ئەم حاڵەتەش لە بەمەزنبینینی هاوێشتنی پرسیارە گوماناوییەکان و بەسووکڕوانین لە وەڵامەکان؛ حاڵەتێکی دێرینە کە لە ڕۆحی فەلسەفی گومانەوە دزەی کردووە، هەتا ئەوەی کە پێشەوا ئیبن تەیمییە لە ڕەخنەگرتن لە هەمان بیرۆکەوە دەفەرمووێت:

"پلەوپایەی یەکێکیان تەنها لە توانستی پەڵپ و تانە و نیقاشدا خۆی دەبینێتەوە، زانراویشە کە پەڵپ و تانە نە زانستن، نە سوودیشیان هەیە، باشترین حاڵی خاوەنەکەشی ئەوەیە کە بڵێین لە ئاستی عەوامێکدایە، چونکە زانست لە وەڵامدانەوەی پرسیاردایە".[١]

هۆکاری ئەوەش ئەوەیە کە: پێکهاتە سەرەکییەکانی ناو ئەم بازنانە: یاخود لائیکی پەتین[٢] -کە زۆرینەیە-، یاخود کیتابی (تەوراتی و ئینجیلی)

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٤/٢٧).

(٢) لائیکییەت بەعەرەبیکردنێکی ڕاستەوخۆی وشەی(Laïité)ە، کە لە سەدەی نۆزدەدا بەم واتایە لەقاڵبدراوە، بنچینەی داتاشینیشی: وشەیەکی ئیغریقییە بە واتای خەڵک یاخود گەل، لەپاشان لە چوارچێوەی ململانێی نێوان دین و دەوڵەتدا و لە بواری هزری ئەورووپیدا گەشەی سەندووە؛ هەتا ئەوەی کە بوو بە ئاماژەی عەلمانییەتێکی پێداگر و توندڕەو، زۆرجاریش وشەکە بەکاردێت بۆ دەربڕین لە عەلمانییەتی دوژمنکار بەرانبەر بە ئایین، نەک عەلمانییەتی بێلایەن. هەربۆیە؛ لە ڕووی مێژووییەوە بەستراوە بە عەلمانییەتی فەڕەنسییەوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە فەڕەنسا نوێنەری نموونەیی ئەم هەڵوێستە زبرەیە لەهەمبەر ئاییندا. توێژەر «کارۆلاین فۆرد» کە پرۆفیسۆری مێژووە لە زانکۆی کالیفۆرنیا دەڵێت: "دەستەواژەی لائیکییەت سەرەتا لە ساڵی (١٨٤٢ز)دا بەدەرکەوت، وەک وەسفکاری ئەو

دەستکاریکراون -کە کەمینەیە، بەڵکوو دەگمەنە-

سەرەڕای ئەوەی کە ئەوانەیان شتێکیان لە پەیامە ئاسمانییە دەستکاریکراوەکان بۆ مابێتەوە و پێ بڕابێت باشترن لەوانەیان کە لەسەر لائیکیەتێکی پەتین؛ چونکە پیت و فەڕی پاشماوەی پەیامبەرییەتییەکان و ئەو ڕۆشناییەی تێیاندایە لە کوێرێتی تەواوی بێ تروسکایی باشترە، جا ئەوەی کە دەستی بە مەسیحییەتی گۆڕاوەوە گرتبێت لە تەرازووی خودادا بەرز و بەڕێزترە لە بێباوەری پەتی، کە دەقەکانی وەحی سەبارەت بە باشتر دانانی شوێنکەوتووانی پەیامە ئاسمانییە «شێوێنراوەکان» بە بەراورد بە دەهری و مولحیدەکان زۆرن، ئەوەش لە فەڕ و پیرۆزی پاشماوەی ئەو پەیامە ئاسمانییانەیە کە هێشتا لە دەستیاندایە، جا شوێنکەوتەی پەیامە ئاسمانییە شێوێنراوەکان لە ئاگرپەرەست باشترە، ئاگرپەرەستیش لە مولحید باشترە، چونکە ئاگرپەرەست بەلای کەمەوە بڕێ شتی پەیامە ئاسمانییەکانی لایە، بەڵام مولحید هیچ شتێکی پەیامە ئاسمانییەکانی پێ نییە، هەربۆیە پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "گومڕاترینی تاقم و گرۆکان لە وێنەی نەفامەکانی گاور و سامرییەکانی جوولەکە، زاناترن لە فەیلەسووفەکان، ڕێنومایيکراوتر و پێچەسپاوتریشن، مەیلیشیان بەلای حەقدا زیاترە."[1]

---

قوتابخانەیەی کە مەیلی بەو لایەدایە بەرگێکی نائایینی بەبەر دامەزراوەکاندا بکات، بەپێی فەرهەنگی «ئیمێل لیتری»ش -کە فەرهەنگێکی فەرەنسی بەناوبانگە- دەستەواژەی لائیکییەت سەرەتا لە ساڵی (١٨٧١ز)دا لەقاڵبدراوە، لەمیانەی ئەو چەلەحانێیانەی کە سەبارەت بە لەکارلادانی فەرمانبەرە ئایینییەکان و ڕێنماییە ئایینییەکانەوە لە قوتابخانە سەرەتاییەکان بەڕێوەچوون". بڕوانە:

Ford,DividedHouses:Religion And Gender In Modern France,Cornell University Press,2005, p. 6.

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٩/٢٧).

هەروەها دەفەرمووێت:

"هەربۆیە «ئەنجام و وێنەی» کۆتایی فەیلەسووفەکان -ئەگەر پەروەردگار هەندێک ڕێنومایییان بدات- سەرەتای جوولەکە و گاورە بێباوەڕەکانە، چجای موسڵمانانی -ئوممەتی موحەممەد (ﷺ)- ؛ چونکە ئەوەی کە لەلای جوولەکە و گاوری بێباوەڕە لەپاش نەسخ-هەڵگیران و دەستکاریکردنیش -لەو بابەتانەی کە لە جۆری تەواوکاری نەفسن- باشترە لە جۆر و بڕ و چۆنێتیشدا لەوەی کە لەلای فەیلەسووفەکانە."[١]

پێشەوا ئیبن تەیمییە ئەم بەراوردکاری و هەڵسەنگاندنەی لە بابەتە سەلمێنراوەکانی ناو ئیسلام هەژمارکردووە هەروەک دەفەرمووێت: "زانراویشە لە ئایینی ئیسلامدا کە جوولەکە و گاور باشترن لە فەیلەسووفەکان؛ کە لە هەرچی ئایین و بەرنامەیە دەرچوون."[٢]

شایانی ئاماژە بۆکردنیشە کە ئەسڵەن ئەم ڕووە فەلسەفییە بریتی نییە لە ڕووە پێشکەوتووەکەی ناو شارستانییەتی ڕۆژئاوایی، بەڵکوو ڕووە دواکەوتووە نزمەکەیەتی، سەرەڕای هەوڵی زۆری زێدەڕەوانی مەدەنییەت بۆ وانیشاندان کە پێشکەوتنی ڕۆژئاوا ڕەنگدانەوەی فەلسەفەکەیەتی، ئەوەش تەنها ئاواتێکی مێژووییە.

لە واقیعدا: پێشکەوتنی مەدەنی ڕۆژئاوایی ئەمڕۆ؛ بۆ شۆڕشی پیشەسازی قۆناغی پێشوو دەگەڕێتەوە، لەپاشان شۆڕشی تەکنۆلۆژی و هەروەها سیستمەکانی پەیوەندی و زانیاری ئێستا، هەموو ئەوەش بەرهەمی ئارەقی ناوچاوانی کارگەکان و پشتیوانییە سیاسییە زەبەلاحەکانە بۆ ناوەندەکانی توێژینەوە و هونەری کارگێڕی دامەزراوەیی، ئامانجی فەلسەفەش بریتییە لە

---

(١) ابن تيمية، "الرد على المنطقيين"، تحقيق: الكتبي، مؤسسة الريان، (ص ١٧٤).

(٢) ابن تيمية، "درء تعارض العقل والنقل"، تحقيق: محمد رشاد سالم: (٩/٢٠٧).

سەرلەنوێ ڕاڤەکردنەوەی ئەوەی کە ڕوویداوە کە -هەمیشە- لێکدانەوەیەکی پاشکۆیە بۆڕووداوەکان کە هەوڵی هۆپێدان و واتادارکردنیان دەدات لەپاش ڕوودانیان، کەواتە لە باشترین حاڵەتیدا دانای پاش ڕووداوەکان بێت.(١)

هەر ئەوەش هۆکاری پاشەکشەکردنیەتی لە مەیدانی گرینگییەتی مەعریفیدا. هەربۆیە؛ پێشەوا ئیبن تەیمییە هۆشیاری ئەوەی دەدا کە ئەوە فەلسەفە نییە کە کۆمەڵگا سەرکەوتووەکان بەڕێوەدەبات، یەک لەو جارانە بەسەرسوڕمانەوە دەفەرمووێت: "بۆچی مەگەر فەیلەسووفێکت دیوە توانیبێتی بەڕژەوەندی لادێیەک لە لادێکان ببات بەڕێوە، چ جای شارێک لە شارەکان."(٢)

بەڵکوو لە هۆکارەکانی پاشەکشەکردنی گرینگییە مەعریفییەکەی؛ توانا نەشکانیەتی بەسەر هێنانەکایەی یاساگەلێکی ڕەها کە زانستیبوونی بۆ بەدیبێنن. هەربۆیە؛ فەلسەفە لە دێرزەمانەوە گرێیەکی خۆبەکەمبینینی لەهەمبەر زانستە سروشتییەکاندا(٣) هەبووە کە ئەوان ڕێز و پێگەی مەعریفی خۆیان هەیە بەهۆی

---

(١) لە کوردیدا ئیدیۆمی هاوشێوە و نزیک لەوە هەیە کە دەڵێن:«قاڵی دوای گورگ» یاخود وتوویانە «لەدوای باران فەرەنجیم بۆچییە؟!» بە واتای وەڕێخستنی بەزم و هەرایەکی بێسوودی دواکەوتوو لەمەڕ ڕووداو و پرس و فرسەتەکان. [وەرگێڕ]

(٢) ابن تیمیة، "درء تعارض العقل والنقل"، مصدر سابق: (٥/٦٥).

(٣) بە هەڵسەنگاندنی خۆم: لە گرنگترین ئەو تێزانەی کە هەوڵی توێژینەوەیان لە داڕووخانی فەلسەفە و وتوویژکردن لەسەر بەڵگەی نەیارانی داوە، ئەو کارتەی برنارد ویلیامزی فەیلەسووفی ئینگلیزییە (ک:٢٠٠٣ز)، بە ناونیشانی: «سەبارەت بە ڕقلێبوونەوە و بێبایەخ ڕوانین لە فەلسەفە» کە لە گۆڤاری «لەندەن ریڤیو»دا بڵاوکرایەوە، ویلیامز بەم وشانە دەست پێدەکات: "لە هەر کوێ بابەتێکی فەلسەفی ببینرێتەوە، خەڵکێکیش دەبینرێنەوە کە ڕقیان لێیەتی و بەسووک سەیری دەکەن" ئەو تۆمارکردنە سەرنجڕاکێشەش کە «ویلیامز» نمایشی کردووە، ئەو وتەیەتی کە لەمیانەی وتارەکەیدا دەڵێت "لەمڕۆژانەدا، زۆرینەی ئەوانەی کە ئەم هەڵوێستەیان بەرانبەر بە فەلسەفە هەیە ئاییندارەکان نین، بەڵکوو زاناکانن!" بڕوانە گوتارەکەی:B. williams, On hating and Despising philosophy, LRB, p.١٦.

دیسان خوێنەر دەتوانێت دادگاییکردنێکی پێداگر و نوکتەئامێزی زانای فیزیایی و گەردووناسی ئینگلیزی بەناوبانگ «جێمس جێنز»(ک: ١٩٤٦ز) بخوێنێتەوە لە پەرتووکەکەیدا:

ئەو ڕێسا زانستییە ڕێکخراوانەوە کە لەخۆیانگرتووە.

هەربۆیە؛ لەم ماوانەی کۆتاییدا هات و هاواری ڕۆژئاواییەکان بە ڕاگەیاندنی مەرگ و نەمانی فەلسەفە گەلێک بەرز و زۆر ببوونەوە، هاوکات ئەستێرەی زانستە کۆمەڵایەتییە ئیمبیریقییە سەلمێنراوەکان گەشایەوە.

هۆکاری ئەو وەهمەی بەمەزنبینینی فەلسەفەش: ئەوەیە کە زۆرێک لە ڕۆشنبیرانی زێدەڕەوانی مەدەنییەت کاریگەربوون بە نووسراوە فێرکارییەکان سەبارەت بە چیرۆکی فەلسەفە، ئەو نووسراوانەی کە مێژووی مرۆڤایەتی وەک بەرهەمێکی ڕاستەوخۆی هزری دە پانزە فەیلەسووفێک وێنادەکەن، چۆن بڵێی مێژووی مرۆڤایەتی بەگشتی و مێژووی ئەورووپی بەتایبەتی، گالیسکەیەکە و لەناو کابینەکەیدا چەند فەیلەسووفێک چوارمشقی دانیشتوون و جێییەکدی دەگرنەوە و فەرمان بە کۆمەڵگاکان دەکەن بە لای ڕاست یان چەپدا بڕۆن!

کە لە واقیعدا: پەرتووکە فەلسەفییە بەمۆرک فێرکارییەکان دەستیان زۆر وەرداوەتە ناو بیرکردنەوەی زێدەڕەوانی مەدەنییەتەوە، ئەم وێنە کێشراوەی ناو مێشکیان وەهمێکی پێکەنیناوییە کە ڕۆڵی فاکتەرە ڕاستەقینەکانی مێژوو لە خولّقاندنی ڕابردوو و ئێستاشدا دەشارێتەوە، لە وێنەی ڕۆڵی سەرکردە سیاسییەکان و پسپۆڕان و کارە ئەدەبییە مەزنەکان و سۆزدارییە میللییەکان، سەرەڕای ڕۆڵی ڕاگەیاندنی نوێ و سیستەمەکانی پەیوەندی هاوسەنگییەکانی هێز و کارگە فرەڕەگەزنامەکان و سەرچاوە گۆڕاوەکان و جگە لەوانەش.

بەڵکوو ئەم تێڕوانینە قوتابخانەییە ساویلکەیە کە زێدەڕەوە لە وێناکردنی کاریگەریی فەلسەفەدا؛ ڕۆڵی پەیامبەرییەتییەکانی لە پێکهێنانی مێژوودا بزرکردووە، ڕۆڵی ئایینیش لە دارشتنی مێژوودا، گەورە مێژوونووسانی ڕۆژئاوایی درکیان پێکردووە، لەوانە مێژوونووسی ئینگلیزی ناسراو «ئارنۆڵد تۆینبی»(ک:

"الفيزياء والفلسفة"، :ترجمة: جعفر رجب، دار المعارف.

١٩٧٥ز)، کە پسپۆڕە لە «مێژووی شارستانییەتەکان»دا، کە تۆینبی دەڵێت: «بیروباوەڕی ئایینی بەشێکە لە سیستمی هێنانەدی شارستانی»، سەبارەت بە مێژووی ئینگلیزیش کە ئەو لە غەیری خۆی شارەزاترە پێی، «تۆینبی» دەڵێت: "چونکە ئەو گۆڕانکارییە ئاینییەی کە لەڕاستیدا دەستپێکی هەموو شتێک بوو لە مێژووی ئینگلیزیدا ..."(١)

ڕاستییەکەش ئەوەیە کە تیۆرەکەی «تۆینبی» لەبارەی ڕۆڵی ئایینەوە لە مێژووی شارستانییەتەکاندا چەند دیاریکەری زۆر وردەکارتر لەم کۆکاریانەی لەخۆگرتووە، کە «تۆینبی» وای دەبینێت ئایین ئەو «حەوزە هەڵگرەیە» کە شارستانییەت لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە دەگوێزێتەوە، هەربۆیە؛ ئاوەڵناوی (Chrysalis-قۆزاخە)ی بۆ خواستووە کە ئەو بەرگەیە دەوری پەپوولەی داوە لە تێپەڕاندنی قۆناغێکەوە بەرەو قۆناغێکی دیکە، جا بەنموونە دەبینیت «تۆینبی» دەڵێت:

"ئایینەکان لە چەشنی قۆزاخە بوون بۆ سەرجەم ئەم شارستانییەتانە، هەروەک چۆن پاشماوە بەبەردبووەکان، کە هێشتا لەو شارستانییتە لەناوچووانە ماونەتەوە، دیسان لە بەرگێکی ئایینیدا پارێزگارییان لێ کراوە."(٢)

نموونەی ئەم لێکدانەوەیەش لە بیریارێکی لاوەکی ناو هزری ڕۆژئاواییەوە نایەت، بەڵکوو نوێنەرێکی نموونەیی لە بواری پسپۆڕێتییەکەی خۆیدا، تۆینبی لە بەناوبانگترین مێژوونووسەڕۆژئاواییە خاوەن تیۆرییاکانە لە لێکدانەوەی مێژوودا، هەروەها بەتایبەتتریش مێژووی شارستانییەتەکانی، زۆرجار ئەو و شبنگلەر و هیگڵ و ئەوانە لە وێستگەی بەراووردا پێکەوە دادەنرێن، پەرتووکەکەشی (الأصل-بنچینە) ئینسکلۆپێدیایەکی زەبەلاح و تێروتەسەلی پڕ وردەکارییە کە لە

---

(١) أرنولد توينبي، "مختصر دراسة للتاريخ"، مصدر سابق: (١/٥).

(٢) أرنولد توينبي، "مختصر دراسة للتاريخ"، مصدر سابق: (٣/١٥٢).

دوانزه بەرگ پێکهاتووە.

ئامادەبوونی ئایین وەک بزوێنەری سەرەکی بۆ مێژوو لەلای تۆینبی توخمێکی زۆرڕوون و ڕۆشنە، تەنانەت لەسەر ئەو تێڕوانینەی ڕووبەڕووی ڕەخنەش بووەتەوە، ئینسکلۆپێدیای نووسەرانی بەریتانی ئەوەی وێناکردووە کە تێیدا هاتووە:

"بەرگی کۆتایی پەرتووکەکەی تۆینبی «توێژینەوەیەک لەسەر مێژوو» کە بە چەند پێداچوونەوەیەک ناونیشان کراوە، تایبەتکراوە بە وەڵامدانەوەی «تۆینبی» لە هەمبەر ڕەخنە فرەچەشنەکان سەبارەت بە کارەکەی، ئەوڕەخنانەش لە دەوری دوو تەوەر دەخولێنەوە: یەکەمیان، ئەوەی کە هەندێک لە مێژوونووسان وایان هەست کردووە کە «تۆینبی» قورساییەکی زێدەی بە ئایینەکان داوە وەک هێزگەلێکی بزوێنەر بۆ پێکهێنانی شارستانییەتەکان." [١]

بەر لە هاتنەدنیای «تۆینبیش» بە پێنج سەدە؛ ئیبن خەلدوون (ک: ٨٠٨ک) هۆشیاری سەبارەت بەم فاکتەرە یەکلاکەرەوە داوە، وەختێک بەشێکی تایبەتی لە پێشەکیەکەیدا بۆ تێڕامانی ورد لەم دیاردەیە داناوە، کە لەوێدا دەڵێت: "بەشی چوارەم: سەبارەت بەوەی کە دەوڵەتە دەسەڵات فراوانە موڵک زەبەلاحەکان، بنچینەکەیان ئایینە، ئیدی لە پەیامبەرییەتییەکەوە بێت، یاخود بانگەوازییەکی حەقەوە."[٢]

بەڵکوو پێشەوا ئیبن تەیمییەش (ک: ٧٢٨ک) لە تۆمارکردنی ئەم دیاردە مێژووییەدا لە ڕۆڵی پەیامبەریەتییەکان لە پێکهێنانی مێژوودا پێش هەمووان کەوتووە کە فەرموویەتی:

---

(1) Hager; (ed), EncyclopediaOf British Writers, 18th Century, Infobase Publishing, p. 489.

(٢) ابن خلدون، "المقدمة"، دار الكتب العلمية، (ص١٦٧).

"لە سەرزەویدا شانشینێکی ڕاوێستاو نییە مەگەر بە پەیامبەرییەتییەک یاخود پاشماوەی پەیامبەرییەتییەک، هەموو خێر و فەڕێکیش لە سەرزەویدا لە پاشماوەی پەیامبەریەتییەکانەوەیە، با هیچ ژیرێک گومانی لەمە نەبێت." [١]

پێشەوا ئیبن تەیمییە تێبینیگەلێکی پەرشوبڵاوی زۆری دیکەی سەبارەت بە ژمارەیەک لە چەمکی مەدەنی هەیە کە دەڵێت ئەو چەمکانە نەناسراو بوون لە چاوگی پەیامبەریەتییەکانەوە نەبێت، وەک ئەوەی کە دەفەرمووێت:

"هەر گەلێک خاوەن پەرتووکی ئاسمانی نەبووبێت ڕۆژەکانی هەفتە لە زمانیاندا نییە، بەڵکوو تەنها ناوی ڕۆژ و مانگ و ساڵی تێدا هەیە؛ چونکە ئەوە بە هەست و بە عەقڵیش زانراوە، جا گەلان ناویان بۆ داناوە، چونکە دەربڕین شوێن وێناکردن کەوتووە، بەڵام هەفتە تەنها بە بیستن[٢] زانراوە، کە نەزانراوە پەروەردگار ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە لە شەش ڕۆژدا دروستی کردوون و لەپاشان بەرزوبڵند بووەتەوە بەسەر عەرشدا؛ مەگەر لە هەواڵی پێغەمبەرانەوە، ئەوانەی کە بۆیان تەشریعکراوە لە هەفتەدا ڕۆژێک کۆببنەوە و پەرستشی پەروەردگاری تێدا بکەن و هەفتەی یەکەمیان پێ تۆمارکردووە، کە پەروەردگار هێنانەدی جیهانی تێدا دەستپێکردووە." [٣]

ئیبن قەییمیش دەفەرمووێت: "پەیامبەریەتییەکان نەبوونایە تاقە زانستێکی بەسوودیش لە جیهاندا نەدەبوو، نە خۆشی و خێرێکیش لە بژێویدا و نە ڕاوێستان و مانەوەیەکیش بۆ هیچ دەوڵەت و شانشینێک." [٤]

---

(١) ابن تيمية، "الصارم المسلول"، تحقيق: الحلواني وشودري، دار رمادي: (٢/٤٥٩).

(٢) السمع بیستن بە واتای وەحی و جگە لە وەحیش لەوەی لە پێغەمبەرانەوە گواستراوەتەوە و دەماودەم و بە بیستن گەیشتووە.

(٣) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى" :(٧/٩٥).

(٤) ابن القيم، "مفتاح دار السعادة"، طبعة المجتمع: (٢/١١٥٥).

مەبەستیش ئەوەیە کە ئەم فاکتەرە کە بریتییە لە ڕۆڵی ئایین وەک بزوێنەرێکی مێژوو، زۆرێک لەوانەی کە کتێبە ڕەواجپێدەرە فەلسەفییەکان دەخوێننەوە ئاگایان لێی نییە، واش وەهمیان کردووە کە مێژووی شارستانییەتەکان چەند ئەندامێکی ناو یانەی فەیلەسووفەکان ئەندازەگیرییان بۆ کردووە!

بگرە سەلمێنراوێکی وردتر لەبەردەستدایە بۆڕەواندنەوەی ئەفسانەی پاکژیی عەقڵی فەلسەفە و شارستانییەت، ئەویش ئەوەیە کە توێژینەوە هاوچەرخەکان دەریانخستووە کە خودی «نوێگەری سیاسی ڕۆژئاوایی» بۆخۆی نەیتوانیوە لە چەمک و دەزگا تیۆرییە ئایینییەکان دەربازبێت. بەو واتایەی کە عەقڵی عەلمانی ڕۆژئاوایی هێشتا لەڕێی کۆمەڵە دەزگایەکی چەمکگەراییەوە بیردەکاتەوە کە لە چاوگە ئایینییەکانەوە وەری گرتووە، ئێستاش ئاسۆی تیۆری ڕۆژئاوایی بە هاوێنەی ڕوانینی ئایینییەوە چنراوە، لەوانەیە بەناوبانگترینی ئەو توێژینەوانەش ئەو تێزەی یاساناسی ئەڵمانی «کارڵ شمێت» (ک: ١٩٨٥ز)بێت، لە پەرتووکەکەیدا «لاهووتی سیاسی» کە لە ساڵی: ١٩٢٢زاینیدا بڵاوکرایەوە کە لەوێدا «شمێت» دەڵێت:

"سەرجەم چەمکە سەرەکییەکان لە تیۆری نوێدا بۆ دەوڵەت، بریتین لە «تیۆرگەلێکی لاهووتی بەعەلمانیکراو»، ئەوەش نەک تەنها بەهۆی پەرەسەندنە مێژووییەکەیەوە کە لە لاهووتەوە هەنگاوی بەرەو تیۆری دەوڵەت ناوە، ئیدی -بەنموونە- دەسەڵاتی ڕەها بۆ خودا بوویە دەسەڵاتی ڕەها بۆ دەسەڵاتی یاسادانەر، بەڵام -دیسان- بەهۆی بونیادە ڕێکخراوەکەیەوە، هەروەک چۆن دەسەڵات لە حاڵەتە لەناکاو و جیاکراوەکاندا و لە فیقهی یاسادا؛ هاوتای بیرۆکەی موعجیزە-پەرجووە لە لاهووتدا." [1]

ڕاستیش ئەوەیە کە: تێزەکەی «کارڵ شمێت» تیۆریایەکی هێندە خاوێن و

---

(1) Schmitt, Political Theology, trans. Schwab, MIT press,1985,p.36.

بێ مەرام نییە، چونکە چەند گرەوی «نازی» هەن کە زاڵن بەسەر لێکدانەوەکانی «شمێت»دا، هەندێک لە لیبرالییەکانیش تێزەکانی «شمێت» دووبارەدەکەنەوە کە لەبارەی کارتێکەرە مێژووییەکانییەوە نازانن لە بەرهەڵستکاری پەرلەمانییەت و لیبرالییەتدا، ئێرەش شوێنی ڕوونکردنەوەی ئەوە نییە، بەڵام ئەوەندەمان بەسە کە بریتییە لە تۆمارکارییەکەی «شمێت» کە پێی وایە؛ نوێگەری سیاسی چەمکە ئایینییەکانی بەکارهێناوە و خواستووە.

بگرە یەک لە بلیمەتترین پسپۆڕەکان لە فەلسەفەی شارستانییەتدا، کە «شپنگلەر»ی ئەڵمانییە (ک:١٩٣٦ز)، لەبارەی بازنەیەک لە بازنەکانەوە کە لە دوورترین مەودادایە لە ئایینەوە، لەبارەی بازنەی هونەرەوە دەڵێت: "لە بەختی خراپیشمان ئەوەیە کە توێژینەوە هونەرییەکانمان، سەرەڕای ئەوەی کە ئێدی ئێستا دان بە سنوورە ئایینییەکاندا نانێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نائاگایانە بانگەشەی دەکات و لەخۆیگرتووە." [١]

- دیاردەی هەبوونی جیاوازیش لەنێوان داهێنانی زانستی و دابەزینی فەلسەفیدا؛ ئەمەیان بەسەر ئەو گەلانەدا زاڵە کە بایەخیان بە مەدەنییەت داوە و پشتیان لە پەیامبەریەتییەکان کردووە، چون ئەوە دۆخێکی دووبارەبووەی مێژووییە، هەربۆیە کاتێک شارستانییەتی ئیغریقی لە ڕووی ناوەڕۆکەکانی وەحییەوە مایەپووچ و لە ڕووی زانستە مەدەنییەکانەوە دەوڵەمەن دبوو، هەمان وێنەی تێدا پێکهات، پێشەوا ئیبن تەیمییە ئەم دیمەنە لەو وتەیەیدا پوختەدەکاتەوە:

"چونکە ئەو خەڵکە -واتە: فەیلەسووفەکان- خودا ناناسن، بەڵکوو ئەوان لە بێباوەڕانی جوولەکە و گاوریش لە ناسینی [خودا] دوورترن، بەڵام زانستێکی باشیان لەسەر بابەتە سروشتییەکان هەیە، ئەوەیە دەریای زانینیان، بۆ ئەوە

---

(١) أشبنجلر، "تدهور الحضارة الغربية"، ترجمة: أحمد الشيباني، مكتبة الحياة: (١/٣٨١).

خۆیان یەکلاکردووەتەوە و لەوەدا تەمەنیان خەسار کردووە، بەڵام ناسینی پەروەردگاری بەرز و مەزن؛ بەشیان لێی زۆر کەم و چرووکە، ئیدی لەبارەی فریشتەکان و پەیامبەران و پەرتووکەکان و زیندووبوونەوە؛ ئەوە هەر هیچی لێ نازانن."[١]

لەبارەی ڕەمزی فەلسەفەی یۆنانیشەوە پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "مامۆستای یەکەمیش ئەرستۆ، لە نەزانترینی خەڵکە بە پەروەردگاری جیهانیان، هەتا سەر ئێسقان نەزان."[٢]

هەروەها ئیبن تەیمییە لە زێدەڕوونکردنەوەیەکی هەمان بەراورددا دەفەرمووێت: "ئەرستۆ و شوێنکەوتووانیشی لە «زانستە خوداییەکان»دا، زۆر زۆر لە جوولەکە و گاوریش نەزانترن، بەڵام لە «زانستە سرووشتییەکان»دا؛ زۆرینەی قسەکانی چاک و تەواون."[٣]

قسەوباسی ئەم پرسە فەلسەفیانەش درێژەی دەوێت کە وا باشترە بۆ چارەسازییەکانی داهاتووی دوابخەین لە دۆزی پەیوەندی گوتاری مەدەنی بە هزری نوێوە کە لەوێدا گونجاوترە.

گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە ئاماژە بەوە بدەین کە ئەم بابەتە فەلسەفییە ئەسڵەن فەلسەفەی هاوچەرخی ڕۆژئاوایی نایناسێت، یاخود زانیاری شێوێنراوی لەبارەیەوە هەیە، وەک بابەتی زانستە خوداییەکان و هەرچیش لەخۆیدەگرێت لە ناسینی پەروەردگار و ئەوەی شایانیەتی بە ناسینێکی دروست، هەروەها جیهانە پەنهانییەکان و ئەندازەگرتنی هەموو شتەکان لە پەڕاوی پارێزراو(اللوح المحفوظ)دا، بەڕێوەچوونی ڕێسا سروشتییەکان بەپێی مەبەستە خوداییەکان،

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (١٧/٣٣٠).

(٢) المصدر السابق.

(٣) ابن تيمية، "الرد على المنطقيين"، تحقيق: الكتبي، مؤسسة الريان، (ص٢٧٧).

هەروەها کاریگەریی پەرستش لە نیشانە و ڕووداوە گەردوونییەکاندا و جووڵانی دڵ بە بژارکردنی وەک پشتبەستن و ملکەچی و پاڕانەوە و نموونەی ئەم واتایانە کە هەر ئەوەیە ڕۆشنگەری ڕاستەقینە. هەروەک پەروەردگار لە بەراوردی نێوان ڕۆشنکاریی وەحی و تاریکچییەتی ئەوانەی دژین دەفەرمووێت: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيۡتًا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورًا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ﴾[الأنعام: ١٢٢] «ئەرێ کەسێک کە مردوو بووبێت و جا ئێمە زیندوومان کردبێتەوە و ڕۆشناییەکمان پێدابێت لەناو خەڵکدا پێی بڕوات، وەک ئەو کەسە وایە لە تاریکاییەکاندایە و لێشی دەرناچێت؟"

پێشەوا ئیبن تەیمییە ئاماژەی بەم ڕۆشنگەرییە وەرگیراوە لە وەحی کردووە، کە دەفەرمووێت: "لەلای موسڵمانان هێندە هەیە لە زانستە خوداییە بۆماوەکان لە خاتەمی پێغەمبەرانەوە، کە جیهانی پڕکردووە لەڕۆشنایی و ڕێنومایی."[١]

ڕەهەندی سێیەمیش: کە ڕەهەندی سیاسی شارستانییەتی ڕۆژئاواییە کە بە تەواوی مانای وشە بریتییە لە ڕووە ڕەشەکەی، کە دامەزراوەی سیاسی ڕۆژئاوایی دامەزراوەیەکی ئیمپریالی داگیرکارە و سامانی گەلانی دیکە هەڵدەلووشێت، هیچ بەربەستێکی ئەخلاقییش لەبەردەم بەرژەوەندییەکانی خۆیدا ناناسێت، لە سیاسەتی ناوخۆییدا دیموکراتی و شەفافە -زۆرجار-، لە سیاسەتی دەرەکیشدا هەمیشە دیکتاتۆرییەت و تاریکبیرە.

هەر دامەزراوەی سیاسی ڕۆژئاواییە کە نابووتترین نموونە خوێناوییەکانی ناو مێژووی خوڵقاندووە وبەرپرسە لە پەرەپێدانی ئامرازەکانی قەڵاچۆکردنی مرۆیی گشتگیر و گرتووخانە نامرۆڤانەکان و بۆردومانکردنی شارانێکی تەواو بە هەرچی مەدەنیشەوە تێیاندایە، چۆن ئەو شارستانییەتە خۆی لە گریی تاوان بێبەری دەکات لەکاتێکدا چاخی ڕەگەزپەرستییەکان و نەتەوە نازییەکان و

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٢/٨٤).

هێرۆشیما و ناکازاکی و داگیرکردنی وڵاتانی عەرەبی و گوانتانامۆ و ئەبوو غرێبی دێتەوە بەرچاو؟ هەروەها چەکە ئەتۆمییەکان و گازە ژەهراوییەکان و وەستاندنی لێکۆڵینەوەکانی گەندەڵی لەپێناو بەرژەوەندییە باڵا نەتەوەییەکاندا و بگرە یاساکانی بێبەشکردنی ئافرەتی موسڵمان لەباڵاپۆشی و داڵدەدان و بەخێوکردنی دامەزراوەگەلێکی ڕۆژنامەوانی کە سووکایەتی و گاڵتە بە پێغەمبەرێک دەکەن کە نیوەی جیهان باوەڕی پێی هەیە.

بەهەرحاڵ، ئەم سێ ڕەهەندە سەرەکییەی شارستانییەتی ڕۆژئاوایی تەنها نموونەن، بواری دیکەش دەمێننەوە کە ئەم بەشە بواری ئەوەی تێدا نییە وردەکارییەکانی باس بکات، لە وێنەی زانستە مرۆییەکان و هونەرەکان و جگە لەوانەش، ئەم نموونانەش بەسن بۆ نیشاندان و سەلماندنی مەبەست کە ئیسلامییەکان هەڵوێستێکی وردەکارییان هەیە کە بەسوود و زیانبەخش لێک جیادەکاتەوە، نەک بەو شێوەیەی کە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی وێنای دەکەن.

توخمی سێیەم: «جیاکاری لەنێوان سوودبینین و سەرسامبووندا»

زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی وەهمی ئەوە دەکەن کە وابەستەیییەک لەنێوان سوودبینین و سەرسامبووندا هەیە، بۆئەوەی سوود لە شارستانییەتی ڕۆژئاوایی ببینین، دەبێت هەردەم شەویلگەی سەرسامی بۆ داچەقێنین، دەممان بدڕێت هێندەی دەم بە باسی فەلسەفەیان بدڕینەوە، ناو و نازناوە دیارەکانیان بە خەرمانەی دەربڕینە خەیاڵی و سرووشتبڕەکان دەورەبدەین. هەربۆیە؛ هەندێکیان دەربڕینی پەرجوو (موعجیزە)ی ڕۆژئاوایی یاخود پەرجووی نوێگەری و نموونەی ئەوانە بەکاردێنێت.

لە لق و لێکەوتەی ئەوەشدا، هەر لۆمەکردنێک یاخود لێکەمکردنێکی واقیعی شارستانییەتی ڕۆژئاوایی وەک ڕەتکردنەوەی سوودبینین لە دروستییەکانیان لێ

دەڕوانن! بە هەر دەربڕینێکی ئایینی بێزار دەبن لە وەسفکردنی شارستانییەتی ڕۆژئاواییدا، وەک وەسفکردنیان بە گومڕایی و بەدڕەوشتی و داوێنپیسی و بێباوەڕی و نموونەی ئەوانە لە دەربڕینە شەرعییەکان، چونکە ئەم وێنە لە چەمکەکان بارگاویکراوی بارێکی ئایینین، بەڵام ئەوان دەیانەوێت بە زمانێکی مەدەنییانە مامەڵە بکەن کە ناوەڕۆکی ئایینی لە هەڵسەنگاندنەکان دوور بخاتەوە.

لە واقیعیشدا، تێنەگەیشتنی زێدەڕەوانی مەدەنییەت لە هەڵوێستی شەرعی بەرانبەر بە شارستانییەتەکان، هۆکاری تێنەگەیشتنیانە لە هەڵوێستی هاوچەرخی ئیسلامی بەرانبەر بە شارستانییەتی ڕۆژئاوایی کە لە شەریعەتدا وابەستەییەکی ڕەها نییە لەنێوان سوودبینین لەوانی دیکە و سەرسامبوون پێیان، بگرە پێچەوانەی ئەوەیە.

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) سوودی لە شارستانییەتی هاوچەرخی خۆی وەرگرت لە بابەتی خەندەقدا، هەروەها دروستییەتی غیلە[1] و ئاڵوگۆڕیی بازرگانی و دیلی بێباوەڕی لەبەرانبەر فێرکردنی موسڵماناندا ئازادکرد و پەیامی بۆ ناردن و بۆ پەیام ناردنیش ئەنگوستیلەیەکی مۆری تایبەتکرد وەک دابی ئەوان و دیاری لێ وەرگرتوون، هەروەک دیاری پادشای ئەیلە و قیبتی وەرگرت و لە خواردنیانی خواردووە و لە بەرگ و چنراویانی پۆشیوە، بەشداری جوولەکەی خەیبەری کرد لە باخەخورماکانیاندا و جگە لەوانەش لە لایەنەکانی هاموشۆی شەرعی لەگەڵیان، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوەشدا باسی لە گومڕایی و ئاست نزمیی و تاریکپەرستییان کردووە بەهۆی پشتکردنیانەوە لە ڕۆشنایی وەحی، هەروەک لەبارەی دەمی پێش نێردرانی فەرموویەتی: «پەروەردگار تەماشای خەڵکی

---

(١) «غیلە» واتە:سەرجێیکردن لەگەڵ ئافرەتی شیردەردا، کە پێغەمبەر (ﷺ) ویستی ڕێگری لێ بکات بەڵام لەپاشان دیتی کە ڕۆم ئەوە دەکەن و زەرەرێکیشی نەبووە ئەوجا ڕێگەی پێدا. بڕوانە: "صحيح مسلم": (١٤٤٢).

سەرزەوی کرد، جا ڕقی لێیان بوویەوە، لە عەرەب و لە عەجەمیان، جگە لە خەڵکانێکی شوێنەوارهەڵگر و پاشماوەی ئەهلی کیتاب.»[١]

پەروەردگاریش فەرموویەتی: «کتێبێک کە دامانبەزاندووە بۆ تۆ تاکوو خەڵکی لە تاریکییەکانەوە پێ دەربێنیت بەرەوڕۆشنایی.»

هەروەها فەرموویەتی: ﴿الر كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ [إبراهيم: ١] «ئەو پەروەردگارەیە کە ئایەتگەلێکی ڕوون و ڕۆشن دادەبەزێنێتە سەر بەندەکەی خۆی موحەممەد (ﷺ) تاکوو ئێوە لە تاریکییەکانەوە بەرەوڕۆشنایی دەربێنێت.»

جا ئەوەی ڕوونکردەوە کە سەرجەم ئەو گەلانەی هاوچەرخی ئەو لە تاریکیدان، تاریکپەرەست ئەوانن کە پێویستیان بە ڕۆشنگەری ڕاستەقینە هەیە کە ڕۆشنایی وەحییە.

ئەم سێ جیاکارییە مەنهەجییە کە بریتین لە: جیاکاری لەنێوان شارستانییەت وەک ئامانج و وەک ئامرازدا، جیاکاری لەنێوان ڕەهەندی زانستی و فەلسەفی و سیاسی شارستانییەتی هاوچەرخدا، هەروەها جیاکاری لەنێوان سوودبینین و سەرسامبووندا: کلیلی سەرەکی تێگەیشتنن لە هەڵوێستی ئیسلامییە هاوچەرخەکان لەهەمبەر شارستانییەتی هاوچەرخ، هەرکەسێکیش لێی حاڵیی بێت بێگومان نەزانیی ئەوانەی بۆ دەردەکەوێت کە دەڵێن ئیسلامییەکان دژی شارستانییەت و ڕۆشنخوازی و نوێگەرین، ئیدی بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئیسلامییەکان هەڵوێستێکی ورد و دروستیان هەیە، کە هەڵقووڵاوی دەقەکانی شەریعەتە.

وەلێ سکاڵا و بۆڵەبۆڵی پەڕگیرانی مەدەنییەتی ماددی لە هەمبەر دوودڵی

---

(١) "صحيح مسلم": (٢٨٦٥).

کۆمەڵایەتی دژ بە ڕۆشنبیری و کلتووری ڕۆژئاوایی و متمانەنەبوون بە بانگخوازانی و نارەحەتبوونی هەندێک لە خەڵک بە بەرهەمە ڕۆژئاواییەکان، ئەوا بەرپرسی ڕاستەقینەی ئەمەیان ئیسلامییەکان نین، بەڵکوو ئەو زمانە زبر و ئەو ڕووە گرژ و توندەیە کە هەندێک لە پەڕگیرانی مەدەنییەت بۆخۆیان دەینوێنن، تا ئەوەی یەکێکیان وتی: "پێویستە ئەوەی لە شارستانییەتی ڕۆژئاواییدا هەیە وەری بگرین، بە تاڵ و شیرین و چاک و خراپییەوە"، یەکێکی دیکەشیان دەڵێت: "شارستانییەتی ڕۆژئاوایی وەک کۆشکێکی ناوازە و ڕازێنراوە وایە، نابێت بە تەنەکەی زبڵەکانییەوە سەرقاڵبین." جا نموونەی ئەم تاوتێدان و خۆلەدەستدانە بەرانبەر بە بەرهەمی ڕۆژئاوایی؛ ئەوەیە کە شووناسی ئیسلامی خەمبارکردووە و داینەمۆی بەرهەڵستی میللی هەراسانکردووە؛ وەگەرنا خەڵک ئەگەر هەڵوێستێکی عەقڵانی و سەنگینیان بەرانبەر بە بەرهەمەکانی هزری ڕۆژئاوایی لەو توێژە ڕۆشنبیریانە بەدیکردبا کە هەستیاری و خۆبەخاوەنکردنی بۆ بەهاکانی ئیمان و ئەخلاق و پاکیزەیی بنواندایە، ناچار نەدەبوون بەو شێوەیە ڕەتکردنەوەی بۆ دەرببڕن کە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی ڕەخنەیان لێی هەبێت.

# ٨- بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاوا

لە سەرەتای سەدەی شازدەیەمدا «تۆماس مۆر» کتێبە بەناوبانگەکەی «یۆتۆبیا» نووسی، کە کۆمەڵگایەکی نموونەیی خەیاڵی پێ وێنادەکات لە دوورگەیەکی زەریای ئەتڵەنتیدا، ئەم کتێبەش بووە یەکێک لە سەرچاوەکانی ئەدەبیی سیاسی لە هزری ڕۆژئاواییدا، هەر لەویشەوە وەسفی یۆتۆبیا و تووباویەت(١) بۆ وەسفکردنی بیرۆکەی نموونەیی خەیاڵییانە وەرگیراوە.

چاودێری گوتاری پەرگیرانی مەدەنییەتی ماددی و ئەو زمانەی کە دەستکەوتەکانی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی پێ دەردەبڕن و ئەو هالەیەی (خەرمانە) کە دەوری کەسایەتییە ناودارە ڕۆژئاواییەکانی پێ دەدەن لە ژینگەی ڕۆشنبیریماندا؛ شتێکی بۆ دەردەکەوێت لە شێوەی بەتوباکردنێکی ڕۆژئاوا، بەواتای دووبارە وێناکردنەوەی ڕۆژئاوا وەک کۆمەڵگایەکی توباوی نموونەیی، بە زمانێکی ئەستۆکەچانە کە توانای شاردنەوەی لایەنگیرییە دەروونییە ئاشکراکەی خۆی نییە.

جا وێنای پێشکەشکراو لەسەر هزری ڕۆژئاوایی وێنایەکی زانستی نییە کە گرنگیدەر بێت بە خوێندنەوە و لێکدانەوەی حاڵەتی ڕۆژئاوایی وەک پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی، یاخود تۆڕێکی ئاڵۆز کە تێیدا سیاسەت و بەرژەوەندی و هزر و ڕەوشت و تەوژمەکان تێکەڵ دەبن، بەڵکوو وێنەی هزری ڕۆژئاوایی بە زمانێکی پیاهەڵدان و دەستەواژەگەلێکی سۆزدارییانە پێشکەش دەکات کە لە عەشقەوە نزیکترە تا خوێندنەوەیەکی مەعریفی، جا گوتاری زێدەڕەوانی مەدەنییەت لەبارەی

---

(١) لە (طوبا)وە هاتووە بە واتای بەخشش و باشی و خۆشیەکی مەزن و بێسنوور، لێرەشدا بە واتای بیرۆکەیەک کە بەو شێوەیە تاریفی شتێک بکات.

ڕۆژئاواوە گوتارێکی «تەبشیری-مژدەدەر»یە، نەک گوتارێکی «لێکدانەوەیی» وەک بانگەشەی دەکەن.

جا هەندێک لە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی کاتێک باس لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی دەکات هەر دەڵێیت تاریفی شارێکی بەهەشتت بۆ دەکات کە لە سەر زەویدا نراوە بەیەکەوە، ئیدی تۆش بۆت دەبێتە پرسیار کە ئایا ئەم کۆمەڵگا نموونەیی و بێگەرد و دوورە لە هەموو هەڵە و پەڵەیەکی مرۆڤەکان لە کوێیە کە ئەم نووسەرە باسی لێ دەکات؟

تاکوو لەپاش ئەوە بۆت دەردەکەوێت کە ئەم نووسەرە وەختێک لەبارەی کۆمەڵگای ڕۆژئاواییەوە دەدوێت، زەینی بە سێ قۆناغدا تێپەڕدەبێت، سەرەتا وێنە نموونەییبە خەیاڵییەکە لە زەینیدا پێکدێنێت، لەپاشان دەیداتە پاڵ ئەم کۆمەڵگا ڕۆژئاواییە، لەدواییشدا دادگایی کۆمەڵگاکانی دیکە دەکات کە بۆچی بەم ئاستە پێشکەوتووە ڕۆژئاواییە نەگەیشتوون؟!

جا کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی هاوتای نموونە توباوییە دانراو-ئەگەری-ەکەیە، نەک ئەو واقیعە ڕۆژئاواییەی کە ئێمە لە لایەنی جوگرافی و هزرییەوە دەیناسین، بەو واتایەی کە ڕۆژئاوا بووەتە وتەی چاوگ «مەڕجەع» کە لە سەروەختی هەڵسەنگاندن و بەراورد و دادگاییکردنی ئەزموونە مرۆییەکانی دیکەدا ئامادە دەبێت، زێدەتر لەوەی کە بۆ ناوهێنانی شارستانییەتێکی دیاریکراوی ناسراو لە لایەنی جوگرافی و هزرییەوە و لە چەند چوارچێوەیەکی تایبەتی خۆیدا بەکاربێت.

لێرەشدا دەتوانین ئەم چەمکە بەکاربێنین کە «ئێدوارد سەعید» پەرەی پێ داوە و داویەتی لەقاڵب، ئەویش چەمکی جوگرافیای خەیاڵکراوە (imaginative geography)، کە ئێدوارد سەعید بنیاد لەسەر ئەوە سەرکۆنەی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانی کردووە کە خەریکی «بەڕۆژهەڵاتکردنی ڕۆژهەڵاتن» [1]،

---

(١) إدوارد سعيد، "الاستشراق"، ترجمة: كمال أبو ديب، مؤسسة الأبحاث العربية، الطبعة

واتە: بە بەرداکردنی کۆمەڵێک سیفەتی ڕۆژهەڵاتی خەیاڵکراوی ئاست نزم و دواکەوتوو بەبەر ڕۆژهەڵاتی ڕاستەقینەی سەرزەویدا، هەر ئەوەی کە بەر لەویش ئەنوەر عەبدولمەلیکی ڕەخنەگر لە ڕۆژهەڵاتناسی پەی پێ بردووە[1].

ئێمەش لێرەدا ئەم چەمکە بەکاردێنین، بۆ چەند مەبەستێکی ڕێکاری، بەڵام بە شێوەیەکی پێچەوانە، بەجۆرێک کە لە نووسراوە نوێگەرییەکاندا لەبارەی ڕۆژئاواوە دەبینین کە خەریکی «بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاوا»ن، واتە: بە بەرداکردنی بەرگێکی نموونەیی بەبەر کۆمەڵگای ڕۆژئاواییدا، واتە: وێناکردنی ڕۆژئاوای ڕاستەقینەی سەرزەوی وەک ڕۆژئاوای خەیاڵکراوی توباوی.

گرنگ ئەوەیە: ئەم ڕێپێوانە زەینییە، لە بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاوا لە گوتاری نوێگەری عەرەبیدا و لەپاشان دادگاییکردنی واقیع لەبەردەستی ئەودا، تا ئاستێکی زۆر لە هەندێک لە خۆبەفەقیهزانەکانی مەدەنییەت دەچێت کاتێک کە بە سەلیقەی پەتی خۆیان شتێکیان بەدڵ نەبێت؛ دەڵێن: "ئەمە لەگەڵ شەریعەتدا ناگونجێت"، جا سەلیقەی خۆیان دەدەنە پاڵ شەریعەت، لەپاشان ڕووداوەکان لەسەر بنەمای سەرپێچیکردنی ئەو شەریعەتە دادگایی دەکەن کە بانگەشەی دەکەن، هەر بەم شێوەیەش بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی دەبینیتەوە لەبارەی دیاردەیەکەوە کە بەدڵیان نەبێت دەڵێن: "ئەمە دواکەوتوویە و لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا نییە." کە لەڕاستیدا مەبەستی ڕۆژئاوا خەیاڵکراوەکەی ناو زەینی خۆیەتی، کە لە بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاواوە پەیدا بووە، نەک ڕۆژئاوای ڕاستەقینەی واقیعی ناسراو کە برێکی زۆر سیمای دواکەوتن و دابەزینی تێدایە شانبەشانی ڕووالەتەکانی پێشکەوتنی ماددی.

بۆئەوەی قسەکانیش تیۆری پەتی نەبن، بیرمە یەکێک لە نووسەرانی ڕۆژنامە

---

الخامسة، (٢٠٠١ز)، (ص ٨٠).

(1) A. Abdel-malek, Orientalism in crisis, Diogenes, 1963

ناوخۆییەکان چەند گوتارێکی تایبەت کردبوو بە باسکردن لە دیاردەی خێڵ لە کۆمەڵگای عەرەبی و بەتایبەت ناوخۆییدا، هەرچی نازناوی زەم و ناشرینکردن لە فەرهەنگیدا هەبوو تێوەی ئاڵاند، لەپاشان دەستی کردبووە داخهەڵکێشان و زووخاو خواردنەوە کە کەلتووری ئێمە ڕەگی ڕەگەزپەرەستی تێدایە بەپێچەوانەی کەلتووری ڕۆژئاواییەوە کە پاک و بێگەردە و دوورە لەم ڕەگەزپەرستییانەوە.

جا نازانم ئەم نووسەرە لەبارەی کام ڕۆژئاواوە دەدوا؟ کە ململانێ زەبەلاحەکانی ناو کەلتووری ئەورووپی لە دەوری جیاکارییەکانی نێوان ڕەگەزە ڕۆژئاواییەکاندا خولاونەتەوە، لەسەر ئەو بنچینەیەشی جەنگی گەورە و تۆقێنەر هەستاون و هەروەها پڕۆژەی دابەشبوون بۆ چەند دەوڵەتێک هاتوونەتەکایەوە، ئەو ویلایەتە یەکگرتووانەشی کە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی وەک نموونەی یەکسانی لێی دەڕوانن، بەدرێژایی تەمەنی کە هەبووە نەپیاوێکی ڕەش[1] و نە مێینەیەکیش هەتا ئەم ساتە نەگەیشتوونەتە لووتکەی دەسەڵات تێیدا. لەگەڵ هەموو ئەوەشدا؛ کەچی ئەم نووسەرە دادگاییمانی بردووەتە لای ئەم کەلتوور و ڕۆشنبیرییە کە بانگەشەی بێگەردی نەتەوەییان بۆ دەکات کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم کەسە هەستاوە بە بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاوا، واتە: وێنەیێکی زەینی نموونەیی پێکهێناوە، لەپاشان داویەتیە پاڵ کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی، لە دواییشدا هەڵوێستەکان بۆ دادگاییکردن دەباتە لای و ئەو دەکاتە داوەر بەسەریەوە.

بەو واتایەی کە: ڕۆژئاوا لەلای هەندێک لە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی بۆتە جوگرافیایەکی خەیاڵکراو کە بوونی نییە، کە زیاتر لەڕەها و باڵاوە نزیکە هەتا

---

(١) ئەم پێدراوە پەیوەست بوو بە کاتی بڵاوکردنەوەی یەکەمجاری ئەم توێژینەوەیە ساڵی(١٤٢٨ک-٢٠٠٧ز)، زانراوە کە پاش ئەوە باراک ئۆباما گەیشتە پێگەی سەرۆکایەتی لە ساڵی(٢٠٠٩ز)دا، کە لە ڕیشەگەلێکی ئەفریقییەوە هاتبوو، بەڵام هێشتا ئەم ڕووداوە وەک حاڵەتێکی هەڵاوێردوو لە مێژووی سەرۆکایەتی ئەمریکادا دەمێنێتەوە، هەروەک تا ئەمڕۆش ئافرەت بە پێگەی سەرۆکایەتی نەگەیشتووە لە ئەمریکادا.

واقیعی و مرۆیی، بنیاد لەسەر ئەوە وادیارە کە ئەوە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددین کە پێویستیان بە بەمرۆییکردنی وێناکانیان هەیە لەبارەی ڕۆژئاواوە، بە واتای دیتنەوەی ڕەهەندی مرۆیی و خودی لە ناوەڕۆکەکانی هزری ڕۆژئاواییدا، نەک خوێندنەوەی وەک بیرۆکەیەکی ترنسنتندالی باڵا لە چوارچێوەی مێژوویدا.

لەڕاستیشدا: ئەم سەرسامبوونە نەخۆشی نییە سەرەڕای پێکدادانی لەگەڵ وەحی و واقیعدا؛ دیسان زیانگەیەنە بە ڕۆحی ڕابوون لەناو دەروونی موسڵماندا؛ چونکە پشتبەستن بە ئامادەگییەتی بەرهەمی ڕۆژئاوایی تواناییەکانی بەرهەمهێنان بەرەو ئیفلیجبوون دەبات. هەربۆیە؛ سەرجەم ئەزموونەکانی هەستانەوەی ئاسیایی جەخت لە گرینگێتی توخمی متمانەبوون بە خود دەکەنەوە لە سەرکەوتنی گەشەپێداندا.

هەندێکیش لە بانگخوازانی زێدەڕەوی مەدەنییەتی ماددی دەرگایان لەنێوان خۆیان و ڕەخنەگران لەڕۆشنبیری و کەلتووری ڕۆژئاواییدا داخستووە، لە ڕێگای خاڵێکی لەپێشینەی چەسپێنراوەوە، ئەویش ئەوەیە کە ڕەخنەگرتن لە ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوایی لە بێئاگابوون و نەناسینیەوە دێت، جا هەر کاتێک هەر ڕەخنەگرێک لە ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا ببینن وای دادەنێن کە تەنها بەهۆی نەناسینیەوە ڕەخنەی لێدەگرێت!

کە بێگومان ئەمەش وێناکردنێکی تەواو ناڕاستە، بگرە ئێمە لە ڕێڕەوی هزری عەرەبیدا دەبینین کە ڕەمزەکانی ڕەخنەگری لە هزری ڕۆژئاوایی لە زۆرینەی هەرەزۆری تەبشیرییەکانی هزری ڕۆژئاوایی ئاگادارتر و زاناترن پێی!

کە لێرەدا نموونە بە چوار پڕۆژەی هزریی عەرەبی دێنمەوە کە بە چۆنێتییەکی تایبەت؛ بەرهەڵستکاری و ڕەخنەگرتن لە هزری ڕۆژئاوایان لەخۆگرتووە، کە ئەویش پڕۆژەکەی فەیلەسووفی مەغریب د. تەها عەبدولڕەحمان بۆ دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی کەلەپوور و مافی ڕاجیایی هزری و فەلسەفی

و بنچینەسازیکردن بۆ فەلسەفە و دیتنەوەی پەیوەندییە وردەکانی نێوان زمانەوانی و مەنطیق. هەروەها پرۆژەکەی د. ئەبوویەعروب مەرزووقی، بۆ بەستنەوەی ڕەگی گرفتی فەلسەفی و هزری بە فەلسەفەی ناوی لە وێنە «تەیمی/خەلدوون»یەکەیدا و پرۆژەکەی د. عبدالوهاب مەسیری بۆ توێژینەوە لە دیاردەی عەلمانییەتی گشتگیر، یاخود ئەوەی کە دەکرێت ناوبنرێت بە دیاردەی ماددەگەرایی لە وێنای ڕۆژئاواییدا، هەروەها پرۆژەکەی د. ئێدوارد سەعید بۆ بەدواداچوونی دەرکەوتەکانی ویستی هەژموونداری لە ڕیشەکانی بەرهەمی ڕۆشنبیری ڕۆژئاواییدا، لە وێنەی دیاردەی ڕۆژهەڵاتناسی و دیاردەی هێنان و گواستنەوە هەرە گەورەکان لە مێژووی ڕۆژئاواییدا.

جا ئەو چوار ڕەمزە ڕەخنەگرە لە هزری ڕۆژئاوایی، نەزان نین پێی، بگرە لە زۆرێک لە مژدەدەرانی نوێنەری ڕۆژئاوا لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت پێی ئاگاترن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو چوار ڕەمزە هەڵوێستێکی توندی نەیارانەیان بەرانبەر بە ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی هەیە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ڕەخنەگرتن لە ڕۆشنبیری و کلتووری ڕۆژئاوا ڕەنگدانەوەی نەزانین نییە پێی.

ئەو خاڵەشی کە مەبەست لێی خستەڕووی پرۆژەی هزریی ئەم چوارە بوو مانای هاوڕابوون نییە لەگەڵیان لە هزر و بۆچوونەکانیاندا کە هەریەکێکیان چەندەها تێزی هەیە کە جێگای وتووێژن کە ئێرە شوێنیان نییە، بەڵکوو مەبەستمان بڕی هاوبەشی نێوان ئەو چوارە بوو کە ڕەخنەگرتنە لە هزری ڕۆژئاوایی و سەربەخۆیی و جیابوونەوەی هزرییە لێی، کە واتای ئەوە دەدات کە ڕەخنەگرتن لە هزری ڕۆژئاوا لقێک نییە لە نەزانین پێی، هەروەک هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت هەمیشە دەیڵێنەوە.

هەندێکیش لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت نکۆڵی دەکەن لەم ڕێبازە ڕەخنەگرە ئیسلامییە لە ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی، شین و ڕۆڕۆییانە کە بەداخەوە چۆن

ئیسلامییەکان بێئاگا و ناسەرسامن بە موعجیزەی نوێگەری ڕۆژئاوایی و ئەوە دووپات دەکەنەوە کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی جگە لە کێشەی سێکسی هیچ گرفتێکی ئەخلاقی دیکەی نییە، لە کاتێکدا کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی لێوانلێوە لە ڕەوشتەکانی کارکردن لە وێنەی ڕاستگۆیی و سپاردەپارێزی و ئەوانە، هەروەها کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی توانیویەتی دادگەری و ڕەوشت بە دامەزراوە بکات، یان هەندێکیان چوواندنێک بۆ هەڵوێستی ئیسلامییەکان لە هەمبەر کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی دەهاون، کە دەڵێن: "ئیسلامییەکان وەک ئەو کەسە وان کە دەچێتە ناو کۆشکێکی بەرزی ڕازاوەوە کەچی سەرقاڵی سەیرکردنی تەنەکەی زبڵەکانیەتی، جوانی و کەشخەیی کۆشکەکەی وازلێهێناوە." ئەم بیرۆکەیەش لەلای بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی بەربڵاوە.

ڕاستیش ئەوەیە کە: ئەم نموونە هێنانەوەیە گەمەباز و چەواشەکارە، بەڵکوو کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی وەک کۆشکێکی ڕووالەت ڕازاوە وایە کە بناغەکانی هەڕەشەی داڕمانیان لەسەرە، جا ئایا عەقڵانییەتە کە ئێمە واق و ڕماوی ڕووانین و وەستان بەدیار جوانی ڕواڵەتەکانیەوە بین و هاوار لە خەڵک بکەین بڕژێنە ناویەوە، یاخود دەبێت ئاگاداریان بکەینەوە کە وا لە ئان و ساتدا دەڕووخێت؟

لەوانەشی کە ئەوە بەدیاردەخات: ئەوەی کە ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی گیرۆدەی ناجێگیرییەکی توند و بەرز و هەستیارە لە زەمینەی بابەتە خوداییەکاندا، کە زۆرینەی خەڵک لەو کۆمەڵگایەدا گرفتی لێشێواندنێکی قووڵی لەم بنچینە جەوهەریەدا هەیە، ئیدی زۆرینەی توێژە ڕۆشنبیرەکانیشیانیان لائیکین، یاخود کەیسی ئایین لەلایان کەیسێکی دواخراو و یەکلانەبووەیە، جا جیهانی ڕۆژئاوایی لە ئەنجامی شەرەفمەندنەبوونی بە باوەڕهێنان بە پەیامبەرییەتی موحەممەد (ﷺ) هێشتاکوو بێبەشە لە وێناڕاست و وردەکان لەبارەی خودا و زیندووبوونەوە و پەیامبەرێتییەکان و جیهانی بان و داهاتووی دوای مردن و چەشنی ئەوانە لە داخوازییە باڵاکان.

جا ئەم پرسیارە جەوهەرییە کە: ئایارۆژئاوا چی لەدەستدا بە بێباوەڕبوونی بە پەیامبەرییەتی موحەممەد (ﷺ)؟ هێشتا زۆرێک لە ڕۆشنبیرانی موسڵمانیش لێی بێئاگان بەداخەوە.

کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی کاتێک بێباوەڕبوو بە پەیامبەرییەتی موحەممەد (ﷺ) فەراهەمکردنی داهاتوویەکی باشی پاش لەنێوچوونی مرۆڤایەتی لەدەستدا، ئیدی هەڕەشەی سەختی کارەساتی دۆزەخی خودای لەسەرە، هەروەها ناسینی ناوەڕۆکی وەحییان دۆڕاند کە ئەو زانستە بەبەهایانەن کە دوا پێغەمبەر کە بەدیهێنەری گەردوون ناردوویەتی بۆی هێناوین.

هەر لەبەر ئەمە؛ زۆرێک لە ڕۆشنبیر و فەیلەسووفەکانی ڕۆژئاوا لەوە حاڵیی نەبوون کە زانستە خوداییەکان نیشانی دەدات کە هەڕەمی لەپێشینەییەکان ئاوەدانکردنەوەی دەروونەکانە بە (اللّٰه)، بە پەرەستن و وابەستەپێبوونی، بە پاکژبوونەوە و یەکلاکردنەوەی خود بۆ ویست و ویستراوەکانی ئەو.

هەروەک چۆن کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی پەی بە زۆرێک لە بنچینە و وردەکارییەکانی دادگەری نەبردووە کە وەحی ئاشکرای کردوون، جا پەی بە کارەساتباری ڕیبا و قومار و سەرخۆشکەرەکان و داوێنپیسی نەبردووە، عەقڵییەتی یاسادانانیان هەنگاوی نەناوە بۆ ناسینی زۆرێک لە وردەکارییەکانی سیستمی سەلماندن و دادوەری شەرعی و سزا تاوانکاریەکان و ڕێساکانی پەیوەندییە خێزانییەکان کە وەحی هێناونی و نیشانیداون، بەڵکوو ڕێگای زۆرێک لە دابەکانی فیترەت و سروشتی پاکی نەناسیوە لە پاکوخاوێنی و لابردنی پیسییەکان کە لە وەحیدا فەرمانی پێ کراوە.

بەڵکوو کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی هێشتا گیرۆدەی دیاردەی بتپەرستییە کە نەویترین ئاستەکانی دواکەوتوویە کە زۆرێک لە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی ئاگاداری دیاردەی بتپەرستی نین لە کۆمەڵگای ڕۆژئاواییدا لە ئەنجامی

ئەوەی کە وادەزانن بتپەرستی تەنها بریتییە لە کڕنووشبردن بۆ بتێک، لەکاتێکدا چەمکی بتپەرستی لە قورئاندا زۆر لەوە فراوانترە، بنیاد لەسەر بنەمای فراوانی خودی چەمکی بەندایەتی خۆی؛ کەملدانی تەواو بۆ ئارەزووی کەسی و چێژی تایبەت؛ بەندایەتیکردنە بۆ ئارەزوو، هەربۆیە پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿أَفَرَأَيتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَواهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلى عِلمٍ وَخَتَمَ عَلى سَمعِهِ وَقَلبِهِ وَجَعَلَ عَلى بَصَرِهِ غِشاوَةً فَمَن يَهديهِ مِن بَعدِ اللَّهِ أَفَلا تَذَكَّرونَ﴾ [الجاثية: ٢٣] «ئەرێ ئەوەت دیوە کە خودای خۆی کردووتە هەوا و ئارەزووی خۆی.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿أَرَأَيتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَواهُ أَفَأَنتَ تَكونُ عَلَيهِ وَكيلًا﴾ [الفرقان: ٤٣] «ئەرێ ئەوەت دیوە کە خودای خۆی کردووەتە هەوا و ئارەزووی خۆی، ئەرێ تۆ دەبیتە پارێزگار بەسەریەوە کە بەزۆر بیگەڕێنیتەوە سەر باوەڕ.»

بە شوێن بەخوداکردنی ئارەزووشدا؛ دیسان مرۆڤی ملکەچ و زەبوون بۆ داخوازییەکانی ماددە بە ملکەچی تەواو، پێغەمبەر (ﷺ) بە بەندەی پارە و ماڵی ناوبردووە کە وەک لە سەحیحدا هاتووە دەفەرمووێت: «داڕزێ بەندەی دینار، داوەشێ بەندەی درهەم.» [١]

جا ئەم دەقانە ڕوویەک لە ڕووەکانی بتپەرەستی نیشاندەدەن کە بەخوداکردنی ئارەزوو هەروەها بەندایەتیکردنە بۆ ماددە.

ئەوجا چەند بەئازارە کە بیریارێکی موسڵمان قەبارەی سنوورشکێنییە شەرعییەکانی شارستانییەتی ڕۆژئاوایی لێ بزربێت و وای ببینێت کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی تەنها گرفتی سێکسی هەیە. لە واقیعیشدا: وردەکاریکردن و بەدواداچوون لە نموونەی ئەم بۆچوونانە ئەوە بەدەردەخات کە زۆربەی لە زێدەڕەویکردن و لە نرخاندنی شارستانییەتی ماددیەوە پەیدابووە، هەروەها بەکەمگرتنی بەهای زانستە خوداییە بەمیرات ماوەکان لە پێغەمبەرانەوە،

---

(١) "صحيح البخاري": (٢٨٨٧).

ئەمەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە زێدەڕەوی مەدەنی ماددی؛ سەرچاوەی لادانی ڕۆشنبیرییە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر وایدانێین کە ئەو قسەیەی زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی ڕاستە کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی جگە لە بەرەڵلایی سێکسی هیچ کێشەیەکی دیکەی نییە، لە وێنەی گرتنی هاوەڵی سەرجێ و لەشفرۆشی و ترازان و هەڵوەشانەوەی خێزان و بەیاساییکردنی هاوسەرگیری هاوڕەگەزبازەکان و هتد، ئەوا هێشتا ئەوە بەسە بۆ وەدەرخستنی نزمی و دواکەوتوویی ئەو کۆمەڵگایە، هەروا ئاتاجبوونی ئێکجار زۆری بە ڕۆشنگەری بە زانستە خوداییەکان کە بەنموونە دیاردەی هاوڕەگەزبازی تەنها تەنەکەیەکی بچووکی زبڵ نییە، بەڵکوو یەکێکە لە هۆکارەکانی خەشم و توڕەیی گشتگیری خودایی، هەر بۆیە پەروەردگار دێی سەدوومی بە فەوتاندنێکی گشتگیر فەوتاند کاتێک دیاردەی هاوڕەگەزبازەکانی تێدا بڵاوببوویەوە، هەروەک دەفەرموێت: ﴿فَلَمّا جاءَ أَمرُنا جَعَلنا عالِيَها سافِلَها وَأَمطَرنا عَلَيها حِجارَةً مِن سِجّيلٍ مَنضودٍ(٨٢) مُسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَما هِيَ مِنَ الظّالِمينَ بِبَعيدٍ﴾ [هود: ٨٢ - ٨٣] «جا کاتێک فەرمانمان هات ژووریمان کردە ژێری و بەردی قوڕینی توندی تاودراوی ڕێکخراومان باراندە سەریان. نیشانکراو لەلای پەروەردگارتەوە ئەوەش لە ستەمکارانی دیکە بەدوور نییە.»

هەروەها لەبارەیانەوە دەفەرمووێت: ﴿فَجَعَلنا عالِيَها سافِلَها وَأَمطَرنا عَلَيهِم حِجارَةً مِن سِجّيلٍ (٧٤) إِنَّ في ذٰلِكَ لَآياتٍ لِلمُتَوَسِّمينَ(٧٥) وَإِنَّها لَبِسَبيلٍ مُقيمٍ(٧٦) إِنَّ في ذٰلِكَ لَآيَةً لِلمُؤمِنينَ﴾[الحجر: ٧٤ - ٧٧] «جا دەمەوخۆرهەڵاتێکی زوو؛ ناڵەکە ئێخەیگرتن و فەوتاندنی. ئەوجا ژووریمان کردە ژێری و بەردی قوڕینی توندمان باراندە سەریان. بەڕاستی کە ئا لەوەدا چەندین نیشانە و پەند هەیە بۆ پەندوەرگران. بەڕاستی کە شوێنەواریان لەوێدا ماوەتەوەڕوون و ڕۆشن. بەڕاستی کە ئا لەوەدا نیشانە و جێڕامانێک هەیە بۆ باوەڕداران.»

جا ئەگەر دیاردەی هاوڕەگەزبازی مایەی ئەم خەشمە گەورە خوداییە بێت، ئیدی چۆن دروستە بابەتەکە سووک و ئاسان بکرێتەوە و وەک گرفتێکی سنووردار لێی بڕوانرێت، لەکاتێکدا کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی لە پرسی هاوڕەگەزبازیدا گەیشتووەتە ئاستی ڕێکخستنی یاسایی و پاراستنی مافی لادەرانی! جگە لە چەند دامەزراوەیەکی کڵێساییش هیچ کەس و لایەنی دیکە لە کۆمەڵگای ڕۆژئاواییدا بەرهەڵستی دیاردەی هاوڕەگەزبازییان نەکردووە، ئەوانیش لە پاشماوە ڕۆشناییەکی پەیامبەریەتییەکانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا؛ هەندێکی دیکە لە کڵێساکان ئەوەشی کە لەو ڕۆشناییە مابۆوە کوژاندیانەوە و ڕێزگرتنی خۆیان بۆ ئەم دیاردە لادەرە ڕاگەیاند.

ئەوجا ئەوەی کە دەوترێت کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی توانیویەتی دادگەری و ئەخلاق بەدامەزراوە بکات، ئەوا چۆن توانیویەتی هەندێک لەوە بەدامەزراوە بکات؛ ئاواش زۆر لێهاتووانە زۆرێک لە جێبەجێکارییەکانی داوێنپیسی و تاوان و ستەمکاری بەدامەزراوەکردووە و پێشکەوتووترین توانا تەکنۆلۆژییەکانیشی بۆ فەراهەم کردووە.

ئەوەشی کە زێدەڕەوانی مەدەنییەت دووبارەی دەکەنەوە لە لێوانلێوبوونی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی لە ڕەوشتەکانی ڕاستگۆیی و سپاردەپارێزی لە کاری بازرگانیدا؛ ئەوا هەندێک لەوە وەکچۆن لە گەلانی دیکەشدا هەیە لای ئەوانیش هەیە، بەڵام زۆرێک لەوە ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزییەک نییە کە لەپێناو خوادا بێت، لە نیازپاکی و ویستنی ڕەزامەندی کردگاری مەزنی گەردوونەوە هەڵنەقووڵاوە، هێندەی ئەوەی متمانەی بەبازاڕکردنە و پاڵنراوە بە باڵانسەکانی قازانج و زەرەری ماددی و هونەرەکانی مارکێتینگ.

ئەوەشی ئەوە بەدەردەخات بریتییە لە قەبارەی دزی و شەوکوتی ڕێکخراو و هونەرە پێشکەوتووەکانی تاوانکاری لە کۆمەڵگای ڕۆژئاواییدا کە بەردەوام

توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بەتێروتەسەلی نمایشیدەکەن، جاربەجارێکیش ڕۆژنامەگەری هەندێکی بە نموونە وەردەگرێت، دیسان ئەمەش پێویستی ڕۆژئاوا بە زانستە خوداییەکان بەدەردەخات بۆڕاستکردنەوەی پاڵنەرەکانی.

ئەوەشم لە زۆرێک لەوانەی کە لەسەر توباوییەتی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی دەدوێن بەدیکردووە کە ئاگایان لەو بەدواداچوون و ئامارانە نییە کە کۆنگرە و ناوەندە گرنگ و دیارەکانی توێژینەوەی ڕۆژئاوایی لەبارەی کێشەکانی کۆمەڵگای ڕۆژئاواییەوە پەیتا پەیتا دەیخەنەڕوو، تژی لە ژمارە و ئامار و لێکدانەوەی سەنگین، لە وێنەی: تێکڕاکانی تاوانکاری، ساختەکاری، بەرتیلخۆری، بڵاوبوونەوەی چەک، توندوتیژی خێزانی، لەبەریەکهەڵوەشانەوەی دامەزراوەی خێزان، نەخۆشییە دەروونییەکان، گێچەڵی سێکسی، نەخۆشییەکانی چێژی قەدەغەکراو و قەیرانی قەرزەکان[١] ...هتد.

سەرەڕای سەرگەردانی فەلسەفی لە داخوازییە مەزنەکاندا لە باوەڕبوون بە پەروەردگار، نەبوونی ئۆقرەیی و باوەڕی دڵ بە قەزا و قەدەر، ئەرخەیانبوون بە زانینی سەرەتا و بنچینەی ژیان و سەرەنجامی و شەرەفمەندبوون بە تەشریعی خودایی.

ئەم چارەڕەشی و نەگبەتییەی ڕۆژئاوا لە بابەتە ئیمانییەکان و بگرە زۆرێک لە ماددییەکانیشدا؛ بەداخەوە کە زۆرێک لەوانەی دەم لە باس و تاریف و پیاهەڵدانی کۆمەڵگای ئەوروپی دەکوتن ئاگایان لێی نییە.

ئەوەشی ئاماژەمان پێکرد هەندێک لە دیاردەکانی «دابەزینی ڕۆژئاوایی»ە کە ناهۆشیار بوون پێی؛ دیاردەی «ئیفلیجی عەقڵی» دێنێتە بوون لە هەمبەر

---

(١) بۆ وەچنگخستنییەک لە تازەترین و سەنگینترین خستنەڕووە وردەکارەکان بۆ قەیرانەکانی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی، بڕوانە:أنتوني غدنز، "علم الاجتماع"، المنظمة العربية للترجمة، الطبعة الأولى، (٢٠٠٥ز)، کە ئەمڕۆ کتێبەکە لە ئەکادیمیا ڕۆژئاواییەکاندا پشتپێبەستراوە، نووسەرەکەشی زانایەکی کۆمەڵایەتی بەرچاو و کاریگەری هاوچەرخانی خۆیەتی.

بەرهەمە هزرییە ڕۆژئاواییەکاندا، هەروەها چوونەناو دۆخێکی دەماودەم وەرگرتنی نەریتی کە بنچینەکانی بوێری توێژینەوە و هەستکردن بە توانای سەربەخۆبوونی تێدا نییە، بەڵگەشە لەسەر هەبوونی بیرکردنەوەیەکی چەماوە و بەزیو و داڕووخاو، هەموو ئەوەش بەهۆی بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاوا و توباویکردن و گۆڕینی بۆ وێنەیەکی وەهمی نموونەیی و نەزانی بە گرفت و قەیرانە ناوخۆییەکانی.

بگرە ڕۆژئاوا لە گوتاری بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددیدا وەک وێنەیەکی بەرجەستەی «ڕزگاربوون» لە دژیەکییەکانی ئەم ژیانە نمایش دەکرێت، وەک ئەوەی کە توانیویەتی چارەیەک بۆ کێشەی بونیادی لێکهەڵاتن بێنێتەدی کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ عەقڵی مرۆڤی سەرقاڵکردووە، لە هەندێک لەو نووسینانەی کە بە دەنگی هەناسەی ئای و وایەکانی عەشق و هەڵوەدایی لەنێوان دێڕەکاندا باس لە توباویەتی ڕۆژئاوا دەکەن، وا هەست دەکەیت کە ئەوە شوێندۆزییەکی سۆزداری دەستەوەستان و واقوڕماوە بەدیار چاوەشینەکانەوە، هەتا ئاستی بەکارهێنانی چەمکی پیرۆزی ئامێز لە وێنەی «پەرجووی ڕۆژئاوایی» کە هەندێک لە نووسەرانی ڕۆژنامەکان دووپاتیدەکەنەوە و مۆرکێکی سرووشتبڕی پێوەیە.

لەڕاستیدا: لە وەختێکی دوور و دێرینەوە کە من لەناو ڕۆژنامەگەری ناوخۆدا چاودێری گوتارێک دەکەم کە ڕۆژئاوا -وەک کلتوور و ڕۆشنبیری و وەک کۆمەڵگا- لە وێنەیەکی تەواو نازانستیدا نمایش دەکات، وێنەیەکی پیاهەڵدانی شاهانەیی زیاتر لەوەی وێنایەکی زانستی بنیادنراو بێت لەسەر توێژینەوەی هێمن و سەنگین، ئەم وێنا ڕۆژنامەوانییە بۆ ڕۆژئاوا، یەک لە دەرکەوتەکانی «بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاوا»یە.

بەبێ گومانیش؛ توێژینەوەی زانستی بابەتیانە لەسەرڕۆژئاوا -وەک کلتوور و وەک کۆمەڵگا- ئەوەت بۆ دەخاتەڕوو کە ئەوێ دیاردەیەکی ئاوێتەی ئاڵۆزە

کە قووڵایی پێشکەوتنی هاوشانە لەگەڵ قووڵایی کارەساتەکانی، بەڵام بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاوا خەریکی کورتکردنەوەی فووپیاکەری و پیاهەڵدانییە کە بووەتە هۆکاری وێرانکردنی بیرکردنەوەی زانستی، لەباربردنی بوێری توێژەر لە ڕەخنەگرتن و لێکدانەوەدا.

وەرگرتنی بنچینەیی ئەم وێنەیە -بە دیدی من- لە دوو چاوگی سەرەکییەوە بنیادنراوە:

چاوگی یەکەم: نامە قوتابخانەییە نووسراوەکان لەسەر «چیرۆکی فەلسەفە»، کە هەنگاوهەڵێنانەکانی مێژووی ڕۆژئاوایی وەک بارمتەیەکی دەستەمۆی ئاماژەکانی فەیلەسووفێک نمایش دەکات.

چاوگی دووەم: «گشتگیرکردنی پێشکەوتن»، واتە: گشتگیرکردنی پێشکەوتنی «تەکنیکی و ئابووری» بەرەو پێشکەوتنی فەلسەفی و ئەخلاقی، توانایەکیش نییە بۆ جیاکردنەوە و بینینی جیاوازییەکان و گەیشتن لە دیاردەی «جیاوازیی شارستانی» کە مێژووی شارستانییەتەکان جەختی لێدەکاتەوە.

کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی لە ڕووی تەکنیکی و ئابوورییەوە زیاتر پێش دەکەوێت تاکوو لایەنی فەلسەفی و ڕەوشتی، ئەم مەودا هەڵکشاوە لەنێوان هێڵی «تەکنیکی» و هێڵی «فەلسەفی»دا بۆشاییەک دەخوڵقێنێت کە باهۆزی هەڵگەڕاوەی لەنێوبەری بەدوودا دێت.

فڕۆکەی پێشکەوتوو مانای دانایەتی فڕۆکەوانەکەی ناوی نادات، دەکرێت لەدەست فڕۆکەوانێکی سەرشێتدا بێت کە بەرەو کارەسات و تێکشکانی بەرێت.

نموونەیەک لەسەر ئەم دژیەکییە وەربگرە: چۆن دەکرێت کەسێک باوەڕبکات کە توانایەکی زەبەلاحی ئابووری و تەکنیکی و سەربازی ئیمپڕاتۆرییەتێک لە وێنەی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کەسێکی لاوازی تواناسنووورداری وەک

بۆشی کوڕ بۆ ماوەی دوو گەڕی سەرۆکایەتی بەڕێوەی ببات!؟

تەنیا شتێک کە یار و نەیاری «بۆشی کوڕ» لەسەری کۆک بوون بریتیبوو لە «سنووردارییەتی و کەمی توانا کەسییەکانی»، ئەمە قەیرانێکی ڕوون لە «هاوتەریببوونی بوارەکان»دا لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی بەدیاردەخات، بە سروشتی حاڵیش هەندێک لە نووسەرانی عەرەب -هەمیشە- هەوڵیانداوە لێکدانەوەیەکی عەقڵانی بلیمەتانە بۆ هەڵسوکەوتەکانی «بۆشی کوڕ» بدۆزنەوە، بەڵام بوونەتە مایەی گاڵتەجاری، کە زیاتر لە پاساوی دەستوپێوەندەکانی دەوڵەمەندێکی شێتی ناتەواو دەچوو، یاخود پیاهەڵدانێکی ڕازیکەرانە بۆ ماسوولکە هەڵاوسەکانی یاریزانێکی گەمژە.

ئامانجیش لێرەدا: بانگەوازێکە بۆ وروژاندنی سەربەخۆبوون و خوێندنەوەی زانستی بابەتییانە بۆ کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی، دیاریکردنی وردەکارانە بۆ ناوچەکانی داهێنان و ناوچەکانی داکشانی و وریابوون لە دیاردەی «بەڕۆژئاواکردنی ڕۆژئاوا» کە یەکێکە لە جێبەجێکارییەکانی جوگرافیای خەیاڵکراو، بەو شێوەیەی کە لە دواییدا دەربازمان بکات لە کردنی ڕۆژئاوا بە وتەی چاوگ -مەرجەع-، هەروەها بیکاتە «بابەتێک» بۆ توێژینەوە، نەک سەرچاوەیەکی پێشەنگی و وەرگرتن.

# ١- لە پشت مرۆڤاندنی کەلەپوور-توراسەوە

جەنگی هزریی ئەمڕۆ بەپلەی یەکەم جەنگی لێکدانەوەیە، لە دەوری ئەم دوو پرسیارە دەخولێتەوە چۆن لە دەق تێبگەین؟ چۆن لە هەڵگرانی دەق تێبگەین؟

جا لێکدانەوەی دەق و لێکدانەوەی مێژوو، خەریکە دەبنە تەوەری وتووێژی هاوچەرخی ڕۆشنبیری، هەروەها نزیکە ڕووبەڕووبوونەوەی هزری تەنها لە دەوری نموونە لێکدانەوەیییەکان و تەکنیکەکانی لێکدانەوە بسووڕێتەوە.

لە قۆناغی هزری پێشوودا -وەک پێشتریش ئاماژەی پێدرا- توێژی ڕۆشەنبیری نەیار بە ئیسلام و بانگخوازانی، ڕەخنە و هێرشیان بۆ سەر خودی ڕوانینی ئیسلامی خۆی بوو کە لێشاوێکی گەورە لە گوتار و کتێب هەبوون کە بە ئاشکرا ڕەخنەیان لە وێنا ئیسلامییەکان دەگرت لە وێنەی تەحکیم-بەداوەرکردنی شەریعەت و باڵاپۆشی و جیهاد و جگە لەوانەش لە چەمک و بەها قورئانییەکان، بەڵام سوپرایزەکە ئەوە بوو کە ئاراستەی ئیسلامی تۆکمەتر هاتەدەست و چەسپان، هەروەها لاوانی کۆڵەگەی ئیسلام پێداگر و قایلتر دەبوون بە دوژمنایەتی ئەو توێژەڕۆشنبیرییە نەیارانە بەرانبەر بە ئیسلام و وەحی و ڕێنماییە نەبەوییەکان.

ئەم توێژە ڕۆشەنبیرە نائاهەنگانە بەڕوونی هەستیان بە مایەپووچبوونی میللی خۆیان کرد، بەڵکوو دووچاربوونیشیان بە حاڵەتێکی پشتگوێخستنی کۆمەڵایەتی کە هەوڵی دەربازبوونیان لێیدا لە ڕێگای خزانە ناو پرۆژەکانی دەسەڵاتەوە و بەقوربانیکردنی هەر ناوەڕۆکگەلێک کە بە ئاراستەی سەربەخۆیی سیاسی پاڵ بنێت، بگرە هەندێکجار -زۆر زۆر بەداخەوە- کار دەگاتە ئەوەی ئەم خۆزاڵکردنە ناپاکە وەک جۆرێک لە زیرەکی و لێهاتوویی تەماشا بکرێت لە بەڕێوەبردنی

ڕاجیایی هزریدا.

لە ئەنجامی ئەم پشتگوێخستنەی کۆمەڵگەش بۆیان توێژە ڕۆشنبیرییە ناهەموارەکان بەرەو بژاردەیەکی ڕۆشنبیری دیکە چوون، کە وازیان لە دووبارە جوینەوەی ڕەخنەی بێزراو لەسەر حاکمییەت -داوەرییێتی و باڵاپۆشی و جیهاد و فرەژنی و ئەحکامی زیممییەکان و ئەوانە هێنا بەرەو هەوڵی پچڕاندنی پەیوەندی لەنێوان ئەستوونەکانی لاوانی ئیسلامی و نموونە توراسی و هاوچەرخە ئیلهامبەخشەکانیاندا، لە ڕێگای گوتاری مرۆڤاندنەوە.

مرۆڤاندنیش لە گوتاری عەرەبی ئەمڕۆدا لە دوو چوارچێوەدا بەکاردێت:

چوارچێوەی یەکەم: مرۆڤاندنی پەیوەندییەکانە، بە واتای ئەوەی کە پەیوەندی و ڕووانینەکانمان ئەمڕۆ بۆ جیهان پەیوەندیگەلێکی مەدەنی دامەزراو بێت لەسەر بەها مرۆییە هاوبەشەکان، نەک لەسەر بنەمای شووناسی ئایینی، ئەمەش لە بەشێکی دواتردا پێی دەگەین.

_چوارچێوەی دووەم: مرۆڤاندنی توراسە، بە واتای: دووبارە لێکدانەوەی توراس و هێنانەئارای چەمکە جەوهەرییەکانی و جووڵانەوە ناوخۆییەکانی، بە لێکدانەوەیەک کە هەر پاڵنەرێکی ئەخلاقییان ئایینی یان هەر باوەڕێکی کەسی بەدووربگرێت و بەشوێن پاڵنەرە ماددییەکان _ئیدی سیاسی بن یان ئابوورییان نەتەوەیی یاخود جگە لەوانەش_دا بگەڕێت، لە ڕێگای بەکارهێنانی دەزگا چەمکییە ئەنسرۆپۆلۆژییەکانەوە و لەژێر دروشمی خۆپڕچەککردندا بە ئامڕازەکانی زانستە هاوچەرخە مرۆییەکان، هەندێک لە فرانکفۆنییە عەرەبەکانیش کاتێک باس لە بەکارهێنانی ئامڕازەکانی زانستە مرۆییە هاوچەرخەکان دەکەن، ناوبڕێکی مێژوویی بۆ زیاددەکەن کە دەڵێن: زانستە مرۆییەکانی پاش ساڵی (١٩٥٠ز)، ناشزانم ئەم مێژوو وەستاندنە بۆچی؟

بەڵام بەهەرحاڵ ئەوە بانگەشەیانە.

بەو واتایەی کە: پێکهاتنەکانی توراس وەک ئەوە لێکبدرێنەوە کە لەژێر کاریگەری ململانێی دەسەڵات یاخود شانکێشانکێی سەرداریيەتی یاخود ڕاگرتنی ئاپۆڕای جەماوەر یاخود ئامانجی بازرگانی و گرێبەستی بەبازاڕکردندان، هەر لە عوسمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە، هەتا دەگاتە شافیعی و لەلای بانگخوازە هاوچەرخەکان دەوەستێت، سەرجەم دەرکەوتەکانی گوتار تەنها بە هاوسەنگییە سیاسییەکان و باڵانسە کۆمەڵایەتییە پەتییەکان لێکبدرێنەوە.

بەم شێوەیە فوو بە شاوری مرۆڤاندندا دەکرێت لە ساتی دەرچوونی فیشەکی مەرگەوە بۆ ناو کەلەی لێکدانەوەی ئەخلاقی و ئایینی، جا کاتێک ڕووداوەکان بە شێوەیەکی ئاراستەکراو کۆدەکرێنەوە و بە کۆمەڵێک پاڵنەری سیاسی و زەمینەی کۆمەڵایەتییەوە دەبەسرێنەوە، پێگەی ڕەمزەکانی ئیسلامیش ئیدی دەتوێتەوە، متمانەش نامێنێت بەوەی کە دەیڵێن و هەروەها ئەوەشی هێناویانە و هەڵیانگرتووە بەسووک دەپێورێت، هەڵوێستە پاڵەوانانەکانیشیان تەنها وەک خۆکوژی و خۆبڕییەک بۆ چاوتێبڕی و مەرامەکانی دڵیان لێی دەڕوانرێت. ئاوا کانییەکان لە تینووان چۆڵدەکرێن و فرمانیان دوایی دێت لە هەستان بە ڕۆڵی خۆیان لە بارگاویکردنەوەی لاو و پڕچەککردنی بە ناوەڕۆکە ئیسلامییەکان.

مرۆڤاندن لە گوتاری عەرەبی هاوچەرخدا چەمکی مرۆڤاندنی -بە کرداری- بە تەواوی واتای فراوانییەوە لەخۆنەگرتووە، ڕاستە کە لە بەرانبەردا کۆمەڵێک زێدەڕەوی ساویلکانە هەن لە وێناکردنی مێژوو بە شێوەیەکی ترنسندنتالی وەک ئەوەی چەند پێدراوێکی باڵا بێت کە هیچ پەیوەندییەکیان بە پێکهاتەی مرۆییەوە نییە، بەڵام خۆ ئەمەش مانای هەڵگەڕانەوە نییە بەرەو ئاراستەکەی دیکە.

عەلمانییە عەرەبەکان زۆر بۆڵەیان لەوە دێت و لەلایان دوورە کە ئایین

و ئەخلاق و باوەڕ بکرێت ببنە بزوێنەر بۆ مێژوو، بەڵکوو هەمیشە مێژوو بە بارمتەی پاڵنەرە غەریزییە پەتییەکان دەبینن، ئیدی ماددی بن، یان سەرداری و سەرکردەیی، یاخود جگە لەوانە. ئیدی گوتاری ئایینی و ڕەوشتیش تەنها بونیادێکی ڕاگەیەنراون لە ڕوواڵەتدا کە پاڵنەرە ڕاستەقینەکانی ژێرەوە دەشارنەوە.

بەڕاستی کە مرۆڤاندنی عەرەبی گەیشتووەتە چەند قۆناغێکی دارزاوی وەهاوە کە شایانی شین بۆکردنە، سا جەنگی ئەبووبەکر لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان هەوڵێکی ماددی بوو بۆ پڕکردنەوەی گەنجینەکان و عوسمان و عەلی تەنها چاویان بڕیبووە دەسەڵات، فوتووحاتی ئیسلامی هەمووی تەنها جووڵانەوەی فراوانخوازی ئیمپڕاتۆرییانە بووە، شافیعیش بەشێوەیەکی شاراوە گرێی دەروونی ڕێگریکردنی هەژموونی سیاسی هەبوو لە هەژموونە زانستییەکەی خۆی و موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب هەڵپەی جوگرافیایەکی زیاتری بووە، باووباپیرانی پێشەنگانی جووڵانەوەی ئیسلامی زۆر بەئاشکرا هەوڵی گەیشتنە دەسەڵاتیان دەدا، گشت بانگخوازانی هاوچەرخ بەشوێن بریقەی ڕاگەیاندن و کەناڵە ئاسمانییەکانەوەن.

حاڵەتی مایەپووچی گوتاری عەرەبی هاوچەرخ ڕوانینێکی بەزەیی و هاوسۆزییانەی پێویستە، هەروەها سوپاسکردنی پەروەردگاریش لەسەر ئەوانەیە کە دووچاری ئەم خوێندنەوە نەخۆشیناوییە هەوەسبازانانە نەهاتوون!

-جارجارێک- لێم دەبێتە پرسیار کە بۆچی عەلمانییە عەرەبەکان وابیرناکەنەوە کە ئەو ڕەمزانە دەکرێت پاڵنەری ڕۆحی و ئەخلاقیان هەبێت؟ بەتایبەت کە زۆرێکیان ئازادی و بگرە گیانی خۆشیان لەسەر کارەکانیان داناوە، بەڵام لەوانەیە کەسێک کە خۆی تامی پاڵنەری ئەخلاقی لە خودی خۆیدا نەچەشتبێت، نەتوانێت لە هەڵسوکەوتی ئەوانی دیکەشدا بیخوێنێتەوە.

سەرەڕای ئەوەش کە ئەم لێکدانەوە لەلای عەلمانییە عەرەبەکان دەرخەری نەزانی و نەناسینێکی تەواویانە سەبارەت بە خودی چەمکی مرۆڤاندن بە واتا فراوانەکەی، کە مانای مرۆڤاندن بریتییە لە ڕوانین لە مرۆڤ وەک مرۆڤ، کە بێ شک یەک لە بەهێزترین پێکهاتەکانی مرۆڤ، پێکهاتەی ئایینی و ئەخلاقی و ڕۆحییە، جا خوێندنەوەی هەندێک لە پێکهاتەکانی مرۆڤ و بزرکردنی هەندێکی تری دروستە ناوی لێبنرێت مرۆڤاندن، یاخود ناوبنرێت کورتکردنەوە و لێبڕینی مرۆڤ؟

زۆر بەکورتیش بڵێم کە تەکنیکەکانی مرۆڤاندن گۆڕاون بۆ گوتارێکی گومانخراپی مەنهەجی ڕێکخراو، نەک ئەوەی تەنها پێخلیسکانێکی ڕەفتاری بن، لەدواییشدا زۆر ڕووقایمانە ناوی لێ دەنێن لێکدانەوەی زانستی! هەربۆیە: لەمڕۆدا دەبینرێت هەرکەسێک کە ڕۆچووبێت لە پڕۆژەکانی لێکدانەوەی نوێگەرییانە بۆ توراس کە گرێی دانانی پاڵنەری سیاسییان هەیە بۆ هەر ڕووداوێک، دڵی پڕ لە تین و کینە دەبێت بەرانبەر بە چاخە پێشینە چاکەکان، کە پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَالَّذينَ جاءوا مِن بَعدِهِم يَقولونَ رَبَّنَا اغفِر لَنا وَلِإِخوانِنَا الَّذينَ سَبَقونا بِالإيمانِ وَلا تَجعَل في قُلوبِنا غِلًّا لِلَّذينَ آمَنوا رَبَّنا إِنَّكَ رَءوفٌ رَحيمٌ﴾[الحشر: ١٠] «ئەوانەشی لەپاش ئەوانەوە هاتن دەڵێن پەروەردگارمان لە ئێمە و لەوانەش خۆشبە کە لە پێشمان چوون بە ئیمانەوە، کینە نەخەیتە دڵمانەوە بەرانبەر بەوانەی کە باوەڕدارن پەروەردگارمان کە تۆ لێخۆشبوو و میهرەبانیت."

ئەگەریش بێین ئەو کێشە دەمارییە تاقیبکەینەوە لە لێکدانەوەی ماددی بۆ واقیعی بزووتنەوەی ئیسلامیدا؛ بێگومان کە مایەپووچ دەبێت لە پێشکەشکردنی وەڵامێکی ورد بۆ زۆر لە دیاردەکان.

بەنموونە بگرە، چی وا لە ئیسلامییە هاوچەرخەکان دەکات کە واز لە هەلەکانی وەبەرهێنانی ناو بانکەکانی ڕیبا بێنن و بچنە ژێرباری تێچووی سیستمی

بانکی ئیسلامییەوە؟ چی وا لە کچە لاوێکی ناسک دەکات حیجاب بپۆشێت و بەرگەی ڕوانینە پڕ لە ڕق و توانجەکان بگرێت لە شوێنە گشتییەکاندا؟ چی پاڵ بە لاوێک لە هەڕەتی لاوێتیدا دەنێت کۆمەڵگای خۆشگوزەرانی خۆی کە هاتووان و دانیشتووان بەلێشاو بۆی دێن بەجێبێڵێت و ڕوو لە چیا سەرکەشەکان بکات و سروودی مەرگ بڵێتەوە؟ چی وا لە پیاوانێک دەکات کە هەرچی بەرپرسیارییەتی کۆمەڵایەتی و خێزانییە کەوتووە بەسەریاندا؛ بە نهێنی بەشێک لە مووچە کەمەکانیان ببەخشن بۆ چاپێکی قورئان یان شریتێکی قورئان؟ چی وا لە لاوێکی ناو گێژاوی سالانی چێژ و خۆشی دەکات کە دەست لە سەرقاڵییەکانی لاوانی هاوتەمەنی خۆی هەڵبگرێت و دەمەوبەربانگ بە بزەیەکی شیرینەوە لەلای ترافیکێک خورمایەکی شیرینت بۆ بخاتە نێو زار؟

ئاوا پێیدا بڕۆ، کۆمەڵێک دیمەن زۆر کە کودەتایان بەسەر تیۆرەکانی مرۆڤاندنی عەلمانیدا کردووە و هەوڵە نەگریسەکانی لێکدانەوەیان لە خوێندنەوەی ئەم دیاردانەدا مایەپووچ کردووە! سا هێشتا ئەم قوتابخانەیە نەیتوانیوە کاریگەریی باوەڕ لە دەروونەکاندا وەک بزوێنەرێک بۆ مێژوو حاڵی بێت، هێشتا بەوە نەگەیشتوون کە هیرەقل بە داناییە ڕۆمییەکەی خۆی پێیگەیشت کاتێک درکی بەوە کردبوو کە تینی باوەڕ چی پێدەکرێت وەختێک دەڕژێتە ناو شادەمارەکانی دڵەکانەوە، ئەوەی بوخاری گێڕاوێتیەوە کە هیرەقڵ بە ئەبوو سوفیانی وت: "لێم پرسیت: هیچ یەکێکیان لە ڕقی ئایینەکەی وازی لێ دێنێت لەپاش هاتنە ناوی؟، سا وتت: نەخێر. باوەڕیش ئاوایە، کاتێک کە تینی دەڕژێتە دڵەوە." [١]

دەشکرێت خوێنەر قوتابخانە لێکدانەوەییەکان بخاتە چوارچێوەیەکی مێژوویی، یاخود پەیکەرێکی گشتییەوە کە بتوانین وێنای ئاراستە گشتییەکانی بکەین کە دەگونجێت -بە هەندێک ڕێبەخۆدانەوە- بڵێین کە قوتابخانە

---

(١) "صحيح البخاري": (٧)، و "صحيح مسلم" :(١٧٧٣).

لێکدانەوەییەکان بە سێ قۆناغدا تێپەڕ بوون: قۆناغی نووسەر، قۆناغی دەق، قۆناغی خوێنەر. [١]

جا قۆناغی نووسەر: تێیدا چاودەخرایە سەر زەمینەکانی خودی بەرهەمهێنی دەقەکە و ئەو چوارچێوەیەی تێیدا دەجووڵێتەوە کە قوتابخانە دەروونی و کۆمەڵایەتی و هاوشێوەکانیان لەخۆدەگرێت.

قۆناغی دووەمیش: قۆناغی دەق بوو کە تێیدا چاودەخرایە سەر بونیادی خودی دەقەکە بە چاوپۆشی لە چوارچێوە مێژووییەکەی کە خاوەن کاریگەری هێنانەبوونی ئەم قۆناغەش توێژینەوەکانی زانای زمانەوانی «دی سۆسێر» (١٩١٣ز) بوون، ئەوەش لە پەرتووکەکەیدا لەسەر زانستی گشتی زمان کە لەپاش مردنی لە گوتارەکانی کۆکرایەوە، هەروەها تێیدا کاری لەسەر جیاوازیکردن لەنێوان تەوەری سەنکرۆنی «ئێستایی» و دیاکرۆنی «پەرەسەندنی»دا کردبوو. [٢]

ئیدی ئەم جیاکارییە ڕێبازییە لەنێوان تەوەری ئێستایی و پەرەسەندنیدا ئەو دەلاقەیە بوو کە بیرکردنەوەی بونیادی لێوە هاتەدەر، بە پاڵپشتی بەرهەمەکانی قوتابخانەی شێوەگەری ڕووسی. [٣]

---

(١) نموونەیەکی ئەم دابەشکارییە لێ بڕوانە، لە نووسەرەوە، بەرەو دەق، بەرەو خوێنەر، و پەیوەندی ئەوە بە قوتابخانە ڕەخنەگری و لێکدانەوەییەکانەوە لە:
Bijay Das, Twentieth Century Literary Criticism, Atlantic Publishers &Dist, 5th ed. , 2005, p. 214.

(٢) بۆ قووڵتر وێناکردنی ئەمە، بڕوانە: پەرتووکەکەی «سۆسێر» (الباب الثاني: علم اللسان التزامني السانكروني)، هەروەها (الباب الثالث:علم اللسان التواتري الدياكروني) لە: دي سوسير، "محاضرات في علم اللسان العام"، ترجمة: عبد القادر قنيني، دار أفريقيا الشرق، (١٩٨٧م)، (ص١٧٨، ١٢٨، ١٠٢).

(٣) شێوەیی ڕووسی: قوتابخانەیەکی ڕەخنەگری وێژەییە لە بیست و سییەکانی سەدەی بیستەمدا سەریهەڵدا، کە پەرچەکرداری دژ بە دۆخی ئایدیۆلۆژی ئەوکاتیڕووسیا بوو، کۆمەڵێک لاو دایانمەزراند کە لە دواتردا بوونە ڕەمزەکانی ڕەخنەگری وێژەیی، لە وێنەی «ڕۆمانیاکۆپسۆن» (ک: ١٩٨٢ز) کە کار لەسەر توێژینەوە لە دەقی وێژەیی و بەشە

خێرا خێرا ئەم نموونە زمانەوانییە بەرەو زانستە مرۆییەکانی دیکەش تەشەنەی سەند، بەتایبەت لەسەر دەستی ئەنسرۆپۆلۆژیاکەی «چتراوس» (ک: ٢٠٠٩ز) و نووسینەکانی لەسەر شێوە یەکەمەکانی خزمایەتی، لەپاشان «جاک لاکان» (ک: ١٩٨١ز) لە شیکردنەوەی دەروونیدا و «ئەلتۆسێر» (ک: ١٩٩٠ز) لە لێکدانەوەی مارکسییەتدا، ئەم نموونە توێژینەوەییەش لە لوتکەی هێزی کێشکردنی خۆی نزیکبوویەوە لەو کاتەدا کە مێژوونووسی ناسراوی هزرەکان «میشال فۆکۆ» (ک: ١٩٨٤ز) لە ئارکیۆلۆژێتییەکانیدا سەبارەت بە پەرەسەندنە ئەبستیمییەکان بۆ مێژووی ئەورووپی نزیک بوویەوە.

ڕاستە کە فۆکۆ خۆی لە بونیادگەری دەدزییەوە لەپاش دامرکانەوەی لەدواتردا، بەڵام مێژوونووس و توێژەران دابیان وا هاتووە کە ئەم چوارینەیە -کە ئەوانیش: «چتراوس، لاکان، ئەلتۆسێر و فۆکۆ»-ن وەک دیارترین جێبەجێکارییەکانی بونیادگەری لەبەرچاوبگرن، هەروەک ئەوە لەلای «ڕۆجێ گارودی» دەبینین لە پەرتووکەکەیدا «بونیادییەت فەلسەفەی مەرگی مرۆڤ»، هەروەها کریزوێڵ لە «چاخی بونیادییەت»دا، بگرە تەنانەت لەلای مێژوونووس و ڕەخنەگرانی عەرەبی وەک سەڵاح فەزل[1]، زەکەریا ئیبراهیم[2] و جگە لەوانیش.

گرینگترین دوو توێژەری فۆکۆش لە کتێبەکەیاندا (میشال فوکو مسیرة فلسفية) مەیلیان بەلای لەخۆگرتنی ئەم بونیادییەتییە قۆناغییەوە بووە لە گوتارەکانی فۆکۆدا، کە لەوێدا هەردوو نووسەر ئەگەرە کراوەکانیان بۆ وەسفکردنی گۆڕانەکانی گوتاری فۆکۆ نمایشکردووە: ئایا فۆکۆ لە بونیادییەتەوە

---

پێکهێنەرەکانیدا دەکات لە خودی خۆیدا، لەبری بەکارهێنانی ئایدیۆلۆژی بۆ ناوەڕۆکەکەی، ئەویش بەم واتا و هۆیەوە لەگەڵ شەپۆلی بونیادییەتدا کارلێکی کرد. بۆ زیادبینین لەسەر ئەمە بڕوانە: فكتور أيرليخ، "الشكلانية الروسية"، ترجمة: الولي محمد، المركز الثقافي العربي، الطبعة الأولى، (٢٠٠٠م).

(١) صلاح فضل، "نظرية البنائية"، دار الشروق، الطبعة الأولى، (١٩٩٨م).

(٢) زكريا إبراهيم، "مشكلة البنية"، مكتبة مصر، (١٩٧٦م).

چووەتەسەر هەرمینیۆتۆقیا؟ یاخود فۆکۆ لەیەک لە قۆناغەکانیدا بونیادییەتی بە خاوەنی زۆرترین پێشڕەوییەتی لە زانستە مرۆییەکاندا داناوە؟

ئەوە بوو گەیشتنە سێهەم و کۆتا دانە ئەگەر، ئەویش ئەوەبوو کە فۆکۆ کاریگەر بووە بە دەستەواژەکانی بونیادییەت، بەڵام وەک تیۆرێک بۆ گوتار پێشکەشی نەکردووە، هەردوو نووسەر دەڵێن کە ئەوان ئەم ئەگەرەیان نیشانی خودی فۆکۆ خۆی داوە، وەک دەڵێن: "ئەم ئەگەرەمان نیشانی فۆکۆ دا، هاوڕا بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو هەرگیز بونیادی نەبووە، بەڵام لەوانەیە کە خۆی لەبەرانبەر دڵڕفێنی دەستەواژە بونیادییەکاندا بۆ نەگیرابێت."، بە دیدی منیش، ئەمە دیاردەیەکە کە تازە نییە، کە زۆرینەی بیریاران وەختێک کە کەشتیی تیۆرێکی دیاریکراو نقوم دەبێت، دەبینیت چۆن پێشبڕکێی بازدان و خۆدەربازکردنیانە، وەهاشی نیشاندەدەن کە بە هەڵە سواربوون و بەتەمای کەشتییەکی دیکە بوون و خەڵک باش لێیان تێنەگەیشتووە!

بەناوبانگترین دەقیش کە شۆڕشی ڕێبازی بونیادییەت لەسەر پشتی زمانەوانییەتییەکان بەرجەستە بکات، دەقی گرنگترین باپیرەکانی ئەنسرۆپۆلۆژیایە کە ئەویش «کلۆد لیفی چتراوس»ە، ئەوەش لە ساڵی (١٩٥٢ز)دا لە کۆنگرەی بلۆمینگتۆن لە ئیندیانا، کە «چتراوس» وتەیەکی تێدا پێشکەشکرد کە دواتر خستیە ناو کارەکانیەوە کە تێیدا ئاماژەی بە ئەو گرێی خۆبەکەمبینینە کرد کە زانستە مرۆییەکان لەهەمبەر زانستە سروشتییەکاندا هەیانە، هەروەها چۆن زمانەوانییەتییەکان بە ڕێبازە بونیادییە ورەبەرزە نوێیەکەیان هەوڵی گەیاندنی زانستە مرۆییەکانیان بە زانستە سروشتییەکان دا لە وردییەتی ڕێبازی توێژینەوەدا، لەوێدا کە چتراوس دەڵێت:

"بەدرێژایی چەندەها سەدەی لەمەوبەر زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان خۆیان وا ڕاهێنابوو کە بە چاوێکەوە لە جیهانی زانستە سروشتی و وردەکان بڕوانن

کە جۆرێکە لەو فیردەوسەی کە هەرگیز ئەمان ناچنە ناوی، بەڵام -بەشێوەیەکی لەناکاویش- دەرگایەکی بچووک لەنێوان ئەم دوو مەیدانەدا کرایەوە، ئەوەشی کە کردییەوە زمانەوانییەتییەکان بوون."(١)

ڕاستیش ئەوەیە کە ئەم ڕاگەیاندنە «چتراوسی»یە سەرسامە بە ڕێبازی زمانەوانییەتی بونیادی، بووەتە وەرگرتن و تێهەڵکێشێکی سەرچاوەیی زۆر دەستاودەستکردوو لەنێوان پسپۆڕانی لێکدانەوەی ئەم بازنە و بوارانە و پەرەسەندنی مێژووییاندا.

لەوانەشە کە شۆڕشی خوێندکاران لە فەڕەنسا لە کۆتایی شەستەکاندا -بەپێی هەندێک لە مێژوونووسان- ڕاگەیاندنی یەکەمی کۆتاییهاتنی بونیادییەت بێت کە لە کتێبە گشتگیر و وردەکارەکەیدا لەسەر «مێژووی بونیادییەت» مێژوونووسی هزرەکان «فڕانسوا دۆس» دەرگایەکی بەتەوژم و بەخوڕی سەبارەت بە «شۆڕشی مایۆی ١٩٦٨ز و بونیادییەت» کردووەتەوە، ژمارەیەک تێزیشی تێدا گواستووەتەوە کە وایدەبینن شۆڕشی خوێندکاران (مایۆی ١٩٦٨ز) لە فەڕەنسا ساتی مردنی بونیادییەتی نواندووە، ئەوەش باس دەکات کە ڕۆژنامەی بەناوبانگی «لۆمۆند» ماددەیەکی دوورودرێژی لە (نۆڤەمبەری ١٩٦٨ز)دا بە ناونیشانی: "ئایا بونیادییەت لەسەر دەستی شۆڕشی مایۆی ١٩٦٨ز کوژرا؟"(٢) بڵاوکردووەتەوە.

مردنی بونیادییەتیش -کە هێمای چاخی دەقە- دەستپێکی چاخێکی نوێیە کە تێیدا گرنگیدان گوازرایەوە بۆ خوێنەر بە واتای توێژینەوە لە ماناکانی گوتار، نەک لەسەر بنەمای نووسەر، نە لەسەر بنەمای دەق؛ بەڵکوو بەپێی هۆشیاری خوێنەر، جا -بە پلەیەکی کەم- شیکردنەوەکەی «جاک دری»دا بڵاوبوویەوە، هەروەها جوانییەکانی پێشوازی و تیۆری وەرگرتن لەسەر دەستی ڕەخنەگری

---

(1) Levi-Strauss, Structural Anthropology, Basic Books, 1963, p. 70.

(2) Dosse, History of structuralism,University of Minnesota Press, 1997, vol. 2, p. 105.

ئەڵمانی «هانز یاوس» (ک: ١٩٩٧ز)[١] گەشانەوە، سەردەمی خوێنەریش گەیشتە لووتکەی شیکردنەوە و لێکهەڵوەشاندنی بۆ دەق، هەتا ئەوەی کە یەکێکیان وتی: "دەق لە ڕووی بیرکارییەوە یەکسانە بە ژمارەی خوێنەرانی." [٢]، گرنگ: ساتی ماتەمینی بونیادییەت ساتی لەدایکبوونی تیۆرەکانی خوێنەر بوو.

لە دەریای حەفتاکانیشدا و لە حەوتەم کۆنگرەی نێودەوڵەتی فەلسەفەدا، مێژوونووسی ناسراوی هزرەکان «میشال فۆکۆ» لە پێشەکی و زەمینەسازی گوتارێکی خۆیدا لەسەر تیۆرە لێکدانەوەییەکان لەلای سێکوچکەکە «نیچە، فرۆید، مارکس»دا، بە خەونێک دەستی پێکرد کە مەرگ ڕێگای ئەوەی لێ گرت، کاتێک گوتی:

"لەڕاستیدا، لەپشت ئەم بیرۆکانەوە -کە پێشکەشتانی دەکەم- خەونێک هەیە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دێتەدی، ئەوەی کە جۆرێک لەڕەشنووسی گشتییان ئینسکلۆپیدیا دابنێین، هەرچی تەکنیکەکانی لێکدانەوەیە لەخۆ بگرێت کە دەتوانین لە زمانەوانە ئیغریقییەکانەوە تا دەگاتە ئەم چاخەی خۆمان دەستمان پێی بگات و بیزانین، واشدەزانم کە لەو ڕەشنووسە زەبەلاحە کە سەرجەم تەکنیکەکانی لێکدانەوە لەخۆدەگرێت هێشتا جگە لە چەند بەشێکی کەم هیچی دیکەی لێ تۆمارنەکراوە."[٣]

---

(١) بڕوانە: هانز یاوس، "جمالية التلقي"، ترجمة: رشيد بنحدو، المجلس الأعلى للثقافة، (٢٠٠٤م)، وروبرت هولب، "نظرية الاستقبال"، ترجمة: رعد جواد، دار الحوار، (١٩٩٢م).

(٢) د. الغذامي، "الموقف من الحداثة ومسائل أخرى"، دار البلاد، الطبعة الأولى، (١٤٠٧هـ). کە لەوێدا نووسەر دەڵێت: "دەق لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکدا نوێدەبێتەوە و زیاد دەکات، دەشتوانین بڵێین: کە دەق لە ڕووی بیرکارییەوە یەکسانە بە ژمارەی خوێنەران!، جا ئەگەر یەک هەڵبەست هەزار خوێنەر بیخوێننەوە، ئەوکات ئێمە بەرانبەر بە هەزار دەق وەستاوین، نەک تەنها یەک دەق". (ص٧٣).

(3) Foucault, "Nietzsche, Freud, Marx" , In: Ormiston &Schrift(eds. ) Transforming the Hermeneutic Context, State University of New York press, 1990, p. 59.

ڕاستیش: هەرکەس لە زۆرێک لە تەکنیکە لێکدانەوەییە نوێیەکان وردبێتەوە کە زاڵکراون بەسەر توراسدا، دەبینێت کە زۆر لە دەوری چەمکی دەسەڵات دەسووڕێنەوە، ئیدی دەسەڵاتی سەرداری، یاخود ویستنی دەسەڵات هەروەک لە ئاڕاستە نیچەییەکاندا هەیە، یاخود دەسەڵاتی پارە، یاخود ڕەهەندی ئابووری، یاخود ژێرخانی وابەستە بە شێوازەکانی بەرهەمهێنانەوە، هەروەک لێکدانەوەی مارکسی، یاخود دەسەڵاتی لیبیدۆی فرۆیدی، یاخود جگە لەوانە.

خوێنەری هێمن تێبینی ئەوەش دەدات کە ئەم تەکنیکە لێکدانەوەییانە کە بەشوێن ڕۆڵی دەسەڵات لە پێکهێنانی دەقدا دەگەڕێن بووژانەوەیان بەهۆی ناوازەییەتیانەوە نەبووە، بەڵکوو بەهۆی توندڕەوییەتیانەوە بووە، چونکە ڕۆڵی دەسەڵات و پارە و سێکس و جگە لەوانە لە پاڵنەرەکان لە پێکهێنانی دەق و مێژوودا پێدراوگەلێکن کە لەپێشدا ناسراون و تازە نین، بەڵام ئەوەی کە ئەم دەنگدانەوە و ئەسپتاودانەی بۆ خستە ڕێ، بریتی بوو لە توندڕەوبوونی لە کردنی ئەم فاکتەرانە بە فاکتەری یەکلاکەرەوە.

جا وەحی خودایی و زانایانی توراسیش لەدوای ئەو، هەر زوو ئەم هەژموونانە و جگە لەوانەشیان باس لێکردووە، بەڵام قەبارەی هاوسەنگی خۆیان پێداوە و لە ڕەفەی گونجاودا دایانناوە، زێدەڕەوییان نەکردووە لە بەدواداچوونی پێکهاتنەکانی مێژوودا لەسەر بنەمای ئەوە، ئەم جیاوازییەش لەنێوان دوو وێناکەدا تەنها ڕەنگدانەوەی جیاوازی نێوان بونیادی میانڕەوی زانستی شەرعی و بونیادی هەڵاوساندنی تیۆرسازی ڕۆژئاواییە کە جێبەجێکاری زۆری هەن.

لەو فەرموودە بەناوبانگەدا کە تورموزی و جگە لەویش گێڕاویانەتەوە، زیاد لە یەکێکیش لە زانایانی (حوفّاظ) بە سەحیحیان داناوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هیچ دوو گورگێکی برسی کە بەردرابێتنە نێو مەڕوماڵاتێکەوە؛

زەرەریان لەسەری زێدەتر نییە لە زەرەر و تێکدان و خراپکردنی هەڵپەی مرۆڤ بۆ پارە و پێگە لەسەر ئایینەکەی."[١]

جا پێغەمبەر (ﷺ) هەژموونی پێگە و هەژموونی سامان و ماڵی لە پێکهێنانی کەسایەتی تاکدا باس لێ فەرمووە، بەر لەم فەرموودەیەش قورئان خۆی ئاماژەی بەم دوو هەژموونە کردووە، پەروەردگار لە هاوەڵانی نەگبەتی لای چەپەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێن: ﴿ما أَغنى عَنّي مالِيَه(۞) هَلَكَ عَنّي سُلطانِيَه﴾[الحاقة: ٢٨ - ٢٩] «سوودی پێ نەگەیاندم ماڵ و سامانم. لێم وێران بوو هێز و دەسەڵاتم.»

لە شوێنێکی دیکەشدا پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بە دەسەڵاتی پارە و دەسەڵاتی غەریزەی سێکسی کردووە، لەوێدا کە هەردوو شێخ (بوخاری و موسلیم) لە عومەرەوە لێوەی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «هەرکەسیش کۆچی بۆ ماڵێکی دنیا بێت تاکوو بەدەستی بێنێت، یاخود ئافرەتێک کە مارەی ببڕێت، ئەوا کۆچەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆی کردووە.»[٢]

زانایانی تەزکیە و بژار و سولووکی ئیسلامیش گەلێک باسیان لە تانەکانی یەکلابوونەوە کردووە، درێژەیان داوەتە باسی ئەو هەژموونانەی کە کاریگەرییان لەسەر مەعریفە هەیە و لایەنگیری شاراوەی ناو دەروونییانە دەخوڵقێنن، لەوێنەی هەژموونی باووباپیران و هەژموونی خۆچوواندن بە هاوڕێیان و هەژموونی خاتر و پێگە و زۆری جگە لەوانەش، نموونە لەوانە ئەوەی کە پێشەوا ئیبن قەییم بەشێوەیەکی دوورودرێژی ڕێکخراو و وردەکار لە پەرتووکەکەیدا (مفتاح دار

---

(١) سنن الترمذي، (٢٣٧٦)، واتای فەرموودەکەش ئەمەیە کە: "هەڵپەکردن بۆ پارە و سامان و بۆ پایە و خاتر و سەرداریيەتی؛ ئایینی مرۆڤ تێکدەدەن و زەرەرباری دەکەن، خراپتر لە تێکدان و زەرەربارکردنی دوو گورگی برسی لەناوڕانەمەڕێکدا!"، بۆ بەڵگە و شاهێدی زیاتری شەرعی و پێشینی (وتەی پێشین) سەبارەت بەم دوو پاڵنەرە -سامان و خاتر- دەتوانیت بچیتە خزمەت لێکدانەوەکەی ئیبن ڕەجەبی گەورە زانا بۆ فەرموودەکە: "شرح حديث ما ذئبان جائعان"، تحقيق: بدر البدر، دارالفتح.

(٢) "صحيح البخاري": (١)، و "صحيح مسلم": (١٩٠٧).

السعادة) خستوویەتیەڕوو.[١]

بەڵکوو ڕەخنەگری ناسراوی سعودی (عبد الله الغذامي) لە پەرتووکەکەیدا «تاوان و تەکفیر» کاتێک هەندێک لە بنەماکانی سیمیۆلۆژیا «زانستی ماناگەیێنی» ڕاڤە دەکاتەوە، شتێک لە پێشەوا ئەبوو حامیدی غەزالییەوە دەگوێزێتەوە، لەپاشان بەراووردی بەوە دەکات کە سیمیۆلۆژیای نوێ پێگەیشتووە، وا هەستدەکات کە سیمیۆلۆژیای نوێ نزیکە بوترێت کە پاش غەزالی هیچکی زیادنەکردووە و پێشنەکەوتووە! کە (د. الغذامي) دەڵێت:

"ئەمەیە تەکنیکی ئاماژە کە غەزالی بەبێ ناوهێنانی بە ئاماژە شیکردووەتەوە، بەڵام شیکردنەوەکەی ئەو بۆی بە چەندەها سەدە کەوتووەتە پێش «زانستی سیمیۆلۆژیا»وە کە هێشتاش ئەم زانستە هیچ ڕاڤەیەکی زیاتری لەوەی ئەبوو حامید نەهێناوە.[٢]

لەڕاستیشدا: ئەوەی کە غەزامی لە غەزالییەوە گوێزاویەتییەوە بەتەنها هەر غەزالی نەیوتووە، بەڵکوو لەلای جگە لەویش لە زانایانی توراسیش بەربڵاوە، بگرە هەندێکجار بە وردەکاری زیاتریشەوە، بەڵام لەوانەیە بەهۆی کەم شارەزایی د. غەزامی بە کتێبەکانی ئوسوول و کەلام وای زانیبێت کە تەنها غەزالی لەوەدا پێشکەوتووە.

مەبەستیش لێرەدا: باسکردنی ئەوەیە کە ئەم تەکنیکە لێکدانەوەییە نوێیانە بەهۆی تازەبییەتییانەوە نییە کە ئاوا گێژەڵووکەی ڕاگەیەنرانیان بەدەستهێناوە، هێندەی بەهۆی زیادەڕەوی کردنیانەوەیە لە گۆڕینی فاکتەری سروشتی بۆ فاکتەرێکی یەکلاکەرەوە و ڕەها کە وەڵامی هەموو دیاردەکان دەداتەوە. بە واتایەکی دیکە: تیۆری ڕۆژئاوایی -زۆرجار- لەسەر گۆڕینی فاکتەری

---

(١) ابن القيم، "مفتاح دار السعادة"، طبعة المجتمع: (١/٢٦٤).

(٢) د. الغذامي، "الخطيئة والتكفير"، النادي الأدبي، الطبعة الأولى، (١٤٠٥ك)، (ص٤٥).

هاوبەش بۆ تاکە فاکتەرێک وەستاوە، جا بەهۆی دەرچوونی لە بیرکردنەوەی زانستی سروشتی، سەدا و زایەڵەی بۆخۆی هێناوەتەدی، واتە لەبەرچاوگرتنەکانی بەناوبانگی دەخاتە پێش لەبەرچاوگرتنەکانی زانست.

پێشتریش ئاماژەی پێدرا کە دوو ئامرازی خوازراوی ناو گوتاری مرۆڤاندنی توراس بریتین لە: «بەسیاسیکردن» و «قەرزاربارکردنەوە»، بگرە نزیکە بنە تەوەری گشت ئەو تێزە لێکدانەوەییانە، بەشێوەیەک کە سەرجەم ئەو ئەنجامانەی بۆ دەگەڕێتەوە.

شایانی باسیشە کە: ئەسڵەن بنچینەگەلی سەرەکی ئەو لێکدانەوانە کۆمەڵێک تێزی ڕۆژهەڵاتناسی دێرینن کە گەورە ڕۆژهەڵاتناسەکان وتوویانەتەوە، بەڵام ئەو ڕۆڵە ناوەڕۆکییەی کە فڕانکفۆنییە عەرەبەکان بینیویانە، ڕۆڵی ئەو شرۆڤەکارە عەرەبانەیە کە دووبارە دارِشتنەوە و ڕێکخستنەوەیان بۆ ئەو ئەنجامانە کردووە و جۆری جیاواز و فرەیان بۆ هێناوەتەوە، زۆرینەی ئەوەشی کە شرۆڤەکارانی عەرەب زیادیان کردووە بۆی تەنها بە ئیلهام وەرگرتنی نموونە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بووە لە جێبەجێکاری نوێدا، یاخود وەدەرخستنی نموونەی تازە بووە بۆ ئەو تیۆرە لێکدانەوەییانە، بەڵام دەربازبوون لە تەوقی ئەو میکانیزمە ڕۆژهەڵاتناسیانە و بەدەرخستنی ڕۆڵی دەق لە پێکهێنانی ژیانی گشتی لەناو مێژووی ئیسلامیدا؛ ئەمەیان تێدا دەگمەنە.

لە واقیعیشدا: ئامرازی «قەرزابارکردنەوە» بەواتای بەدواداچوونی بوون و ئامادەیی ئەوانی دیکە لەناو خوددا، واتە: دۆزینەوەی شوێنەواری کەلتوور و ڕۆشنبیرییەکانی پێشوو لەسەر ڕۆشنبیری دواتر؛ لە بنچینەیدا بەشێکە لە سیستمی ئامرازە زانستییەکانی لێکدانەوەی گوتار کە داهێنەرانی ناو توراسی ئیسلامی زۆر بلیمەتانە بەکاریان هێناوە، بەڵام بەبێ زێدەڕەوی و زۆرلەخۆکاری و پەرگیری، بەڵکوو بە لەبەرچاوگرتنی وەک فاکتەرێکی ناو تۆڕێکی ئاڵۆز

و کەڵەکەبوو لە فاکتەر، نەک وەک تاقە فاکتەر، نە بە زۆرلەخۆکاریش بە گەڕاندنەوەی هەموو شتەکان بۆ ئەوێ.

جا توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان -بەشوێن ئەویشدا شرۆڤەکارانی لە فرانکفۆنییانی عەرەب- هەوڵی گەڕاندنەوەی سەرجەم چەمکە تەشریعی و چوارچێوەییەکانی توراسی ئیسلامی دەدەن بۆ کەلتوورەکانی پێش ئیسلام و وێناکردنی کەلەپوور وەک حاڵەتێکی قەرزکردنی کەلتووری و هەروەها وەحیش لەوە دووردەخەنەوە کە چاوگێک بێت بۆ ئەو وێنایانە.

لەکاتێکدا زانایانی توراسی ئیسلامی بەم شێوەیە زێدەڕەوی و توندڕەوانە نەبوون، بەڵکوو زۆر باسیان لەوە کردووە کە پێشەوایان ناویان لێناوە «زانستی دێرینەکان»، ڕەخنەیان گرتووە لە هەڵێنجانی هەندێک لە چەمکەکانی زانستی کەلام و ئوسوولی فیقھ سۆفیگەری لێیەوە، بەڵام وەحی و دەقیان لە ڕۆڵی گەوهەری خۆی دوورنەخستووەتەوە لە پێکهێنانی کەلەپووردا، ئەمەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە پێشتریش ئاماژەی پێدرا لە جیاوازی نێوان بونیادی میانڕەوی ئیسلامی و بونیادی زێدەڕەوی مەعریفی ڕۆژئاواییدا.

ئەم بەراووردەش بەڕوونی دەریدەخات کە ئەو ڕاستییەی لەلای ئەم لێکدانەوە ڕۆژهەڵاتناسییانە و شرۆڤەکارانی لە عەرەب هەیە، پێشتر زانایانی توراسی ئیسلامی چەسپاندوویانە، ئەوەشی زیاد لەسەر ئەوە وتبێتیان زۆرینەی ئەگەر و سیناریۆی بەتاڵە، کە -زۆری- پشتی بە لێکچوونی فیلۆلۆژی بەستووە نەک تۆماری مێژوویی.

لە زۆرترین هۆکارەکانی ئەم گومڕاییە ڕۆژهەڵاتناسییەش، نەبوونی هۆشیارییە بە دوو پێدراوی بنچینەیی: یەکەمیان: ڕۆڵی پەیامبەریەتییەکان و پاشماوەی پەرتووکە ئاسمانییەکان لە پێکهێنانی ڕۆشنبیری گەلانی پێش ئیسلامدا، دووەمینیشیان: قەبارەی چەمکە هاوبەشەکانە لەنێوان پەرتووکە ئاسمانییەکاندا،

هەروەک لە سەحیحدا لێوەی (ﷺ) گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: «پێغەمبەران بران بە هەوێی جیاوازەوە[1]: دایکانیان جیایە و ئایینیان یەکە. »[2]

لەسەر بنەمای ئەم دوو پێدراوەش؛ بەشێکی گەورەی دیاردەی لێکچوونی چەمکی لەنێوان ڕۆشنبیری و کەلتووری گەلانی کاریگەردا بە پەیامبەریەتییەکان، ئەنجامی قەرزکردنی کەلتووری/ڕۆشنبیری نییە، هێندەی ڕەنگدانەوەی سەرچاوەیەکی چەمک لێکن زیکە، بگرە هەندێکجار دەگاتە ئاستی کت و مت هاوچەشنی.

ئامڕازی «بەسیاسیکردن»یش، کە هەڵدانەوە و پشکنینە بەشوێن ڕەهەندە سیاسییەکانی پشت گوتاری توراسەوە کە زۆرینەی ئەگەر و فوولێکردن و گومان خراپییە، کاتێکیش لە دیاردەی لێکدانەوەی ماددی/سیاسی بۆ توراس دەکۆڵینەوە؛ لەتاو ئەو حاڵەتی «دژیەکی لێکدانەوەیی»ە کە زێدەڕەوانی مەدەنییەت تێی دەکەون هەست بە ئازار دەکەین.

کە لە خوێندنەوەی توراسدا مەیلیان بە لای پێشکەشکردنی خوێندنەوەیەکی مێژووییانەیە کە بیرۆکەکان بۆ چوارچێوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی پشتەوە بگەڕێنێتەوە، جا زانستی فیقهـ بە ململانێی هێزەکان لێکبداتەوە و زانستی عەقیدە-بیروباوەڕ بە جەنگی نێوان مەزهەبەکان و زانستی فەرموودە بە هەڵپەی بازاڕ و ڕەواج و زانستی لێکدانەوەی قورئانیش بە بۆماوەی کەلتووری لێکبداتەوە، ئیدی ئا بەم شێوەیە.

لەکاتێکدا لە خوێندنەوەی هزری ڕۆژئاواییدا بە دیدێکی مێژووییانەوە نایخوێننەوە کە ڕەهەندی خودی تێدا بەدەربخات، بەڵکوو بونیادییانە دەخوێندرێتەوە بە لەبەرچاوگرتنی وەک شێوازێکی ڕۆشنبیری کەلتووری پاک

---

(١) هەوێ: ئافرەتانێک کە هاوسەری یەک پیاو بن.

(٢) "صحيح البخاري" :(٣٤٤٣).

و بێگەرد و باڵا و دابڕاو لە چوارچێوەكانی پشتەوە و پاڵنەرە مرۆیی و سیاسی و ڕەگەزپەرەستییەكان، جا تەنها وەک فەلسەفەیەک وێنادەكرێت كە ئامانجی ڕۆشنكردنەوە و ئاشتی مرۆیی و بەختەوەری مرۆڤایەتییە.

بەراووردكرنی ئەم دوو دیمەنەش دژیەكییەكی سەرسوڕهێنمان لە تیۆری لێكدانەوەدا بۆ بەدەردەخات كە ناكرێت شارستانییەتێک تەواو مێژووییانە بخوێندرێتەوە و شارستانییتێكی دیكەش بونیادییانە بخوێندرێتەوە، جا لێكجیایی تەكنیكی لێكدانەوەیی بەو دژیەكییە بەرز و توندە، لایەنگیرییەكی دەروونی قووڵ زیاتر دەردەخات وەک لەوەی گوتارەكە دیدێكی مەعریفی بنوێنێت.

لە ڕووەكانی دژیەكی لێكدانەوەییش -كە پێشتر ئاماژە بە هەبوونی درا لەلای زێدەڕەوانی مەدەنییەت- ئەوەیە كە وای دەبینن لێكدانەوەی سیاسییانە بۆ چەمكەكانی توراس و دانانی ئەگەری ئەوەی كە مامەڵەگەلێكی شاراوەی پشتەوە لە نێوان ڕەمزەكانی كەلەپوور و دەسەڵاتدا هەبووبێت، ئەوە بە گوتارێكی زانستی ڕۆشنگەرانە دادەنێن كە ئامرازە ئەنسرۆپۆلۆژییەكانی لەخۆگرتووە، بەڵام ڕەخنەگرتنی نووسەرانی هاوچەرخ كە ڕووبەڕووی خۆیان دەكرێتەوە: چوونەناو نییەت و نیازی خەڵک و هەڵدانەوەی دڵ و لەتكردنی سینەیە، واتە تۆمەتباركردنی نییەت و نیازی پێشەوایانی چاخە زێڕینەكان بە گوتارێكی زانستی دادەنرێت، بەڵام تۆمەتباركردنی نووسەرانی ماڵەلێدەر و ڕۆماننووسی عەبەسی، چوونەناو نییەتی خەڵكە، ئیدی چ دژیەكییەک لەوە نابووتتر.

پوختەی باسی ئەم بڕگەیەش ئەوەیە كە گەورەترین مەترسی لە مرۆڤاندنی توراسدا -بەواتای لێكدانەوەی ماددی بۆی- گومانی خراپ پێبردن و بێبەهاكردنیەتی. بەشوێن ئەویشدا، دابڕینی لاوی موسڵمانە لە «نموونە ئیلهامبەخشەكان» كە باوەڕ و بەهاكانیان پێ داداوە و لەسەری گۆشیانكردووە، ئیدی پشت دەكات لە كارلێكبوون و هاوئاهەنگی كردن لەگەڵ هەواڵ و

باسوخواسی چاخە زێڕینەکان لە بەندایەتی و زانست و دونیانەویستی و تێکۆشانیاندا، هەتاکوو ئەوەی باوەڕ و زیندەیی بانگەوازی تێدا بمرێت و بژاکێت کە وشکبوونی ڕەگەکان دەستەمۆبوونە بۆ باهۆزەکان.

# ٢- مرۆڤاندنی پەیوەندییەکان

لە گرنگترین بۆچوون و وتەکان لەلای بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی ئەوەیە کە دەڵێن دەبێت کار بۆ مرۆڤ بکەین وەک ئەوەی کە مرۆڤە، بەچاوپۆشی لە شووناس و بیروباوەڕ و ئایینی، بەزۆریش وشەی مرۆڤ بە شێوەیەکی ڕەها و بەبێ هیچ زیادە مەرج و تایبەتمەندییەک دووپات دەکەنەوە، هەندێکیشیان دروشمی برایەتی مرۆڤایەتییانە یاخود ئادەمیزادییەتی هاوبەش یاخود مەزهەبی مرۆڤگەرایی و نموونەی ئەوانە لەو لافیتانەی لە دەوری ئەم واتایە دەسووڕێنەوە هەڵدەگرن.

لە واقیعیشدا: ئەم بانگەوازییە با هەندێک خەڵکیش نیازپاکانە بیڵێنەوە، بەڵام لەناواخنیدا داماڵینی وەسفە قورئانییە بڕاوەکانی حەشارداوە کە پەروەردگار لەسەر بنەمای ئەوانە خەڵکی لێک جیاکردووەتەوە و پەیوەندییەکانی جیاواز داناوە بەپێی جیاوازیان لەوەدا، لەچەشنی وەسف و ئاوەڵناوی (موسڵمان-مسلم) و (باوەڕدار-مؤمن) و (فاسق-لاسار) و (بێباوەڕ-کافر) و (هاوبەشدانەر-مشرک) و (منافق-دووڕوو)، کەچی ئەوان هاتوون هەموو ئەوانەیان لەیەک ئاستدا داناوە لەسەر بنەمای هاوبەشییەتییان لە مرۆڤایەتیدا، تاکوو موسڵمان و جوولەکە و بتپەرەست جیاوازییان لەنێواندا نەبێت مادەم هەموویان بۆ خۆشبەختی مرۆڤایەتی و ئاشتی مرۆیی کاربکەن!

بڵێی پێویستبکات چەند ئایەت لە قورئان دەربێنین هەتا بتوانین بەم بانگەوازە قایلبین؟ بەڕاستی تەنها تێڕامان لەم بانگەوازە و وێناکردنی سەرەنجام و لێکەوتەکانی بەسە بۆ سڵکردنەوە و دوورکەوتنەوەی موسڵمانێک لێی کە خوا بە حەقی خۆی بە گەورە دابنێت.

پەرتووکەکەی پەروەردگار زۆر ڕوون و ئاشکرا ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە مرۆڤ ئەگەر پشتی لە ئیسلام و وەحی کرد ئەوکات ئیدی ڕێزە گەردوونییە سرووشتییەکەی خۆی لەدەست دەدات کە پەروەردگار لەوێدا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَد كَرَّمنا﴾[الإسراء: ٧٠] «بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە نەوەکانی ئادەم ناوە» ئیتر ڕسوا و بێئەرزش دەمێنێتەوە لە دیدی خودا و دیدی باوەڕداراندا، هەربۆیە شەریعەت بە ستایش و بەگەورەدانانی ڕەهاوە بۆ مرۆڤ نەهاتووە، هەروەک هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت وای لێ حاڵیی دەبن، بەڵکوو قورئان لە زۆر شوێندا زەم و سەرکۆنەی مرۆڤی کردووە وەختێک کە شەرەفمەندی باوەڕ دەدۆڕێنێت، لەوەیە ئەوەی کە پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿قُتِلَ الإنسانُ ما أَكفَرَهُ﴾[عبس: ١٧] «لەناوچێت مرۆڤ چەندە سپڵە و ناباوەڕە.»

ئەوەشی کە دەفەرمووێت: ﴿وَكانَ الإنسانُ كَفورًا﴾ [الإسراء: ٦٧] «مرۆڤ زۆریش زێدەڕەو بوو لە سپڵەیی و پێنەزانیدا.»

ئەوەی کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الإنسانَ لَكَفورٌ مُبينٌ﴾ [الزخرف: ١٥] «بەڕاستی مرۆڤ سپڵەیەکی ڕووقایم و ئاشکارە.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الإنسانَ لِرَبِّهِ لَكَنودٌ﴾ [العاديات: ٦] «بەڕاستی مرۆڤ لە هەمبەر پەروەردگاریدا زۆر چاکەلەیادچوو و پێنەزانە.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿كَلّا إِنَّ الإنسانَ لَيَطغى﴾ [العلق: ٦] «نەخێر بەڵکوو مرۆڤ هەمیشە سنوورشکێنی و چاوقایمی دەنوێنێت ...»

هەرکەسێکیش لەو شوێنانەی قورئان ڕابمێنێت کە چەمکی مرۆڤی تێدا هاووە، دەبینێت کە پەروەردگار ڕەگەزی مرۆڤ بە زەم و دژدووانی زۆر سەرکۆنەدەکات، لەپاشاندا باوەڕداران هەڵاوێر دەکات و جیایان دەکاتەوە.

لەوانە ئەوەی کە پەروەردگار سوێند دەخوات کە مرۆڤ لە ڕەنجەڕۆییەکی

تەواودایە، هەروەک دەفەرموویت: ﴿وَالعَصرِ(۝) إِنَّ الإِنسانَ لَفي خُسرٍ﴾ [العصر: ١ - ٢] «سوێند بە کات و زەمانە بەڕاستی کە مرۆڤ لە مایەبەخەساری و ڕەنجەڕۆییدایە.»

لەپاشان بەدەرکردنی باوەڕداران لەم خەسارۆمەندییەی بەدوودا دێنێت، دەفەرموویت: ﴿إِلَّا الَّذينَ آمَنوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ وَتَواصَوا بِالحَقِّ وَتَواصَوا بِالصَّبرِ﴾ [العصر: ٣] «مەگەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کاری چاکەیانکردووە و ئامۆژگاری یەکدیان بە وەرگرتن و لەسەرچوونی حەق و ئامۆژگاری یەکدییان بە ئارامگری کردووە."

هەروەها پەروەردگار ڕەگەزی مرۆڤی بە سیفەتەکانی هەڵپەیی و پەلەپەل و ناجێگیری و ترسوبیم داگرتن و شین و ڕۆڕۆ و ئەژنۆشکاوی و ڕەزیلی وەسفکردووە و لەپاشان باوەڕدارانی جیاکردووەتەوە، وەک دەفەرموویت: ﴿إِنَّ الإِنسانَ خُلِقَ هَلوعًا(۝) إِذا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزوعًا(۝) وَإِذا مَسَّهُ الخَيرُ مَنوعًا(۝) إِلَّا المُصَلّينَ﴾[المعارج: ١٩ - ٢٢] «بەڕاستی کە مرۆڤ شڵەژاو و بێئارام خولقێنراوە. وەختێک شەڕوناخۆشی دێتەڕێ بەشین و شۆڕە و تۆقیوە. وەختێکیش خێری دێتە ڕێ ڕەزیل و ڕێگری خێر و چنگقوچراوە. مەگەر نوێژخوێنان.»

هەروەها پەروەردگار ڕەگەزی مرۆڤی بە سیفەتەکانی بێئومێدی و لاساری و کەلەڕەقێتی و کەشوفشکردن وەسفکردووە و لەپاشان باوەڕدارانی لێ دەرێناوە، هەروەک دەفەرموویت: ﴿وَلَئِن أَذَقنَا الإِنسانَ مِنّا رَحمَةً ثُمَّ نَزَعناها مِنهُ إِنَّهُ لَيَئوسٌ كَفورٌ(۝) وَلَئِن أَذَقناهُ نَعماءَ بَعدَ ضَرّاءَ مَسَّتهُ لَيَقولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئاتُ عَنّي إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخورٌ(۝) إِلَّا الَّذينَ صَبَروا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ أُولئِكَ لَهُم مَغفِرَةٌ وَأَجرٌ كَبيرٌ﴾[هود: ٩ - ١١] «خۆ ئەگەر ئیمەی مرۆڤ سۆز و بەهرەیەک پێی ببەخشین لای خۆمانەوە و لەپاشان لێی بسەنینەوە بەڕاستی ئەوکات زۆر بێئومێد و تroووسکایی لێبڕاو و سپڵە و نارازییە. ئەگەریش نیعمەت و بەخششێکی لەپاش ئازار و زەرەرێکەوە

پێ بچێژین، ئەوكات دەڵێت ئۆخەی ئیتر ڕزگاربووم و شووم و ناخۆشی ماڵاوایی لە من كرد، بەڕاستی كە ئەو بە بەخششەكان دڵخۆش و بەكەشوفش و شانازیكەر و لەخۆگۆڕاوە.»

هەروەها پەروەردگار ڕەگەزی مرۆڤی بە سیفەتەكانی ستەم و نەزانی وەسفكردووە، لەپاشان جیاكارییەكی وردی لەناو ئەم ڕەگەزی مرۆڤی ستەمكارە نەزانەدا بەدوودا هێنا ئەویش لەسەر بنەمای هەڵوێستی ئایینی، كە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا عَرَضنَا الأَمانَةَ عَلَى السَّماواتِ وَالأَرضِ وَالجِبالِ فَأَبَينَ أَن يَحمِلنَها وَأَشفَقنَ مِنها وَحَمَلَهَا الإِنسانُ إِنَّهُ كانَ ظَلومًا جَهولًا(٧٢) لِيُعَذِّبَ اللَّهُ المُنافِقينَ وَالمُنافِقاتِ وَالمُشرِكينَ وَالمُشرِكاتِ وَيَتوبَ اللَّهُ عَلَى المُؤمِنينَ وَالمُؤمِناتِ وَكانَ اللَّهُ غَفورًا رَحيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٢ - ٧٣] «كەچی مرۆڤ (ئەو سپاردەیەی) هەڵگرت بەڕاستی كە ئەو ستەمكار و نەزان بوو. تاكوو خودا دووڕووانی پیاو و ئافرەت و هاوبەشدانەرانی پیاو و ئافرەت سزا و ئەشكەنجە بدات و خودا لە باوەڕدارانی پیاو و ژن تەوبە وەربگرێت و لێیان خۆشبێت كە بەڕاستی خودا لێخۆشبوو و میهرەبانە.»

ئەم واتایەش كە دژدووانی بەرانبەر بە ڕەگەزی مرۆڤ تێدایە و لەپاشان جیاكردنەوەی باوەڕدارانی لەخۆگرتووە، لە پەرتووكی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەكەیدا (ﷺ) چەشنی خۆی زۆرە، بەڵكوو پەروەردگار هەڕەشەیەكی توند و تۆقێنەری لە مرۆڤ كردووە كە دەفەرموێت: ﴿يا أَيُّهَا الإِنسانُ ما غَرَّكَ بِرَبِّكَ الكَريمِ﴾[الإنفطار: ٦] «ئەی مرۆڤ! چی فریوی داویت و لەهەمبەر پەروەردگاری بەخشندەتدا بوغرای كردوویت.»

هەربۆیە؛ كاتێک ئەم ئایەتە بەسەر جێنشینی ڕاشید عومەری كوڕی خەتابدا خوێندرایەوە فەرمووی: "(واللّٰه) تەنها نەزانییەكەیەتی كە فریویداوە" [١] كە

---

(١) ابن أبي حاتم، "تفسير القرآن العظيم"، تحقيق: أسعد الطيب، المكتبة العصرية، الطبعة الثالثة، (١٤٢٤ه): (٨/٣٤٠١٠).

وادیارە عومەر ئەو واتایەی لەو ئایەتانەوە وەرگرتووە کە مرۆڤ بە نەزانی وەسف دەکەن، هەروەک ئاماژە بە هەندێکیان درا.

ئیدی چۆن سەرەڕای هەموو ئەوە بگوترێت: خودا ڕێزی لە مروڤ ناوە و پلەی بەرزکردووەتەوە بە چاوپۆشی لە شووناسە ئایینییەکەی و ئایینەکان کاریگەریی ئەرێنی یاخود نەرێنییان لەسەرڕێز و پێگەی مرۆڤ نییە، هەروەها ئێمە دەبێت کار بۆ چەمکی مرۆڤ بکەین بە چاوپۆشی لە بیروباوەڕی، یاخود هەندێکیان دەڵێن وامەکەن بۆچوونی کەسی بێتە هۆی جیاوازی و دووبەرەکی لەنێوان کوڕەکانی ئادەمدا، ئەریٚ ئەم قسانە سەرپێچی و لە ڕووەستانی ڕاشکاو نین بەرانبەر بە فەرمایشتەکانی (اللّٰه)؟

لە ویژدانیشەوەیە کە بڵێین: هەندێک لەو نووسەرانەی ئەم وتەیە دووبارەدەکەنەوە ئاگاداری ناوەڕۆکەکانی نین کە پێکدژە لەگەڵ تەرازووی خواییدا، ئەو ئایەتە قورئانییانەشیان بە مێشکدا نەهاتووە کە لێوانلێوە لە دژدووان سەبارەت بە ڕەگەزی مرۆڤ لە وەختی بێباوەڕبوونیدا.

یەک لە نووسەرە شەیدابووەکانی شارستانییەتم دێتەوە یاد کە لە دەمێکی پێشوودا ئەوەی دووپات دەکردەوە کە ئیسلامی سیاسی مرۆڤی پەڕاوێزخستووە، لەکاتێکدا کە قورئان ڕێزی لێناوە و پێگەی بەرزکردووەتەوە، واتە خەریکی دەستکاریکردنی خودی بنچینەسازی پرسەکە بوو، بەڵام لەدواییدا کە شۆک بوو بە لێشاوی ئەو ئایەتانەی کە سووکایەتی بە مرۆڤی ناباوەڕدار دەکەن، ئەو ئاوازەی پێشووی گۆڕا، ئیدی دەیوت کە بەڕاستی بەداخەوە مرۆڤ لە دەقە ئایینییەکانی ئێمەدا وەلانراو و پەڕاوێزخراوە و هیچ بەهایەکی نییە، واتە لە سەکۆنەکردنی ئیسلامییە هاوچەرخەکانەوە هەنگاوی بەرەو سەرکۆنەکردنی دەقەکانی قورئان و سوننەت نا.

ئەم تێروانینەی پێشوو تەنها ئاماژەیەکی کورت بوو بە پەیوەندی ئەم ئاڕاستە

مرۆڤگەرابیە بە بنچینەکانی وەحیەوە، لە ڕووی پەیوەندیشی بە واقیعەوە؛ دەبێت ئەوە بڵێین کە ئاڕاستەی مرۆڤگەرا لە ڕاستیدا دیدێکی ڕۆمانسی خەیاڵپڵاوە؛ لە وەختێکیدا کە ئەمڕۆ هیچ دەوڵەتێک نییە لەناو دەوڵەتاندا -بە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییانەوە- کە کار بۆ مرۆڤی ڕەها بکات، بەڵکوو سەرجەم کەلتوور و ڕۆشنبیرییە هاوچەرخەکان بەبێ جیاوازی دەبینیت کە جیاکاری لەناو ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا دەکەن جا لەسەر بنەمایەکی نیشتیمانی بێت یاخود نەتەوەیی، یاخود ڕەگەزی، یاخود جگە لەو پێوەرانەش پێوەری دیکە. باشە چۆن جیاکاری ئەو گەلانە کە لەنێوان هاونیشتیمانی و ناهاونیشتیمانیدا دەیکەن قەبووڵ بکەین، بەڵام جیاکارییەک کە (اللّٰه) لەنێوان موسڵمان و کافریدا کردووە قەبووڵمان نەبێت؟!

لە گرینگترین شوێنەوارە نەرێنییەکانی ئەم بانگەوازییەش ئەوەیە کە پاداشتی خودات پێ دەدۆڕێنن، واتە لەباتی ئەوەی مرۆڤ بە ئومێدی پاداشتی خوایی کار بۆ سوودی موسڵمانان بکات، لەوەودوا ئیتر بە ئامانجێکی مرۆیی پەتی بۆ سوودی موسڵمان و کافریان وەکوو یەک کاردەکات، نەک بە ئامانجی نزیکبوونەوە لە پەروەردگار.

هەرکەسێکیش بۆی گونجابێت، ئەگەر تەنها بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت لەگەڵ هەندێک لەو ڕۆژئاواییانە ژیابێت و سەبارەت بە وێناکانیان بۆ ئامانجی ژیان و واتای بەختەوەری و فرمانی پارە و سامان و بەهای باوەڕ و وردەکاری سیستمی کۆمەڵایەتییان لەگەڵیان دوابێت؛ ئەوکات دڵنیا و یەکلا ئەو وێنەیەی کە قورئان بۆ کەسایەتی بێباوەڕی کێشاوە لای تۆختر دەبێتەوە.

کەسێک ئەو بێباوەڕانە ببینێت لاسکەلاسکیانە بەدووی شوێنێکی حەوانەوە و سفرەیەکی پڕدا بێ گوێدانە ڕێگای پەیداکردن و خەرجکردنی، بەبێ ئاوڕدانەوەیەک لە پاک و پیسی، نیوەشەوانی تاریک و تەماوی قاقای

چێژپەرەستی و ڕابواردنیان دەگاتە ئاسمان و بۆ ساتێکیش خۆیان بۆ دیداری (اللّٰه) ئامادە نەکردووە، سەرسامی چوارپەلی وشک دەکات وەختێک دەیانبینێت و ئەو فەرمایشتەی پەروەردگاری بەیاددێتەوە کە لە سوورەتی موحەممەددا دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذينَ كَفَروا يَتَمَتَّعونَ وَيَأكُلونَ كَما تَأكُلُ الأَنعامُ﴾[محمد: ١٢] «بێباوەڕانیش چێژدەبەن و دەخۆن بەچەشنی خواردنی ئاژەڵان.»

بەڵێ سوێند بە (اللّٰه)، چەندە مەزنە ئەم چوواندنە خودابیە، دیوتە چۆن ئاژەڵان سەریان لەناو گژوگیادا ون دەکەن، بەرزی ناکەنەوە مەگەر بۆ ئەوەی هەناسەیەک بدەن و ڕاست بگەڕێنەوە و دەست پێ بکەنەوە، هیچ خەمێکی دیداری خوایان نییە، بیرناکەنەوە لە بەدیهێنەرێک، یان پێغەمبەرێک، یاخود وەحییەک، یاخود بەندایەتی و زیندووبوونەوە و ئەژماری چاکە و خراپە و سزا و پاداش و داهاتوویەکی ڕۆژی دوایی، هەتاکو ئەوەی لەڕۆژێکدا و لەناکاو بەرۆکیان دەگرێت کە تێیدا تۆڵەی بزنی کۆڵ[1] لە بزنی شاخدار دەسەنرێتەوە، ئەوەیە ژیانی بێباوەڕ.

بنواڕە لە پەرتووکەکەی خودا چۆن دووبارە و چەندبارە ئەم وێناکردن و چوواندنەیان بە ئاژەڵ دووبارە دەکاتەوە، وەک ئاماژەیەک بە هۆ و بنەمای ئەوە کە هەرچی ژیری و هۆش و هەستی ئەم داماوانەیە ڕۆچووە لە پەیداکردن و بەڕێوەبردنی بژێوی ئێستە و داهاتوویاندا و پشتکردنیانە لە هەر هۆیەک کە لەڕێگایەوە خودا و وادەی ڕۆژی دواییان بەبیربێتەوە و خۆیان بۆ ژیانێکی نزیکی داهاتوو ئامادە و سازبدەن، بگرە ئەمجار لە پێگەیەکی خوارتر لە ئاژەڵانیش دایاندەنێت کە لە سوورەتی ئەعرافدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَد ذَرَأنا لِجَهَنَّمَ كَثيرًا مِنَ الجِنِّ وَالإِنسِ لَهُم قُلوبٌ لا يَفقَهونَ بِها وَلَهُم أَعيُنٌ لا يُبصِرونَ بِها وَلَهُم آذانٌ لا يَسمَعونَ بِها أُولئِكَ كَالأَنعامِ بَل هُم أَضَلُّ أُولئِكَ هُمُ الغافِلونَ﴾[الأعراف: ١٧٩] «دڵانێکیان

---

(١) کۆڵ: بێ شاخ

هەیە کە پێی تێناگەن و چاوانێکیان هەیە کە پێی نابینن و گوێیان هەیە کە پێی نابیستن ئەوانە وەکوو ئاژەڵ وان، بەڵکوو لەوانیش گومڕا و سەرگەردانترن، بەڕاستی کە ئەوانەن ناهەست و بێئاگا.»

بۆ جاری سێیەمیش بە هەمان چواندن و هەمان هۆ و هەمان پلەدانانەوە لە سوورەتی فورقاندا دەفەرموێت: ﴿أَم تَحسَبُ أَنَّ أَكثَرَهُم يَسمَعونَ أَو يَعقِلونَ إِن هُم إِلّا كَالأَنعامِ بَل هُم أَضَلُّ سَبيلًا﴾ [الفرقان: ٤٤] «یان وادەزانیت کە زۆرێکیان ببیستن یاخود تێبگەن و ژیر بن؛ ئەوانە لە وێنەی ئاژەڵ نەبێت هیچی تر نین، بەڵکوو ئەوان ڕێلێونبووترن.»

بگرە لە ڕوونکردنەوەی زیاتری سووکی و بێئەرزشی و بێپێگەییاندا دەیانهێنێتە خوارترین پلەی جانەوەرانیش، کە لە سوورەتی ئەنفالدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوابِّ عِندَ اللَّهِ الَّذينَ كَفَروا فَهُم لا يُؤمِنونَ﴾[الأنفال: ٥٥] «**بەڕاستی کە خراپترینی جانەوەران لەلای (الله) ئەوانەن کە بێباوەڕ بوون و ئیدی ئیمان ناهێنن.**»

لە شوێنێکی دیکەی سوورەتی ئەنفالدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوابِّ عِندَ اللَّهِ الصُّمُّ البُكمُ الَّذينَ لا يَعقِلونَ﴾[الأنفال: ٢٢] «بەڕاستی کە خراپترینی جانەوەران لەلای (الله) ئەوانەن کە کەڕ و لاڵ و بێ ژیری و فام و عەقڵن.»

لە شوێنێکی دیکەی پەرتووکەکەیدا پەروەردگار جۆرێک لە بێباوەڕان بە لەوەش سووک و کەمتر دەچووێنێت، کە لە سوورەتی جومعەدا دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ الَّذينَ حُمِّلُوا التَّوراةَ ثُمَّ لَم يَحمِلوها كَمَثَلِ الحِمارِ يَحمِلُ أَسفارًا بِئسَ مَثَلُ القَومِ الَّذينَ كَذَّبوا بِآياتِ اللَّهِ﴾ [الجمعة: ٥] «نموونەی ئەوانەی کە تەوراتیان پێ سپێردرا لەپاشان هەڵیان نەگرت و زایەیان کرد نموونەی کەرێکە بارێک کتێب و پەڕاوی هەڵگرتبێت، خراپترین وێنە و نموونەیان بۆ هەیە ئەوانەی کە ئایەتەکانی خودایان بەدرۆخستەوە.»

ئەوجا پەروەردگار نموونەیەکی زۆر نابووتتری بە جۆرێکی دیکە لە بێباوەڕان

هێناوەتەوە، ئەوانیش ئەوانەن کە گەیشتوونەتە ئاستێک لە زانست، بەڵام ئەو زانستە بۆ باوەڕهێنان بە خودا ڕێنموونی نەکردوون، جا بە شتێکی زۆر ناشرینتر لە سەرجەم ئەوانەی پێشووی چوواندوون، کە لە سوورەتی ئەعڕافدا دەفەرموویت: ﴿وَلَو شِئنا لَرَفَعناهُ بِها وَلكِنَّهُ أَخلَدَ إِلَى الأَرضِ وَاتَّبَعَ هَواهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الكَلبِ إِن تَحمِل عَلَيهِ يَلهَث أَو تَترُكهُ يَلهَث ذلِكَ مَثَلُ القَومِ الَّذينَ كَذَّبوا﴾[الأعراف: ١٧٦] «جا نموونەی ئەو، نموونەی سەگە تێی بخوڕیت و بەردی لێهەڵگریت هەر زمانەلاسکەیەتی وازیشی لێبێنیت هەر زمانەلاسکەیەتی ئەوەیە وێنە و نموونەی خەڵکانێک کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆخستەوە.»

جا هەرکەس پشت لەم ئیسلامە و لە ڕۆشنایی وەحی بکات لەم پلە نزمانەدایە، هەربۆیە پەروەردگار بە پیس وەسفی کردوون وەختێک سینەیان لە ئیسلام تەنگ و چۆڵ بووەتەوە، وەکوو لە سوورەتی ئەنعامدا دەفەرموویت: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهدِيَهُ يَشرَح صَدرَهُ لِلإِسلامِ وَمَن يُرِد أَن يُضِلَّهُ يَجعَل صَدرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّما يَصَّعَّدُ فِي السَّماءِ كَذلِكَ يَجعَلُ اللَّهُ الرِّجسَ عَلَى الَّذينَ لا يُؤمِنونَ﴾[الأنعام: ١٢٥] «جا هەرکەس خودا بیەوێت ڕێنموونی بکات، سینەی بۆ ئیسلام کراوە و فراوان دەکات، هەرکەسیش بیەوێت گومڕای بکات سینەی تەنگ و تەسک دەکاتەوە وەک ئەوەی بە ئاسماندا و بەئەستەم بچێتە سەرەوە، ئاوا پەروەردگار پیسی دەدات بەسەر ئەوانەدا کە باوەڕناهێنن.»

دیسان پەروەدگار ئەم پیسییەی لە سوورەتی یوونسدا لەبارەیانە باس لێ فەرمووە: ﴿وَما كانَ لِنَفسٍ أَن تُؤمِنَ إِلّا بِإِذنِ اللَّهِ وَيَجعَلُ الرِّجسَ عَلَى الَّذينَ لا يَعقِلونَ﴾ [يونس: ١٠٠] «بۆ هیچ نەفسێک نییە باوەڕبێنێت مەگەر بە ئیزن و ڕێپێدانی خودا، پیسیش دەداتەسەر ئەوانەی کە بێ عەقڵ و فامن و دەیکاتە بەشیان.»

چەند سەیر و سەرسامکەرە! چۆن زۆرێک لە داهێنەر و بلیمەتان جانەوەر و ئاژەڵن لە پێوەری خوداییدا!؟ بەڵکوو هەندێکجار هەندێک لەو ئاژەڵانەی لەوان

شەریفتر داناوە! ئەو ئایەتە قورئانیانەی لە تەوژمێکی خەیاڵی دەچن لە چاخی لێکدانەوە فڕانکفۆنییەکاندا، بەڵام ئەوەیە تێزەڕاستەقینەکانی وەحی!

ئەمە هەندێک وێنەی بێباوەڕە لە پەرتووکەکەی خودادا، ئەوەش پلەی بێباوەڕە لە پێوەرە خوداییەکاندا کە تەنها چەند نموونەیەکن هێناومنەتەوە بۆ بەراوردکردن لەگەڵ بیرۆکەی ئاڕاستەی مرۆڤگەرادا کە لە ڕەگەزی مرۆڤدا لەسەر بنەمای کوفر و ئیمان جیاوازی ناکات؛ تاکوو قەبارەی ئەو دژیەکی و بۆشاییەی کە ئەم ئاڕاستە کەساسە تووشی هاتووە بەدەرکەوێت.

چەند هەستێکی ئازاراوییە کاتێک مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت کە پێوەرە تایبەتەکانی شوێنکەوتەی پێوەری خودایی نین، دەبینێت ناوناخ و دڵ و هەستی پڕە لە بەگەورەڕوانین لەوانەی کە خوا سووک و چرووک و بچووکی کردوونەتەوە و بەکەم نوارینیش لەوانەی لای خوا بەپایە و پێگەن!

ڕوخساری دەبێتە نشینگەی هەمیشەیی حەپەسان؛ وەختێک کارەساتی پێکدادانی پێوەر و تەرازووە تایبەت و کەسییەکانی خۆی لەگەڵ پێوەر و تەرازووەکانی خوای خاوەندەسەڵاتی ئاسمانەکان و زەوی دەبینێتەوە!

هەرچەندە ئەو پێوەر و تەرازووە کەسییانە زۆرجار ناوەڕۆکی و داشاردراو و ئاشکرانەکراون، بەڵام ڕاستییەکی ئاڵۆزن کە لە بەرگی مەدەنییەتدا خۆیان دەنوێنن، لە کانی ئارەزووەکان دەخۆنەوە، شوێنەوارەکانیشی لە گەرموگوڕی بەخێرهاتن و مژدە و گەشاوەیی ڕوخسارەکاندا دەردەکەوێت.

ئەمانەن حەقیقەتەکانی وەحی، ئەمەیە حوکم و بڕیاری پەروەردگار، ئەمەشە داوەری خودای زاڵی ئاسمانەکان و زەوی، ئەگەر -هەر بەڕاست- باوەڕمان بە خوا هەبێت و شانازی بە ناوەڕۆکی وتەکانییەوە بکەین و پابەندی فەرمان و ڕاگری پێگەی بەرز و بێپایانی بین.

بەڵام شەرمکردن لە حەقیقەتەکانی وەحی و خۆدزینەوە لێیان لەپێناو خۆبردنەپێشەوە لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و دەستدان لە پشتی سەلیقەی تازەی جەماوەری، ناتوانن هیچێک لە حەقیقەتەکانی وەحی بگۆڕن مەگەر دەستێکی لەرزیو لە شەرما بتوانێت بەر بە خۆر بگرێت.

ئەرێ لەناو ئەوانەدا کە لێمان دەڕوانن ڕوانینی پەروەردگارمان لە هەموویان لەلا بێبایەختر بێت -بەرزی و پیرۆزی بۆ (اللّه)- جا لەبەر دڵی ئەوان پێشێلی وەحی و حوکم و بڕیاری ئەو بکەین، لەکاتێکدا پێوەری ڕاشکاوی باوەڕ دەخوێنینەوە: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤمِنونَ حَتّى يُحَكِّموكَ فيما شَجَرَ بَينَهُم ثُمَّ لا يَجِدوا في أَنفُسِهِم حَرَجًا مِمّا قَضَيتَ وَيُسَلِّموا تَسليمًا﴾[النساء: ٦٥] «... لەپاشان لە دەروونیاندا هیچێک نەبێت بەرانبەر بە حوکم و داوەری تۆ و ملکەچی بن بە تەواوی ملکەچبوون؟!»

لەوەشی کە لەسەر ئەم تەرازووە مرۆڤگەرا بونیادنراوە، ئەوەی کە هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت کاتێک تووشی باسی هەندێک لە کەسایەتییە ناموسڵمانەکان دێت کە خاوەن قورساییەکی مێژوویین جا بەهۆی دەستکەوتێکی زانستی یاخود پێشڕەوییەتی ڕەوتێکی ئاشتییەوە؛ دەبینیت هەندێکیان بوێری ئەوەی هەیە کە بەدڵنیاییەوە بڵێت لە بەهەشتدان و ناکرێت ئەوانە بچنە دۆزەخەوە با بێباوەڕیش بن.

لە ویژدانیشە کە باسی ئەوە بکەم کە چینێک لە ناموسڵمانان هەن کەڕاستاڵن لە هەستەکانیاندا و دڵسۆزن لە بەخشینیاندا کە هیچ بەرژەوەندیەکیان ناوێت یاخود دەمارگیرییان نییە بۆ نەتەوەی خۆیان یاخود بۆڕووپامایی و دەرکەوتنیان حەزکردن بەباسکردنیان بە چاکەیان پێگە و خاترێکی ناو خەڵکی و هێز و ڕێزێک لەو ناوەندەدا کارناکەن، بەڵکوو تەنها ڕەگێکی مرۆڤانەی پڕبەزەیی پەتییە کە پاشماوەی فیترەتی پاکی خوداییە تێیاندا، ئەم چینە لەخۆبڕاو و دوورەش لە نەوسنییەکانی نەفس با کەم و سنووردار و دەگمەنیش بن بە سروشتی حاڵ،

بەڵام هێشتا هەرچی ڕەوشتی دونیا هەیە چ سوودێکیان پێ دەگەیەنێت کە بێباوەڕن بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (ﷺ)؟! هەرچی کاری باشی دونیا هەن چ سوود بە مرۆڤ دەگەیەنن ئەگەر دەروونی بە ملکەچی و دەستەدامانبوون لە بارەگای بەرزی (اللّٰه)دا ئاوەدان نەبووبێتەوە، ئەگەر بە زانستیناسینی پەروەردگار و مامەڵە لەگەڵی بژار نەبووبێت؟!

ئەوە ئەبوو تالیب کە تەنانەت ئازاری یەک موسڵمانیشی نەدابوو، بگرە ئازاری تەنها بۆ بێباوەڕان بوو کە پشت و پەنای پێغەمبەر (ﷺ) بوو سەریخست و پاراستی و چاکەی پێ نواند و خۆشی ویست، بەڵکوو لە دڵی خۆیداڕاستی هەواڵدانی موحەممەدی (ﷺ) سەبارەت بە پێغەمبەرایەتی دەزانی، پێگە و هەندێک لە ئابڕوو و ناوبانگی خۆشی لەڕێی پاراستنی ئەودا دانا، لەو پێناوەشدا ئازاردرا، بێباوەڕان هێشتا بوێری دەمدرێژیان بەرانبەر پێغەمبەر (ﷺ) **نەبوو هەتا ئەبوو تالیب مرد، لەگەڵ ئەوەشدا جێگاکەی لە تەنکە گڕێکی ئاگری دۆزەخدایە، بەڵکوو پەروەردگار ڕێگای ئەوەی بە موحەممەدی برازای (ﷺ) نەدا کە سوودی** لە پارێزگاری ئەو وەرگرتبوو کە تەنانەت نزاشی بۆ بکات، ئەوەی وەک سادەترین وەفایەکیش نەکردە بەشی، تەنها لەبەر ئەوەی کە پشتی کرد لە ملکەچکردنی تەواو بۆ حوکمی وەحی.

ئەوەش عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان کە دوورگەی عەرەبی لێوانلێو کردبوو لە کاری پەتی مرۆیی لە بەهاناوەچوونی لێقۆماوان و داڵدەدانی لاوازان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوودی پێ نەگەیاند؛ چونکە ڕۆژێک لە ڕۆژان لەبەردەستی پەروەردگاردا خۆی نەشکاندەوە هەروەک پێشەوا موسلیم لە سەحیحەکەیدا لە عائیشەوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئیبن جەدعان لە نەفامیدا سیلەی ڕەحمی دەگەیاند و نانی هەژاری دەدا، ئەرێ ئەوە سوودی پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: سوودی پێ ناگەیەنێت، ئەو ڕۆژێک لەڕۆژان نەیوت: پەروەردگارم لە ڕۆژی دوایی و وەختی ئەژمار و پاداشا؛ لە تاوانم

خۆش بە.»[١]

ئەوەش حاتەمی طائی کە شەیدای چاکەکاری بوو بەرانبەر بە خەڵک لە دوورگەیەکی وشک و برینگدا، لە ماڵی تایبەتی خۆی نانی برسی و بەرگی ڕووتی دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا لە تەرازووی خوادا سوودی نەگەیاندێ، تەنها لەبەرئەوەی باوەڕی بە وەحی نەهێنا، هاوەڵانی سیرە دەگێڕنەوە کە وەختێک سەبییەکانی طەیئ گەیشتن، کچەکەی حاتەمی طائی هەستا و بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) وت: «باوکی من لانەی دەپارێست و گیرۆدەی ڕزگاردەکرد و برسی تێر و ڕووتی پۆشتەدەکردەوە، هەرگیزیش دەستی لە ڕووی هیچ خاوەن پێویستییێک نەدەنا، ئەمن کچی حاتەمی طەیئم، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: کیژۆڵە! تەواوی ئەوانە سیفەتی باوەڕدارانی ڕاستەقینن، خۆ ئەگەر باوکیشت موسڵمان بووا، ڕەحمەتمان بۆ دەنارد."[٢]

جا کارەکانی لە تەرازووی خوادا قورساییان نییە، چونکە قەبووڵبوونی ئەم کارانە «معذوق بالإيمان - تەنها بە باوەڕ ناسراون و دەخوێنرێنەوە» بە دەربڕینەکەی ئیبن کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).[٣]

ئەو توێژە مرۆڤانە -سەرەڕای کەمیشیان- ئەوە سوودیان پێ ناگەیەنێت کە باوەڕیان بە بنچینەی بوونی خودا هەیە، یاخود ئەوەی کە لە بەندایەتیدا وەک خەڵکانی سەردەمی نەفامی هاوەڵیان بۆ خوا پەیدا نەکردووە، یان ئەوەی کە چاکەیان پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە وەک هەندێک لە بیریاران دەڵێن؛ هەموو ئەوە سوودی نییە مادەم باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد

---

(١) "صحيح مسلم" :(٢١٤).

(٢) البيهقي، "دلائل النبوة"، تحقيق: عبدالمعطي قلعجي، دارالريان، الطبعة الأولى، (١٤٠٨): (٥/٣٤١).

(٣) ابن كثير، "البداية والنهاية"، تحقيق: صدقي العطار، دار الفكر، الطبعة الثانية، (١٤١٨هـ): (٣/٦٧٩).

(ﷺ) نییە، هەربۆیە ڕاڤەوانی موعتەزیلە بەرزە زانای زمانی عەرەبی جارولّلا زەمەخشەری دەڵێت: "هەرکەس هەردوو باوەڕەکە کۆنەکاتەوە -باوەڕبوون بە خودا و باوەڕبوون بە پێغەمبەرەکەی- ئەوە کافرە." [١]

بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە کە پەروەردگار لە سوورەتی فەتحدا دەفەرمووێت: ﴿وَمَن لَم يُؤمِن بِاللَّهِ وَرَسولِهِ فَإِنّا أَعتَدنا لِلكافِرينَ سَعيرًا﴾[الفتح: ١٣] «هەرکەسیش باوەڕ بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی نەهێنێت ئەوا ئێمە بۆ بێباوەڕان ئاگرێکی تاودراومان ئامادەکردووە.»

جا هەرکەس هەردوو باوەڕەکە کۆنەکاتەوە، بێباوەڕە.

هەروەها پەروەردگار هەڵوەشانەوەی زۆرێک لە کارەکانی بە هۆکاری بێباوەڕبوون بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (ﷺ) **باس لێکردووە و بەستووشیەتییەوە بە بێباوەڕبوون بە خودی زاتی خۆی، هەروەک دەفەرمووێت:** ﴿وَما مَنَعَهُم أَن تُقبَلَ مِنهُم نَفَقاتُهُم إِلّا أَنَّهُم كَفَروا بِاللَّهِ وَبِرَسولِهِ﴾**[التوبە: ٥٤]** «هیچێک نەبووە ڕێگر لەوەی کە بەخشینەکانیان لێ قەبووڵ بکرێت جگە لەوەی کە ئەوان بێباوەڕبوون بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی.»

هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَلَن يَغفِرَ اللَّهُ لَهُم ذلِكَ بِأَنَّهُم كَفَروا بِاللَّهِ وَرَسولِهِ﴾ [التوبە: ٨٠] «... سا (اللّه) لێیان خۆشنابێت ئەوەش بەو هۆیەوە کە ئەوان بێباوەڕبوون بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی.»

جا ئەگەر داینێیت کارێکی پەتی مرۆڤانە هەیە کە خاوەنەکەی نە پارە نە پێگە و پۆست نە خاتر و نە دەرکەوتن و نە ناوبانگ و نە خۆدەرخستن و لێچوونەپێشەوە و نە سەرگەورەیی و نە بەشوێن باسی باشەی خۆیەوە بێت پێی لەناو خەڵکیدا، نە هیچ بەرژەوەندییەکی ماددی یاخود مەعنەوی؛ ئەوا

---

(١) الزمخشري، "الكشاف"، مكتبة المعارف: (٣/٤٦٤).

هەموو ئەوە -بە ئەگەری بوونییەوە- سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت، مادەم بێباوەڕبێت بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (ﷺ)، چونکە کاروکردەوەی بێباوەڕان گشتی لە تەرازووی خوادا بەباچوو و پووچەڵە تەنها بەوەندەی کە پشت لە ئایینی موحەممە (ﷺ) بکەن، هەروەک ئیبن قەییم لەو وتەیەیدا ئەوەی وێناکردووە:

"کوفری پشتهەڵکردنیش: ئەوەیە کە بە بیستن و بە دڵی پشت لە پەیامبەرەکە بکات، نە باوەڕی پێ بێنێت نە بەدرۆشی بخاتەوە، نەدۆستایەتی بکات نە دوژمنایەتی، هەرگیزیش گوێ بۆ ئەوە نەگرێت کە هێناویەتی، هەروەکوو یەکێک لە بەنی عەبدییالیل بە پێغەمبەری (ﷺ) وت: سوێند بەخوا هیچێکت پێ ناڵێم، ئەگەر ڕاستگۆ بیت، ئەوا تۆ زۆر لەوە لەلام گەورەتریت کە دەست بنێم بە ڕووتەوە، ئەگەریش درۆ بکەیت، ئەوا لەوە کەمتریت کە قسەشت لەگەڵ بکەم."[١]

بەڵکوو بنوارە چۆن کردەوەکان بە تەنها ڕقبوونێک لە هەندێک لە ئەحکامی شەرع بەتاڵدەبنەوە، هەروەک پەروەردگار لە سوورەتی موحەممەددا دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذينَ كَفَروا فَتَعسًا لَهُم وَأَضَلَّ أَعمالَهُم﴾[محمد: ٨] «ئەوانەشی کە بێباوەڕ بوون؛ نەگبەتی و داوەشین بۆیان و (خودا) کردەوەکانیشیانی وێڵ و بەتاڵکردووەتەوە. ئەوەش لەبەرئەوەی کە ڕقیان بوویەوە لەوەی کە (اللّٰه) دایبەزاندبوو سا کردەوەیان هەمووی هەڵوەشایەوە.»

ئەوجا پەروەردگار پووچەڵبوونەوەی کردەوەی بێباوەڕانی بە چەندەها چوواندنی ڕەوانبێژی قووڵ و بەپێز هێناوەتەوە، کە جارێک بە «بەباچوو» چوواندوویەتی، وەک لە سوورەتی فورقاندا دەفەرمووێت: ﴿وَقَدِمنا إِلى ما عَمِلوا مِن عَمَلٍ فَجَعَلناهُ هَباءً مَنثورًا﴾[الفرقان: ٢٣] «هاتینە سەرەوەختی هەر کارێک کە کردبوویان جا هەموویمان کردە بابردەی بڵاووپشاو.»

(١) ابن القيم، "مدارج السالكين"، تحقيق: مصطفى شيخ، مؤسسة الرسالة، (ص٢٤٣).

ئەم ئایەتە ئەوە بەدەردەخات کە ئەو کارانەی بێباوەڕان لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ خۆیان هێناوە لە خود و بنەڕەتی خۆیاندا کاری ستایشکراو و چاک بوون، بەڵام پەروەردگار لێیانی وەرنەگرت و سوودی پێ نەگەیاندن، خۆ ئەگەر لە خۆیدا کاری باش نەبووایە، نەیدەکردە بابردە و بەزایەچوو، بەڵکوو دەیکردە باریش بەسەریانەوە؛ چونکە تاوانەکان لەسەر بێباوەڕ هەژماردەکرێن نەک بەبابدرێن و ون بکرێن، بەڵام ئەوەی کە بە هەوادا چوو، ئەو کارانە بوون کە لە خۆیاندا باش بوون و لەبەر نەبوونی مەرجی وەرگیران؛ وەرنەگیران.

لە شوێنێکی دیکەدا پەروەردگار کردەوەی بێباوەڕانی بە خۆڵەمێشی بەر با داناوە، هەروەک لە سوورەتی ئیبراهیمدا دەفەرموویت: ﴿مَثَلُ الَّذينَ كَفَروا بِرَبِّهِم أَعمالُهُم كَرَمادٍ اشتَدَّت بِهِ الرّيحُ في يَومٍ عاصِفٍ﴾[إبراهيم: ١٨] «**نموونەی ئەوانەی** کە بێباوەڕبوون بە پەروەردگاریان؛ کردەوەکانیان وەک **خۆڵەمێشێک وایە کە لە** ڕۆژێکی باهۆزی سەختدا، با تاوی تێدابێت و هەڵیگرتبێت.»

لە شوێنێکی دیکەشدا بە تراویلکەیەکی ساختەی وەسفکردووە، وەک لە سوورەتی نووردا دەفەرموویت: ﴿وَالَّذينَ كَفَروا أَعمالُهُم كَسَرابٍ بِقيعَةٍ يَحسَبُهُ الظَّمآنُ ماءً حَتّى إِذا جاءَهُ لَم يَجِدهُ شَيئًا﴾[النور: ٣٩] «ئەوانەشی کە بێباوەڕبوون کردەوەکانیان وەک تراویلکەیەک وایە لە تەختاییێکی پان و بەریندا کە تینوو بە ئاوی دەزانێت کەچی کاتێک دێتە سەری، دەبینێت هیچێک نییە.»

لەو پرسانەش کە پەیوەندیدارن بەمەوە ئەوەی کە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی دەبینیت باس لە باشییێتی جیهانی هاوچەرخ و جوانییەتی مرۆڤایەتی هاوچەرخ و وێنەی ئەوانە دەکەن، باسکردنیش لە قەبارەی ترسناکی گومڕایی بە دیدێکی ڕەش دادەنێن کە لە دەلاقەیەکی وەحشیگەری و دواکەوتووییەوە سەرچاوەی گرتووە و ئەو جۆرە قسانە.

لە واقیعیشدا: باسکردن لە زۆرینەبوونی خراپە و زاڵبوونی گەندەڵی و گومڕایی

بەسەر جیهاندا دیدێکی قورئانییە کە چەندەها ئایەتی قورئان بەشوێنیەکدا جەختیان لێ کردووەتەوە، لەوانەش ئەوەی کە پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَما أَكثَرُ النّاسِ وَلَو حَرَصتَ بِمُؤمِنينَ﴾[یوسف: ١٠٣] «زۆرینەی خەڵکیش -با تۆ زۆر مکورِ و بەخەمیش بیت بۆیان- هێشتا باوەڕدار نین.»

ئەوەشی کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تُطِع أَكثَرَ مَن فِي الأَرضِ يُضِلّوكَ عَن سَبيلِ اللَّهِ﴾[الأنعام: ١١٦] «ئەگەر بە گوێی زۆرێک لە خەڵکی سەرزەوی بکەیت، لەرێگای خودا وێڵ و گومڕات دەکەن.»

وە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَد صَدَّقَ عَلَيهِم إِبليسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعوهُ إِلّا فَريقًا مِنَ المُؤمِنينَ﴾ [سبأ: ٢٠] «بەڕاستی ئیبلیس گومانی خۆی پێیان بەڕاست گەڕاند سا هەموویان شوێنیکەوتن جگە لە گرۆیەک لە باوەڕداران.»

چەند ئایەتیش لە پەرتووکەکەی خودادا هاتوون کە زەم و سیفەتی خراپیان داوەتە پاڵ زۆرینەی خەڵک، جا فەرموویەتی: «بەڵام زۆرینەی خەڵک نازانن»، هەروەها فەرموویەتی: «کەچی زۆرینەی خەڵک تەنها پێنەزانی و بێباوەڕیان هەڵبژارد» هەروەها فەرموویەتی: «بەڵام زۆرینەی خەڵک سوپاسگوزار نابن.»

بەڵکوو پەروەردگار باسی ئەوەی فەرمووە کە ئەگەر هەموو تاوانەکانیان لە خەڵک بگرێتیەک تاقێکیشیان لێ نامێنێتەوە، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَلَو يُؤاخِذُ اللَّهُ النّاسَ بِظُلمِهِم ما تَرَكَ عَلَيها مِن دابَّةٍ﴾[النحل: ٦١] «خۆ ئەگەر پەروەردگار سەرجەم ستەمەکانیان لە خەڵک بگرێت تەنانەتیەک جانەوەریش لەسەر زەوی ناهێڵێتەوە.»

لە شوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَو يُؤاخِذُ اللَّهُ النّاسَ بِما كَسَبوا ما تَرَكَ عَلى ظَهرِها مِن دابَّةٍ﴾ [فاطر: ٤٥] «خۆ ئەگەر پەروەردگار خەڵک بەوە بگرێت کە کردوویانە و لەدەستیان قەوماوە؛ لەسەر پشتی ئەو زەوییە جانەوەرێکیش نایەڵێتەوە.»

نموونەی زۆری دیکەش لەم ئایەتانە کە زاڵی و زۆرێتی گومڕایی و خراپە لەناوڕەگەزی مرۆڤدا وەدەردەخەن بەجۆرێک کە لەگەڵ ئەو دیدە خەیاڵپڵاوەدا کە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی ڕەواجی پێدەدەن یەکناگرێتەوە.

ئەو بیرۆکەیەش کە لەناو نوێگەراکاندا بەربڵاوە، مەبەستم ئەوەی -کە هەندێکجار- دەڵێن:

"ئێمە ئیسلام وەک هەڵوێستێکی کەسی وەردەگرین، بەڵام هاوەڵانی ئایینەکانی دیکە بە گومڕا و کافر دانانێین." یاخود هەندێکیان دەڵێن: "مانا و لێکەوتەی مرۆڤایەتی ئەوەیە کە گشت ئایینەکان ڕێگەی گەیشتنن بە خودا!" خۆش ئەوەیە واشدەزانن کە ئەوە بیرۆکەیەکی نوێی ڕاقی و هاوچەرخە، لەکاتێکدا ئەوە بیرۆکەیەکی عەوامانەی دێرینی ناو نەفامەکانی تەتەر بوو، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "**ئەمەش لە توخم و تۆوی نەفامەکانی تەتەرە لە** وەختی سەرەتای مسوڵمانبوونیاندا کە ئیسلام لەلایان باشترە **لە جگە ئیسلام،** با جگە لەویشیان لەلا دروست و گونجاو بێت، نە دۆستایەتیش لەسەر ئیسلام دەکەن نە دوژمنایەتی."[1]

پوختەی باسیش ئەوەیە: کە چەمکی مرۆڤاندن لەم چوارچێوەیەدا؛ بریتییە لە دوورخستنەوەی ناوەڕۆکی ئایینی لە ڕێکخستنی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، ئەمەش لادانێکە لە وەحی کە خاوەنەکەی بەرەو سەرەنجامگەلێکی ترسناک دەبات، لە پەروەردگارمان داوایە هەمووومان ببەخشێت.

---

(١) ابن تيمية، "الرد على المنطقيين"، تحقيق: عبدالصمد الكتبي، مؤسسة الريان، الطبعة الأولى، (١٤٢٦هـ)، (ص٣٢٨).

# ٣- دوژمنانی بانگەوازەکان وەك پێدراوێکی مێژوویی

زۆرێک لە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی مەیلیان بەلای ئەوەوەیە کە واقیعی ڕۆشنبیری ئەمڕۆ تەنها وەک ڕاجیاییەکی هزری وێنا بکەن، هەمیشەش هەوڵی بزرکردنی پاڵنەری ئایینی دەدەن وەک فاکتەرێکی یەکلاکەرەوە لە کێشانی مەودای نێوان نەیاراندا، ڕاستە ڕووبەرێکی فراوان لە ڕاجیایی هزری هەیە کە ڕاجیاییەکی ئیجتیهادی-کۆڵینەوەییە کە لە ڕووی شەرعەوە دروست نییە بگەیەنرێتە سەر ئێسقانی لایەنداری و دەمارگیری و دابڕان، ڕاستیشە کە کۆمەڵێکی کەم خەڵکی هەڵەشەی پەلەکار هەن لەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلامییەکان کە لەژێر دەمامکی خواستراوی ئەلیکترۆنییەوە لەسەر بنەمای بابەتە ئیجتیهادییەکان خەڵک بە فاسق و گومڕا دەکەن، ناکرێت ئەمەڕێی پێ نەگیرێت.

بەڵام خودی ناحەقی و نارەوایی ئەوەیە ئەم وێنایە بهێنرێتەوە بەسەر گشت ڕاجیاییەکاندا، بە پاڵدانەوە و پشوو و نەرمەقسەی ناو یانەیەکی ڕۆشنبیری، یاخود نمایشکردنێکی ئەکادیمی برسکاو و وێناکردنی بەو جۆرەی کە سەرجەم ڕاجیایی هزری ئەمڕۆ تەنها ڕا و بۆچوون و هەڵوێستگەلێکی ڕۆشنبیرییە.

لەوەشی لەسەر ئەوە بنیاتیانناوە ئەوەیە کە دەبێت ئەمڕۆ بە یەک چاو لە نووسەرانی خۆدەرەپاڵ ئیسلام بڕوانین، نابێت لەسەر بنەماگەلێکی ئایینیش جیاکاری و جیاوازیان لەنێواندا بکەین، جا هەرکەس خۆی دەدایە پاڵ ئیسلام پێویستە دۆستایەتی و پشتیوانی لێ بکەین، ئیدی بە لەخواترسی و فامین و سەرخستنی ئیسلام و سوننەت ناسرابوو، یاخود بە پشتکردن لە وەحی و

تانەدان لە بابەتە بڕاوەکانی شەریعەت، چونکە هەموویان موسڵمانن و هەموو ئەوەشی دەیڵێن و دەینوێنن تەنها بۆچوونگەلێکی هزرییە، هەربۆیە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی لە بەکارهێنانی چەمکەشەرعییەکان لە میانەی لێکدانەوەی هزری و باسی کاری ڕۆشنبیری قەڵسن: لە وێنەی چەمکی (الإفساد في الأرض- خراپەنانەوە لەسەر زەویدا) و چەمکی (النفاق-دووڕوویی) و نموونەی ئەوانە.

واقیعیش ئەوەیە کە: ئەم دیدە بزرکردنی زۆرێک لە پێدراوەکانی وەحی لەخۆگرتووە، کە ئاماژە بە هەندێکی دەکەین:

یەکەم: پێش هەموو شتێک دەبێت دان بەوەدا بنێین کە ڕێسایەکی مێژوویی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هیچ سەردەمێک بەبێ دیاردەی دوژمنانی ئایین نابێت، دوژمنانێک کە بەئاشکرا دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، قورئان بەخۆی ئەم ڕێسا مێژووییەی وەدەرخستووە کە دەفەرمووێت:

﴿وَكَذلِكَ جَعَلنا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِنَ المُجرِمينَ﴾[الفرقان: ٣١] «ئاوەها بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێک دوژمنمان داناوە لە تاوانباران.»

هەروەها دوو جۆرەکەی دوژمنانی باس لێ فەرمووە: ﴿وَكَذلِكَ جَعَلنا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَياطينَ الإِنسِ وَالجِنِّ﴾[الأنعام: ١١٢] «ئاوەها بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێک دوژمنمان داناوە، شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە.»

ئەو دوژمنە سەرسەختە ململانێکارانەی بانگەوازی خوداییش نزیکە هیچ ناوچەیێکی سەرزەوی لێیان بەتاڵ نەبێت، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَكَذلِكَ جَعَلنا في كُلِّ قَريَةٍ أَكابِرَ مُجرِميها لِيَمكُروا فيها﴾[الأنعام: ١٢٣] «ئاوەها بەو شێوەیە لە هەموو شار و دێهاتێکدا دامانناوە کاربەدەستانی تاوانباری بۆ ئەوەی پیلانگێڕی تێدا ببەن بەڕێوە."

جا ئەمە دیاردەیەکە کە وەحی بەڵگەیە لەسەری و مێژوو جەختی لێ

کردووەتەوە، سا دروست نییە کەیسەکە هەمووی وەک کەیسێکی هزری لەبەرچاو بگیرێت کە هیچ پەیوەندییەکی بە هەڵوێست لەهەمبەر ئایین و وەحیدا نەبێت.

بەڵام لەگەڵ دڵنیاییشمان لەم دیاردە مێژووییە شەرعییە؛ دروست و گونجاو نییە پۆلێنە هزرییە نوێیەکانی بە پێوەبەستانێکی ڕەها بەم وەسفە شەرعییەوە ببەستینەوە، چونکە ئەمڕۆ لە گۆڕەپانەکەدا پۆلێنی هزری فرە و جیاواز هەن کە هەندێکی لە ڕێچکەی ڕۆژئاواییەوە وەرگیراون و هەندێکیشی لە ئەزموونی کەلەپوورییەوە، گوتوبێژیش لەسەر گەیاندنی بەکافردانان و بەفاسقدانان و دوژمنایەتیکردنی ئیسلام بە نموونەی ئەم نازناوانەوە هەیە. لە واقیعیشدا: ئەم پۆلێنە هزرییانە ئەسڵەن نازناوانێکی تازەداهاتوون، کە ستایش یاخود زەمێکی شەرعی «ڕەها» لەخۆناگرن، بەڵکوو ستایش و زەمی شەرعی ڕەها بەو وەسفانەوەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی حوکمەکانیان پێوە بەستاوە، لە وردەکاریگەلێکی ڕێکخراوی ناسراوی ناو بابەتی (الأسماء والأحكام - ناو و حوکمەکان) لە زانستی (أصول الدين)دا.

جا ستایش و زەمی ڕەها تەنها بە ناوی چاکەکار و باوەڕدار و موسڵمان و فاسق و ئەوەی نەخۆشی لەدڵیدایە و خراپەکار و هاوەڵدانەر و بێباوەڕ و دووڕوو نموونەی ئەوانەوە دەبەسترێتەوە، دیاریکردنیشی لە کەسێکی دیاریکراودا بە ئەوپەڕی خستنەکاری توانا و ماندووبوونەوە دەبێت لە بژارکردنی هاتنەدی مەرجەکان و نەبوونی ڕێگرەکان.

بێگومان ناشوترێت کە ناکرێت باوەڕ و نموونەی باوەڕ لە کردەوە دڵییەکان بزانرێن، چونکە باوەڕ و کردەوە دڵییەکان دوو جۆر حوکمیان هەیە حوکمگەلێکی دوارۆژی بە دیاریکردنی چارەنووسی کەسی دیاریکراو بە بەهەشت یاخود دۆزەخ، ئەمەیان لەلای پەروەردگارە.

حوکمگەلێکی دونیاییش لەوێنەی دۆستایەتی و شایەتیدان بە چاکییەتی بۆی، ئەمەیان لە دونیادا دەزانرێت و حوکمەکانیشی بە ڕوانین لە شوێنەوارەکانی و خوێندنەوەی نیشانەکانی لە کەسی دیاریکراودا پێوە دەبەسترێت، هەربۆیە فەرموویەتی: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا إِذا جاءَكُمُ المُؤمِناتُ مُهاجِراتٍ فَامتَحِنوهُنَّ اللَّهُ أَعلَمُ بِإيمانِهِنَّ فَإِن عَلِمتُموهُنَّ مُؤمِناتٍ فَلا تَرجِعوهُنَّ إِلَى الكُفّارِ﴾[الممتحنة: ١٠] «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئافرەتانی باوەڕدار بە کۆچکردن هاتن بۆ لاتان، ئەوکات تاقیان بکەنەوە (بە سوێنددانیان) پەروەردگار خۆی زاناترە بە باوەڕیان جا ئەگەر زانیتان کە باوەڕدارن ئەوا مەیانگەڕێننەوە ژێردەستی بێباوەڕان.»

سا بەڵگەیە لەسەر ڕێتێچوون و گونجانی زانینی باوەڕێکی دیار لە کەسی دیاریکراودا بە خوێندنەوەی نیشانەکانی، نەک بە هەڵکۆڵین و بەدواداچوونی شاراوەکانی.

پێویستیشە لەوە ئاگاداربین کە دۆستایەتی لە شەریعەتدا یەک ئاست نییە وەک بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی وادەزانن، بەو واتایەی: یەک ئاست نییە کە هەموو موسڵمانێک تێیدا یەکسان بێت، بەڵکوو دۆستایەتی بۆ موسڵمانان چەند ئاستە، جیاوازی هەیە بەپێی ئەو باوەڕ و کاری چاکە و دۆستایەتی و هاوڕێبوونی وەحی و چاخە زێڕینەکان کە لە موسڵمانەکەدا هەیە، بە هەمان چەشنی نەیارییەتی و دوژمنایەتیکردنی کە بەپێی ئاشتەوایی یاخود شەڕفرۆشی و ئەوانەی کەسە بێباوەڕەکە جیاوازی هەیە.

ئەم واتایەش لە ئایەتەکانی قورئان و هەڵوێستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و فەقیهەکانی ناو هاوەڵاندا ڕوون و دیارە، هەروەها چەندەها ئایەتی گشتگیر کە موسڵمان و جگە لە موسڵمانیش لەخۆدەگرێت و تایبەت نییە بە بێباوەڕەوە، بەڵگەن لەسەر ئەوە، پەروەردگار باسی لەوە فەرمووە کە باوەڕدار و فاسق

هەرچەندە هەردووکیان ناوی باوەڕیان لەسەر دێتەجێ، بەڵام لەیەک ئاستدا نین، هەروەکوو دەفەرموویێت: ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَا يَستَوونَ﴾ [السجده: ١٨] «ئەرێ کەسێک باوەڕدار بێت، وەکوو ئەوە وایە کە فاسق -لە تاعەت دەرچوو- بێت، نا یەکسان نین.»

لە سوورەتی جاثییەدا دەفەرموویێت: ﴿أَم حَسِبَ الَّذِينَ اجتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَجعَلَهُم كَالَّذِينَ آمَنوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ [الجاثية: ٢١] «ئەرێ ئەوانەی کە خۆیان تووشی تاوانگەلی گەورە و زۆر کردووە وایان داناوە وەک ئەوانەیان دابنێین کە باوەڕیان هێناوە و کاری چاکەیان پێشخستووە؟»

لە سوورەتی صاددا دەفەرموویێت: ﴿أَم نَجعَلُ الَّذِينَ آمَنوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالمُفسِدِينَ فِي الأَرضِ﴾ [ص: ٢٨] «ئەرێ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کاری چاکەیان کردووە وەک ئەوانە دانێین کە خراپەیان ناوەتەوە لە سەرزەویدا»، لەپاشان دەفەرموویێت: ﴿أَم نَجعَلُ المُتَّقِينَ كَالفُجَّارِ﴾ [ص: ٢٨] «یاخود لەخواترسان و پارێزکاران وەک خراپەکاران دابنێین.»

زانراویشە کە فیسقی ڕەها و تووشبوونی تاوانە گەورەکان و خراپەنانەوە لە زەویدا و تاوانکاری و هەموو ئەوانە موسڵمان «بەڕەهایی» لە ئیسلام نابەنەدەرەوە، بەڵکوو دەکرێت خاوەنەکەی هێشتا ناوی باوەڕی گشتی بیگرێتەوە، لەوانەشە لێی دەرچێت بەهۆی هەڵوەشێنەرەوەیەکی باوەڕەوە کە هاوەڵێتی ئەوانە بکات، بەڵام ئەگەریش لەناو ناوی باوەڕی گشتیدا بمێنێتەوە، هێشتا ئەم جیاکارییە لە پێگە و شوێنیدا لەلای (اللّٰه) دەمێنێتەوە، لەنێوان ئەم و ئەوانەدا کە کۆششیان کردووە بۆ هێنانەجێی داخوازییەکانی باوەڕ، ئیدی تەرازووی باوەڕداریش شوێنکەوتەی تەرازووی پەروەردگاری مەزنە.

جیاوازیش لە دۆستایەتیدا لقێکە لە جیاوازی پێگەی دیاری ئایینیدا، هەربۆیە پەروەردگار بەپێی پێگەی باوەڕدار جیاوازی لە دۆستایەتیدا کردووە، کە

فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذينَ آمَنوا وَهاجَروا وَجاهَدوا بِأَموالِهِم وَأَنفُسِهِم في سَبيلِ اللَّهِ وَالَّذينَ آوَوا وَنَصَروا أُولئِكَ بَعضُهُم أَولِياءُ بَعضٍ وَالَّذينَ آمَنوا وَلَم يُهاجِروا ما لَكُم مِن وَلايَتِهِم مِن شَيءٍ حَتّى يُهاجِروا﴾ [الأنفال: ٧٢] «بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووە و بە ماڵ و بە خوێن لەڕێی خوادا جیهادیان کردووە، ئەوانە هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکی تریانن، ئەوانەشی داڵدەیان داوە و پشتیوانی و سەرخستنیان هەبووە ئەوانەش هەندێکیان پشتیوان و دۆستی هەندێکی تریانن، ئەوانەشی کە باوەڕیان هێناوە، بەڵام کۆچیان نەکردووە ئەوانە بۆتان نییە هیچ دۆستایەتییەکیان بکەن هەتا کۆچ دەکەن.»

بڕوانە چۆن شێوازی پەیوەندییەکەی جیاکاری تێدا کردووە بەپێی جیاوازی لە پلەی باوەڕ و کۆششدا، جا هەرکەس باوەڕی هێنابێت و کۆچی کردبێت دۆستایەتی تەواوی بۆ هەیە، هەرکەسیش باوەڕی هێنابێت و کۆچی نەکردبێت بەپێی ئەوە دۆستایەتییەکەی کەم دەکات، چجای کەسێک سەرقاڵ و کادیری وروژاندنی گومانەکان و ڕازاندنەوەی هونەرە ڕۆژئاواییەکان و بەهانە هێناوە بێت بۆ ئەو پیسی و بەدفەڕی و بەها نزمانەی لەوێدا هەن.

سیرە و ڕێبازی پێغەمبەریش (ﷺ) ئاوا بووە لە مامەڵەکردن لەگەڵ موسڵمانان لە چاخی خۆیدا؛ کە بەپێی هەستانی موسڵمانێک بە دروشمە دیارە ئایینییەکان زیاتر دۆستایەتی دەکرد، بەپێی کەمتەرخەمیشی لە فەرمانی خوادا لە دۆستایەتی کەمدەکردەوە.

هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) پەنجا شەو دابڕانی لە کەعبی کوڕی مالیک و دوو هاوەڵەکەشی کرد، هەروەک بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە کە کەعبی کوڕی مالیک فەرموویەتی: "پەنجا شەو بەو حاڵەوە ماینەوە." [١] تەنانەت طەبەری دەفەرمووێت: "چیرۆکەکەی کەعبی کوڕی مالیک بنچینەیە لە جیابوونەوە لە

---

(١) "صحيح البخاري": (٤٤١٨)، و "صحيح مسلم": (٢٧٦٩).

هاوەڵانی تاوان و سەرپێچی و خۆدابڕین لێیان." [١] «سیوطی»ش لە نووسراوێکی سەربەخۆدا ناوی ئەو هاوەڵ و شوێنکەوتووانەی هێناوە کە تەمبێکردنی سەرپێچیکار بە جیابوونەوە و دابڕین-هەجر دەنوێنن. [٢]

لەڕاستیشدا: جێبەجێکردنە هەڵەکان لە تێگەیشتنی ڕێکار و هەڵوێستەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) لە سیرەکەیدا، بەتایبەت لە چەشنی ئەم پرسە پەیوەستانەدا بە بەڕێوەبردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە، نابێت بەرەو هەڵگەڕانەوەمان بەرێت بەسەر گشت ئەم بنچینەیەدا، چونکە ئەمە ڕێبازی پێشەوایانی چاخە زێڕینەکان بووە کە جیاکارییان لە پلەی دۆستایەتیکردندا لەگەڵ موسڵمان بەپێی کارکردنی بە قورئان و سوننەت و کەمتر دۆستایەتیکردنی بەپێی دوورکەوتنەوەی لە قورئان و سوننەت، لێیانەوەگوازراوەتەوە. غەزالی بڕی هاوبەشی ئەم هەواڵە پێشینییە زۆروزەبەنانەی پوختکردووەتەوە، کە دەفەرمووێت:

"ڕێگاکانی پێشین لە دەرخستنی ڕق بەرانبەر بە هاوەڵانی تاوان جیاوازی هەیە، هەمووشیان لەسەر ئەوە کۆکن کە ڕق دەربېڕدرێت بەرانبەر بە: ستەمکاران، بیدعەکاران و هەرکەسێکیش کە تاوانێکی تێپەڕ و سنوورشکێن بەرانبەر بەوانی دیکە ئەنجام بدات." [٣]

لە دەقێکی بنچینەسازی کۆکەرەوەشدا شێخولئیسلام (ئیبن تەیمییە) دەفەرمووێت:

"بەڵام ئەگەر پیاوێک تاوانی بەئاشکرا دەکرد: واجبە کە بەئاشکرا سزابدرێت بە سزایەک کە تەمبێی بکات لە وێنەی دابڕین و جگە لەوەش، جا سەلامی لێ

---

(١) ئیبن حەجەر ئەوەی لە "فتح الباري" دا لێوە گواستووەتەوە، دار الريان للتراث، الطبعة الأولى، (١٤٠٧هـ)، (١٠/٥١٣).

(٢) السيوطي، "الزجر بالهجر"، تحقيق: أحمد باجور، الدار المصرية اللبنانية، الطبعة الأولى، (١٤١٧هـ)، (ص ٦٤).

(٣) الغزالي، "إحياء علوم الدين"، دار الخير، الطبعة الثانية، (١٤١٣هـ): (٢/٢٥٥).

ناکرێت، وەڵامی سەلامیشی نادرێتەوە، ئەگەر توانرا ئەوە بکرێت بەبێ هیچ زەرەرێکی زاڵ و زۆر، پێویستە ئاییندااران و پیاوخودایان بە مردووییش لێی دوورکەونەوە چۆن بە زیندوویی دایانبڕی و لێی دوورکەوتنەوە، ئەگەر لەوەدا سڵپێکردنەوە و دەستپێهەڵگرتن دەبینرا لە تاوانبارانی زیندووی هاووێنەی ئەو، جا شوێن جەنازەکەی ناکەون، هەروەک چۆن پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر چەند مردوویەکی ئەهلی تاوان نەکرد. هەروەها وەک بە سەمورەی کوڕی جوندوب وترا: کە کوڕەکەت دوێنێ مردووە، ئەویش گوتی: ئەگەر مردبێت نوێژی لەسەر ناکەم، چونکە هاوکاربوو لە کوشتنی خۆیدا وەک ئەوە وایە کە خۆی خۆی کوشتبێت، جا پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر خۆکوژ نەدەکرد. هەروەها ئەو سێ هاوەڵەی کە تاوانیان بەدەرکەوت لە وازهێنان لە جیهادی واجب هەتاکوو ئەو وەختی کە پەروەردگار تەوبەی لێوەرگرتن، جا ئەگەر تەوبەی کرد و لێی بەدیارکەوت ئێمەش چاکە و ڕووی خۆشی نیشان دەدەین."[١]

ئەم دەقە پێوەند و کۆت و دیاریکەر و هۆکاری وەها جوان و ناوازەی تێدایە کە ئێرە شوێنی شیکردنەوەی نییە، وەک بەستنەوەی هەجر بە گونجان و لێنەکەوتنەوەی زەرەری زۆر و زاڵ، هەروەها چەمکی هەجرکردنی مردوو، جیاوازی هەجرکاران، و ئاگادارکردنەوە لە ئامانجی تەمبێبوونی کەسی هەجرکراو کە لێرەدا بواری درێژەپێدانمان نییە، بەڵام مەبەست لەم دەقە زانستییە پاڵپشتیکردنی ئەو واتایە بوو کە پێشتر باسمانکرد لە جیاوازی دۆستایەتیکردن لەگەڵ موسڵمانان بەپێی باوەڕیان.

مەبەستیش ئەوەیە کە هەرچی لە جۆری ئەم هەڵوێستانە لە پێغەمبەر (ﷺ) و فەقیهەکانی ناو هاوەڵانی و پێشەوایانی چاخە زێڕینەکانەوە گێڕدراوەتەوە خۆ جۆرێکە لە نەیارییەتی و دوژمنکاری بچووک کە وابەستەی هۆکاری خۆیەتی بە

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٢٨/٢١٧).

بوون یان نەبوون، هەروەها وابەستەی بەرژەوەندی شەرعییە، ئەگەر زەرەرێکی زۆری هاتە بەرانبەر، ئەوکات ستایشکراو نییە.

سەیریش ئەوەیە هەندێک لەوانەی مەیلی مرۆڤگەرایی ڕۆژئاواییان وەرگرتووە پێت دەڵێن کە دەبێت ئێمە تەنها خۆشویستن لەپێناو خودا بڵاوبکەینەوە، تەواوی فەرهەنگی چەمکی بەراء-نەیارییەتی و ڕقلێبوونی ئایینیش هەواڵەی مێژوو بکەین، ئەمەش ئەسڵەن دژیەکییەکی ناوەکییە؛ چونکە هەر بڕیاردانێکی خۆشویستن لەپێناو خودا ڕقلێبوونێشی لەپێناو خودا لێ دەبێتەوە، ناشکرێت لێکجیابکرێنەوە، ئەبوو حامیدی غەزالی ئەم پێکبەستراوییەیانی لە دەربڕینێکی ناوازەدا شیکردووەتەوە کە دەفەرمووێت:

"بزانە: کە هەرکەس لەپێناو خودا خۆشویستنی هەبێت، دەبێت لەپێناو خوداشدا ڕقلێبوونی هەبێت، چونکە تۆ گەر مرۆڤێکت خۆشبوێت لەبەر گوێڕایەڵیکردنی بۆ خودا، کە سەرپێچیشی کرد، دەبێت ڕقت لێی بێتەوە، چونکە سەرپێچی خوای کردووە، هەرکەسیش بە هەر هۆکارێک خۆشویستنی هەبێت، بێگومان بە دژەکەشی ڕقلێبوونی دەبێت. ئەم دووانەش پێکبەستراون و هیچیان لەوی دیکە ناترازێت."[١]

بە ڕەنگدانەوەی جیاوازی دۆستایەتیش بە جیاوازی پێگە، سزادانیش لەسەر ئازاردانی باوەڕداران دیسان بەپێی جیاوازی پێگەیان جیاوازی هەیە، ئاوا ڕەها و ڕەنگدەرەوە، جا کەسێک کە دوژمنایەتی دۆستێکی پەروەردگار بکات وەک ئەوە نییە کە دوژمنایەتی موسڵمانێکی تاوانکار بکات، هەربۆیە لە فەرموودە قودسییەکەدا هاتووە:

«پەروەدگار فەرموویەتی: هەرکەس دوژمنکاری دۆستێکی من بکات، جەنگم

---

(١) الغزالي، "إحياء علوم الدين"، دار الخير، الطبعة الثانية، (١٤١٣هـ): (٢/٢٥٣).

لەگەڵی ڕاگەیاندووە.»[١]

بەهەرحاڵ، جیاوازی لە دۆستایەتی و جیاوازی لە دوژمنایەتیدا لقێکن لەو بنچینە مەزنەی هەموو شەریعەتی ڕێکخستووە، بنچینەی دادپەروەری کە شەریعەت هەرگیز جیاوازەکان یەکسان ناکاتەوە و هاوتاکانیش لێک جیاناکاتەوە، ئەوەش مانای ئەو تەرازووەیە کە پەروەردگار لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئاماژەی پێکردووە، وەک ئەوەی کە دەفەرموێت: ﴿لَقَد أَرسَلنا رُسُلَنا بِالبَيِّناتِ وَأَنزَلنا مَعَهُمُ الكِتابَ وَالميزانَ لِيَقومَ النّاسُ بِالقِسطِ﴾[الحديد: ٢٥] «بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان بە نیشانەی ڕوون و ڕۆشن نارد و پەرتووک و تەرازوومان لەگەڵیان دابەزاند تاکوو خەڵک بە دادپەروەری هەستن.»

هەروەها ئەوەی کە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذي أَنزَلَ الكِتابَ بِالحَقِّ وَالميزانَ﴾ [الشورى: ١٧] «ئەو خودایەی کە پەرتووکی بە حەق دابەزاندووە هەروەها تەرازووش.»

یان دەفەرموێت: ﴿وَزِنوا بِالقِسطاسِ المُستَقيمِ﴾[الشعراء: ١٨٢] «بە تەرازووی ڕاست و ڕاستاڵ بپێون.»

ئەم دەقە شەرعییانەش بانگەشەکەی زێدەڕەوانی مەدەنییەت هەڵدەوەشێننەوە کاتێک کە دەڵێن نەیارییەتی و دوژمنکاری تەنها بۆ بێباوەڕ یاخود بۆ بێباوەڕی جەنگاوەر دەبێت، یاخود دۆستایەتی بۆ موسڵمانان جیاوازی تێدا نییە.

سەرەڕای ئەوەی کە ئەگەر ئەو دەقە تایبەتانەش لەسەر نەیارێتی بچووک نەهاتنایە؛ هێشتا بەڵگەهێنانەوە بۆ نەیارێتی بچووک بەو دەقانەی کە لە نەیارییێتی گەورەدا هاتوون بەس بوو بۆ ڕوونکردنەوەی حەق، ئەوەش لەو (ضرب

---

(١) "صحيح البخاري": (٦٥٠٢).

الأمثال - نموونەهێنانەوە)یە کە قورئان ئاماژەی بەوە داوە کە ڕوونکردنەوەیە بۆ هەموو شتێک کە بەڵگەهێنانەوەیە بە هەندێک لە واتاکە، نەک ئەوەی قیاسی (تمثیل - نموونەهێنانەوە) یاخود قیاسی (أولی - شایانتر) بێت، جا ئەو وەسف و کارانەی کە پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا زەمی کردوون موکەلەف-ڕاسپێردراو هێندی ئەوەی نزیکی بێتەوە و هاوشێوەی ئەوەی لێ بوەشێتەوە؛ زەم و لۆمە دەکرێت کە مەرج نییە بەتەواوی تێی بکەوێت.

ئەم جۆرەش لە بەڵگەهێنانەوە لە ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) و فەقیهەکانی ناو هاوەڵان و تێکڕای پێشەوایانی چاخە زێڕینەکانە، بەنموونە ئەو ئایەتانەی کە لەسەر شیرک-هاوەڵدانانی گەورە دابەزیبوو بەڵگەیان پێ دێنایەوە بۆ هاوەڵدانانی بچووک، ئەوەیشی کە بۆ زەمکردنی کارەکانی بێباوەڕان دابەزیوە، بەڵگەیان پێ دێنایەوە بۆ کەسێک لە موسڵمانان کە هەمان کاری کردووە.

کە لە سونەنی تیرمیذی و جگە لەویشدا هاتووە، لە ئەبی واقیدی لەیثییەوە: کە پێغەمبەر ((ﷺ) ) و هاوەڵانی لە مەککەوە دەردەچوون بەرەو حونەین، بێباوەڕان دارێکی سیدرەیان هەبوو کە لەلای دەمانەوە و چەکەکانیان پێیدا هەڵدەواسی، پێی دەگوترا (ذات أنواط)، هاوەڵانیش بە لای دارسیدرێکی سەوزی گەورەدا تێپەڕین، بە پێغەمبەریان (ﷺ) وت: "(ذات أنواط)ێکمان بۆ دیاری بکە وەک چۆن بێباوەڕان (ذات أنواط)یان هەیە." جا ئەمەی کە هاوەڵان داوایانکرد کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دارێکیان بۆدیاری بکات تاکوو فەڕوبەرەکەتی لێ بخوازن ئەوە لە هاوەڵدانانی بچووک بوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێکردن و بەڵگەی بە ئایەتێکیش هێنایەوە کە لەسەر هاوەڵدانانی گەورە دابەزیبوو نەک بچووک، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە وەڵامیاندا فەرمووی: «(الله أکبر)، سوێندبەوەی گیانی منی بەدەستە هەر ئەوەتان وت کە بەنی ئیسرائیل بە مووسایان وت: خوایەکمان بۆ دانێ چۆن ئەوان خواگەلێکیان هەیە، ئەویش

وتی: بەڕاستی ئێوە خەڵکێکی نەفامن.» (١)

هاوەڵی مەزن حوذەیفەی کوڕی یەمان چووە سەردانی نەخۆشێک، دیتی «پەتەچەرمێک»(٢) بە باسکییەوەیەتی وەک نووشتە بەکاریدێنێت، حوذەیفەش لەدەستی کردەوە و لەپاشان فەرمووی: ﴿وَما يُؤمِنُ أَكثَرُهُم بِاللَّهِ إِلّا وَهُم مُشرِكونَ﴾ [يوسف: ١٠٦] «زۆرینەیان باوەڕیان بە خودا نییە مەگەر بە شیرک و هاوەڵدانانەوە.»(٣) جا حوذەیفەبە ئایەتێک کە لەسەر شیرکی گەورەدا دابەزیبوو بەڵگەی هێنایەوە بۆ شیرکی بچووک، بە کۆکەرەوەی ئەو واتایە.

کاتێکیش لە تورجومانی(٤) قورئان عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیان پرسی لەبارەی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگارەوە لە سوورەتی بەقەڕەدا ﴿فَلا تَجعَلوا لِلَّهِ أَندادًا وَأَنتُم تَعلَمونَ﴾ [البقرة: ٢٢]: «جا هاوتا و هاوەڵ بۆ (الله) بڕیارمەدەن لەکاتێکدا بۆ خۆشتان دەزانن»، چەند وێنەیێکی بۆ واتای ئایەتەکە باس کرد لەوانە ئەوەی کە فەرمووی: "ئەوە لە چەشنی ئەوەیە یەکێک بەویتر دەڵێت: هەرچی خوا و تۆ بتانەوێت، یاخود ئەوەی دەڵێت: خوا نەبووایە یان فڵان کەس، (وەها و وەها ڕوویدەدا)"(٥) جا ئیبن عەبباس بە چەند وێنەیەک لە شیرکی ناو قسە و وتەکان ڕاڤەی کردەوە.

ئەم وێنە باسکراوانەش لە هاوەڵدانانی بچووکن هەروەک پێشەوا موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە بابەتەکانی ئەو دوو باسەدا ئاماژەی

---

(١) "سنن الترمذي": (٢١٨٠)، "مسند أحمد": (٢١٨٩٧).

(٢) پەتێک کە لە چەرم بڕابێ و دروستکرابێت

(٣) ابن أبي حاتم، "تفسير القرآن العظيم"، تحقيق: أسعد الطيب، المكتبة العصرية، الطبعة الثالثة، (١٤٢٤هـ): (٧/٢٢٠٨).

(٤) وەرگێڕی قورئان، بەهۆی پێدراوی و لێهاتوویی و بەرچاوڕۆشنی لە زانستی لێکدانەوەی قورئاندا بەوە ناوبانگی هەیە خوا لێی ڕازی بێت.

(٥) ابن أبي حاتم، "تفسير القرآن العظيم"، نفس المصدر: (١/٦٢).

پێکردووە[١]، لەگەڵ ئەوەشدا ئیبن عەبباس تێهەڵکێشی ئایەتێکی کرد کە لەسەر هاوەڵدانانی گەورە دابەزیبوو، لەبەر هاوبەشییەیان لە واتا گشتییەکەدا کە هاوتادانانە.

کاتێکیش عەلی کوڕی ئەبی تالیب بە لای خەڵکێکدا تێپەڕی کە بە شێوەیەکی حەرام شەترەنجیان دەکرد، ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ما هذِهِ التَّماثيلُ الَّتي أَنتُم لَها عاكِفونَ﴾ [الأنبياء: ٥٢] «چییە ئەم بتانەی کە زەبوون و زەلیل بۆی کەوتوون.»[٢] بەڵگەی بۆ تاوان بە ئایەتێک هێنایەوە کە لەسەر شیرک دابەزیبوو بە کۆکەرەوەی توند وابەستەبوونێک کە مرۆڤ بەرەو کەمتەرخەمی بەرێت لە حەقی خوادا.

لەو فەرمایشتەی پەروەردگاریشدا: ﴿قُل هَل نُنَبِّئُكُم بِالأَخسَرينَ أَعمالًا(١٠٣) الَّذينَ ضَلَّ سَعيُهُم فِي الحَياةِ الدُّنيا وَهُم يَحسَبونَ أَنَّهُم يُحسِنونَ صُنعًا﴾ [الكهف: ١٠٣ - ١٠٤] «بڵێ ئەرێ هەواڵتان بدەینێ سەبارەت بەوانەی کە دۆڕاوترینە کاروکردەوەیان. ئەوانەی کە هەوڵیان لە ژیانی دونیادا بەباچووە و واشدەزانن خەریکن چاکە دەسازێنن»، زیاد لە یەکێک لە پێشین لە وێنەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ضەحاک و جگە لەوانیش فەرموویانە: "ئەوانە حەرووریەکانن- خەواریج"[٣]، سەرەڕای ئەوەی کە ئایەتەکە ئەسڵەن بەر لە هاتنەبوونی حەرووریەکان دابەزیوە، نموونەی ئەوەش لەو پێشینانەوە -ڕەحمەتی خوایان لێ بێت- بەڵگەهێنانەوەیە بۆ بچووک بەوەی کە سەبارەت بە گەورە دابەزیوە، بە کۆکەرەوەی بنچینەی واتا.

ئەم جۆرە لە بەڵگەهێنانەوە بۆ بچووک بەوەی کە لەسەر گەورە دابەزیوە

---

(١) محمد بن عبدالوهاب، "كتاب التوحيد"، مطبوع ضمن: "مجموع مؤلفات الشيخ محمد بن عبدالوهاب"، الطبعة الثانية، (١٤٢٣هـ): (٦/٧٨)، (٦/٨٠).

(٢) "مصنف ابن أبي شيبة": (٢٦٦٨٢).

(٣) "تفسير ابن كثير": (٥/٢٠٢).

بە کۆکەرەوەی هاوبەشییەتییان لە بنچینەی واتاکەدا، بەربڵاو و زۆروزەبەندەیە لە تێگەیشتن و لێکدانەوەی چاخە زێڕینەکاندا، هەرکەسیش خوێندنەوەی بۆ ڕاڤە ئەسەرییە-پاشماوە گرنگیدەرەکان بە گواستنەوەی لێکدانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان و شوێنکەوتووانی هەبێت؛ زۆری لەم جۆرە لە بەڵگەهێنانەوە دەبینێت.

چەندێکیش زانایان هۆشیاریان داوە لەو هەڵەیە لە تێگەیشتنی قورئاندا، ئەوەی کە وابزانرێت ئەو ئایەتانەی کە پەروەردگار تێیدا هۆشیاری داوە لە کارەکانی بێباوەڕان ئەو موسڵمانە ناگرێتەوە کە لەو کارانەدایان لە بنچینەی ئەو کارانەدا هاوبەشیێتی کردوون!

پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت:

"جا کۆمەڵێک لەڕاڤەکاران لەبارەی ئەم ئایەتانەوە دەڵێن: 'ئەم ئایەتە لەسەر بێباوەڕان دابەزیوە.' ئیدی کەسێک کە ئەوە دەبیستێت وادەزانێت کە ئەوەی ئیسلام و موسڵمانییەتی نیشان، بدات لەم لۆمە و هەڕەشەیەدا بەشی نییە ...، کە ئەمەش زانرا ئەوەش دەزانرێت کە هەر بەندەیەک سوود لەوە دەبینێت کە پەروەردگار لەسەر باوەڕ باسی فەرمووە لە ستایشکردنی بەشەکانی باوەڕ یاخود زەمکردنی بەشەکانی بێباوەڕی."[(١)]

گەورە زانای ڕاڤەکار ئیبن عادلی حەنبەلی هەمان ئاگاداری دەدات، کە دەفەرمووێت: "ئای چەند ئایەت هەیە کە لەسەر بێباوەڕان دابەزیوە و قەڵەوترین بەشی بۆ باوەڕدارانیش تێدایە، بە تێڕامان لێی و لەبەرچاوگرتنی چوارچێوەکانی."[(٢)]

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (١٠/١٠٥) مختصراً.

(٢) ابن عادل الحنبلي، "اللُّباب في علوم الكتب"، دار الكتب العلمية، تحقيق: عادل عبدالموجود وزملائه، الطبعة الأولى، (١٤١٩هـ): (١٠/١٥).

شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابیش لە چەندەها شوێندا بەڵگەی بۆ ئەم ڕێسایە و بنچینەکەی هێناوەتەوە، کە لە (کتاب التوحید)دا دوو جار باسی کردووە، جارێک دەفەرمووێت: "هاوەڵان بەو ئایەتانەی کە لەسەر هاوەڵدانانی گەورە دابەزیوە بەڵگە بۆ هاوەڵدانانی بچووک دێننەوە."[١]

لە شوێنەکەی دیدا دەفەرمووێت: "هاوەڵان ئایەتی دابەزیو لەسەر هاوەڵدانانی گەورە وەها لێکدەدەنەوە کە بچووکیش دەگرێتەوە."[٢]

ڕوونیشە کە پێشەوای موجەددید موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەمیانەی وتووێژە زانستییەکانیدا تووشی خەڵکانێک هاتووە کە دەستیان بەم ڕەخنەیەوە گرتووە بۆ لەکارخستنی ماناگەیێنیی ئایەتەکانی قورئان، هەربۆیە جارێک لەیەک لە نووسراوەکانیدا دەفەرمووێت:

"جا ئەگەر دووڕوویەک چەلەحانێی بەوە کرد کە ئەو ئایەتە لەسەر بێباوەڕان دابەزیوە، ئەوکات پێی بڵێن: ئەرێ کەسێک لە زانایان، لە یەکەمیانەوە تا دوایینیان، فەرموویەتی کە ئەو ئایەتانە ئەو موسڵمانانە ناگرێتەوە کە هەمان ئەو کارانە ئەنجامدەدەن؟ کێ بەر لە تۆ ئەمەی وتووە؟ هەروەها، پێی بڵێن: ئەمە ڕەتکردنەوەی کۆدەنگی ئوممەتە، چونکە بەڵگەهێنانەوەیان بەو ئایەتانەی کە لەسەر بێباوەڕان دابەزیوە، لەسەر ئەوانەی کە هەمان کار ئەنجام دەدەن لەوانەش کە خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام، لەوە زۆرترە کە ئەسڵەن بژمێردرێت و باس بکرێت."[٣]

ئەوەشی تووشی پێشەوا موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب هاتووە، تایبەت

---

(١) محمد بن عبدالوهّاب، "كتاب التوحيد"، مطبوع ضمن: "مجموع مؤلفات الشيخ محمد بن عبدالوهاب"، الطبعة الثانية، (١٤٢٣هـ): (٦/١٨).

(٢) محمد بن عبدالوهاب، "كتاب التوحيد"، مصدر سابق: (٦/٧٨).

(٣) محمد بن عبدالوهاب، "الرسائل الشخصية"، مطبوع ضمن: "مجموع مؤلفات الشيخ محمد بن عبدالوهّاب"، الطبعة الثانية، (١٤٢٣هـ): (٣/١٣٤).

نەبووە بەوەوە، بەڵکوو زۆرینەی ئەوانەی لەم چاخەدا هەوڵی چاکسازییان داوە لە ڕێگەی قورئانەوە تووشی خەڵکانێک هاتوون کە بەم گومانە ڕووبەڕوویان بوونەتەوە بە ئامانجی لەکارخستنی ماناگەیێنی ئەو ئایەتانەی کە لەسەر بێباوەڕان دابەزیوە، تەنانەت شێخ موحەممەد ڕەشید ریضا لە چەند شوێنی تەفسیر و گۆڤارەکەشیدا وەڵامی ئەم گومانەی داوەتەوە، فرەیی و دووبارەبوونەوەی وەڵامەکانی شێخ ڕەشید ریضا ئاماژەی ڕەنگدانەوەی زۆر تووشهاتن و دووچاربوونیەتی بەوانەوە کە لافیتەی ئەم گومانەیان بەرزکردووەتەوە، لەوانە ئەوەی کە شێخ ڕەشید ریضا دەفەرموێت:

"زۆرجار خۆدەرەپاڵ و بانگەشەکارانی زانست و ئاییندار‌ی نکۆڵی ئەوەیان لە ئێمە کردووە کە ئێمە ئەو ئایەتانەی کە لەسەر بێباوەڕان دابەزیوە کێشاومانەتە سەر موسڵمانان و باوەڕداران کە ئەوان دەستەپاچەن لەئاست تێڕامان لە مەبەست تێیدا، نەزانن بە ڕێسا گشتییەکانیشی."[١]

لەوەشی کە پەیوەندی بەم گومانەوە هەیە ئەوەی کە زۆرێک لە نووسەرانی ئەمڕۆ وادەزانن ئەو نیفاق-دووڕووییەی کە پەروەردگار لە قورئاندا باسی فەرمووە و درێژەی بە وێناکارییەکانی داوە تەنها دووڕوویيە پەتییەکەیە کە شاردنەوەی بێباوەڕی و دەرخستنی باوەڕدارییەتییە، بنیاد لەسەر ئەوەش بوون و ڕوودانی بەدوور دەزانن و بەکارهێنانی ئەم دەستەواژە شەرعییەش زۆر بەقورس دەگرن، لە زاری کەسێکیشی ببیستن دنیای لێ دێننەوە یەک.

لە واقیعیشدا: دووڕوویی بەتەنها هەر دووڕوویی پەتی نییە کە دووڕوویی پوخت و پەتی ئەمڕۆ لەناو موسڵماناندا کەمە -سوپاس بۆ خوا-، تەنانەت حوذەیفە کە زاناترین هاوەڵ بوو بە نهێنییەکانی دووڕوویی، وەک بوخاری لە سەحیحەکەیدا لێوەی دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: "دووڕوویی لە سەردەمی

---

(١) رشيد رضا، "تفسير المنار"، دار المنار، الطبعة الثانية، (١٣٦٧هـ): (٩/٣١).

پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوو، بەڵام ئەمڕۆ نیفاق ئیتر یانی کافربوونەوە لەپاش باوەڕهێنان."[١]

بەڵام شتێک هەیە جگە لە دووڕوویی پەتی، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ بکەوێتە ناو بەشێک لە بەشەکانی دووڕووییەوە -پەنا و هاوار بۆ لای (الله)-، جا لەوانەیە لەگەڵ مرۆڤدا بچێت و بەردەوام بێت هەتا دەیفەوتێنێت، لەوانەشە میهری خودا پێی بگات و دەریبێنێتەوە.

هەربۆیە بوخاری گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ)، سەبارەت بە بەشەکانی دووڕوویی کرداری فەرموویەتی: «چوار هەن لە هەرکەسدا هەبن ئەوە دووڕووی تەواوە، هەرکەسیش یەکێک لەوانی تێدابێت ئەوە بەشێک لە دووڕوویی تێدایە هەتا دەستی لێی دەکێشێتەوە و وازی لێدەهێنێت. .. »[٢]

بەشەکانی دووڕووییش بەوە دەبێت بکەویتە ناو کارێک لە کارەکانی دووڕووانەوە، هەروەک دەفەرمووێت (ﷺ): «هەرکەس بمرێت و غەزای نەکربێت و غەزای بە زەین و دڵیشدا نەهاتبێت، ئەوە لەسەر بەشێک لە دووڕوویی مردووە.»[٣]

هەربۆیە پەروەردگار لە قورئاندا جیاوازی زۆری لەنێوان ناوی «دووڕوو»ی ڕەها، و «ئەوەی کە دڵی نەخۆشی تێدایە» کردووە، واتە بەشێک لە دووڕوویی لە دڵدایە، لەزۆر شوێنیشدا پێکەوە و دەستلەمل هێناونی بۆ دیارخستنی هاوبەشییەتییان لە هەندێک لە بەشەکانی دووڕووییدا، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿إِذ يَقولُ المُنافِقونَ وَالَّذينَ فى قُلوبِهِم مَرَضٌ غَرَّ هؤُلاءِ دينُهُم﴾ [الأنفال: ٤٩] «وەختێک دووڕووان و ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشی تێدایە گوتیان ئەم (باوەڕدار)

---

(١) "صحيح البخاري": (٧١١٤).

(٢) "صحيح البخاري": (٣٤)، و "صحيح مسلم": (٥٨).

(٣) "صحيح مسلم": (١٩١٠).

انه ئایینەکەیان فریویداون و بوغرای کردوون.»

هەروەها دەفەرموویت: ﴿لَئِن لَم يَنتَهِ المُنافِقونَ وَالَّذينَ فى قُلوبِهِم مَرَضٌ وَالمُرجِفونَ فِى المَدينَةِ﴾ [الأحزاب: ٦٠] «ئەگەر دووڕووان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشی تێدایە دەستهەڵنەگرن ... ».

پێشەوا ئیبن کەثیر سەبارەت بە ئایەتی یەکەم: ئەوەی کە دووڕووان و ئەوانەی کە بەشێک لە دووڕوویيان تێدایە لە وەختی قەیرانی ئەمنیدا گوتیان: ﴿ما وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسولُهُ إِلّا غُرورًا﴾ [الأحزاب: ١٢] «وادەی خوا و پێغەمبەرەکەی فریودان نەبێت، هیچ نەبوو» تێبینییەکی لێوانلێ و ڕەوان و شیرین دەدات کە دەفەرموویت:

"جا ئەوی دووڕوو بوو، دووڕووییەکەی بەدەرکەوت، ئەویشی گومان و ڕاڕاییەکی هەبوو، یەکجاری حاڵی پەشێو بوو ئیدی ئەوەی بە وەسوەسە لە دڵیدا بوو هاتەسەر زاری، لەبەر لاوازی باوەڕ و تەنگ و چەڵەمەی ڕۆژێک کە تێیکەوتبوون."[١]

بەشەکانی دووڕوویی، هەروەک بەشەکانی باوەڕ؛ هەردووکی بە خوێندنەوەی نیشانە و دیاردان و حاڵەتەکاندا دەناسرێنەوە، هەروەک لە سوورەتی موحەممەددا دەفەرموویت: ﴿وَلَو نَشاءُ لَأَرَيناكَهُم فَلَعَرَفتَهُم بِسيماهُم وَلَتَعرِفَنَّهُم فى لَحنِ القَولِ وَاللَّهُ يَعلَمُ أَعمالَكُم﴾ [محمد: ٣٠] «خۆ ئەگەر بمانەوێت، ئەوانت نیشان دەدەین و جا بە سیما و شێوە دەیانناسیتەوە، سوێند بێت کە لە شێوازی قسەشیاندا هەر دەیانناسیتەوە.»

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بە هەندێک لە نیشانەکانی هەم بەشەکانی دووڕوویی و هەم بەشەکانی باوەڕ کردووە لە دوو سەحیحەکەدا، کە فەرموویەتی:

---

(١) "تفسیر ابن کثیر": (٦/٣٨٨).

«نیشانەی باوەڕ خۆشویستنی ئەنصار-پشتیوانانە، نیشانەی دووڕوویش ڕقبوونە لە پشتیوانان.»[١]

ئەم دیاردان و نیشانانەش تۆمەت دەوروژێنن، سا ئەویش بەپێی وان لاواز یان بەهێز دەبێت، هاوەڵانیش جگە لە حوذەیفە ناوی دووڕووانیان نەدەزانی، بەڵکوو پێغەمبەریش (ﷺ) هەندێکیانی پێ نەدەزانی، هەروەک پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَمِن أَهلِ المَدينَةِ مَرَدوا عَلَى النِّفاقِ لا تَعلَمُهُم نَحنُ نَعلَمُهُم﴾ [التوبە: ١٠١] «(دووڕووانێک) کە تۆ نایانزانی، ئێمە دەیانزانین.»

بەڵام هاوەڵان زۆرێک لەوانیان بەم نیشانانەدا دەناسییەوە، جا تێیاندابوو کە تۆمەتباربوو بەوە. هەربۆیە؛ کەعبی کوڕی مالیک کاتێک لە غەزاکە دواکەوت و لەدەستی فەوتا، لە چیرۆکە بەناوبانگەکەیدا؛ باس لەوە دەکات کە مەدینە جگە لە «تۆمەتبار» و «تانەلێدراوێک بە دووڕوویی» کەسی تێدا نەمابوو، هەروەک لە دوو سەحیحەکەدا لە کەعبەوە هاتووە کە دەفەرموویت: "جا کاتێک دەچوومە ناو خەڵکەوە لەپاش دەرچوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لەنێویاندا دەهاتم و دەچووم؛ خەفەتبار بووم بەوەی کە جگە لە تانەلێدراوێک بە دووڕوویی کەسێکی دیکەم نەدەبینی.»[٢]

واتە: تانەلێدراو لە ئایینیدا و تۆمەتبارکراو بە دووڕوویی، هەروەکوو زیاد لە یەکێک لە لێکدەرەوانی فەرمووده باسیان کردووە.

هەرکەسیش لەو بەشانەی دووڕوویی ڕابمێنێت کە پەروەردگار لە چەند شوێنی جیاوازی قورئاندا باسی لێ فەرمووە، بەتایبەت لە سەرەتای بەقەرە و تەوبە و ئەنفال و نموونەی ئەوانە لە سوورەتە مەدەنییەکاندا؛[٣] نهێنی ترسی

---

(١) "صحيح البخاري": (١٧)، و "صحيح مسلم": (٧٤).

(٢) "صحيح البخاري": (٤٤١٨)، و "صحيح مسلم": (٢٧٦٩).

(٣) مەدەنی: مەدینەیی، ئەو سوورەتانەی لە مەدینەیاخود پاش کۆچکردن بۆ مەدینە

هاوەڵان لە دووڕوویی دەزانێت کە هاوەڵان ترسی بنەڕەتییان ئەوە نەبوو کە بێباوەڕی بشارنەوە و باوەڕ دەربخەن. ئەمە خۆ دیارە، بەڵام لەوە دەترسان کە بکەونە ناو بەشێک لە بەشە وردەکانی دووڕووییەوە. هەربۆیە تابیعی-شوێنکەوتووی پایەبەرز ئیبن ئەبی مولەیکە وەسفی حاڵی کردوون کە وەک لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە دەفەرمووێت: "گەیشتوومەتە خزمەت سی لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هەموویان ترسی دووڕووییان لەسەر خۆیان هەبوو."[1]

لەوەشی کە ئەوە بەدەردەخات کە ترسی بنەڕەتییان لە دووڕوویی پەتی و پوخت نەبوو، بەڵکوو لە بەشە شاراوەکانی دووڕوویی بوو، تەواوی ئەو گێڕانەوەیەیە، کە ئیبن ئەبی مولەیکە دەفەرمووێت: "کەسیان نەیدەگوت کە ئەو هێندەی جبریل و میکائیل باوەڕی هەیە."

وردبەوە لەوەی کە مەبەستیان کورتهێنانی باوەڕی تەواوە بەهۆی بەربەست و کێشەی تاک تاکی بەشەکانی دووڕووییەوە، کەواتە ترسیان لە بەشەکانی دووڕوویی هەبوو؛ چونکە دەگونجێت بەشەکانی باوەڕ لەگەڵ مرۆڤدا هەتا ئاستی فەوتاندن بچن، جا بڕ و قورسایی ئەو بەشە زیادبکات بەشێوەیەک کە جێگاکە توانای بەرگەگرتنی ئیتر نەمێنێت و بەیەکجاری ڕۆشنایی باوەڕی لێ بێتە دەرەوە پەنا بە خوا، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا﴾ [البقرة: ١٠] «لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە، جا پەروەردگاریش زیاتر نەخۆشی خستن.»

وێنەی ئەم واتایە لە تەوبەشدا هاتووە کە دەفەرمووێت: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ﴾ [التوبه: ١٢٥] "ئەوانەشی کە لە دڵیاندا نەخۆشی هەبوو پیسی دیکەی لەسەر پیسی خۆیان بۆ زیادکردن".

---

دابەزیون.

(١) "صحيح البخاري": (٨٤)، بە سەنەدەوە تەماشای بکە لە: الخلال، "السُّنَّة"، تحقيق: عطية الزهراني، دار الراية، الطبعة الأولى، (١٤١٠هـ)، (ص٦٠٧).

لەپاشان بەشەکانی دووڕوویی ئەگەر مرۆڤ بەرەو ناوی دووڕوویی ڕەها بەرن ئەوجا ئەو دووڕووییە تەواوەش -دیسان- سەختییەکەی جیاوازی هەیە بەپێی توندیێتی خاوەنەکەی لە بەرهەڵستکاری و ڕقبوونەوەدا لە فەرمانی پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی، جا دووڕوو هەیە و دووڕووی یەکجاری و ڕاهاتووش هەیە، هەروەک دەوترێت شەیتان و شەیتانی سەرسەخت (شيطان مَريد) هەن، هەروەک دەفەرموویت: ﴿وَمِمَّن حَولَكُم مِنَ الأَعرابِ مُنافِقونَ وَمِن أَهلِ المَدينَةِ مَرَدوا عَلَى النِّفاقِ﴾ [التوبه: ١٠١] «لەوانەی لە دەورووبەرتانن لە دەشتەکییەکان دووڕوویان تێدایە و لە خەڵکی مەدینەش هەن کە ڕاهاتوو نیشتەجێی یەکجاری ناو دووڕووییین.»

لە گەورەترین بەشەکانی دووڕووییش نارەحەتبوون و پرتە و بۆڵەکردنە لە سەرچاوەیێتی وەحی و بەسووک ڕوانین لە چاخە زێڕینەکان و هەمیشە باس و وەسفی باشەی بێباوەڕان و پڕاوپڕبوونی دڵ لە گەورە ڕوانین لێیان، هەموو ئەمانە لە بەشەکانی نیفاقن، ئەوەی کە زۆرێک لە نووسەرانی خۆدەرە پاڵ ڕۆشنبیری نوێی ئەمڕۆ زۆر و کەم نزیکی دەکەونەوە.

بۆ ئەوەی قسەکانیش تەنها تیۆری و دیدەکی نەبن هەندێک نموونە دێنینەوە، کاتێک یەک لە ڕەمزە بەناوبانگەکانی فڕانکفۆنییەت چەند توێژینەوەیەک دەنووسێت و تێیدا دەڵێت: «بونیادی قورئان ئەفسانەییە»، لە زۆرێک لە توێژینەوەکانیشیدا هەوڵی بەستنەوەی قورئان بە ڕۆشنبیری و کەلتوورەکانی پێش ئیسلامەوە دەدات و لەسەر قەبارەی قەرزکردنی کەلتووری دەدوێت، یاخود توێژەرێکی بەناوبانگی دیکە لە نامە زانکۆییەکەیدا دەڵێت: "چیرۆکی هونەری ناو قورئان تەنها ئەفسانەی بێ حەقیقەتن، دەشکرێت لە ڕووی مێژووییەوە ڕەخنەیان لێ بگیرێت"، یاخود کاتێک ڕابەری بەڕۆژئاواکردنی ڕەها دەڵێت: "باسکردنی کتێبە ئاسمانییەکان لە ئیبراهیم و مووسا؛ واتای ڕاستییێتی ڕوودانی مێژوویی ئەوە نادات." یاخود توێژەرێکی دیکە دەڵێت: "قورئان بەرهەمێکی

کەلتوورییە، وەک بەرهەمێکی کارلێککردن لەگەڵ ژینگەی عەرەبیدا." لەگەڵ هەوڵە بەردەوامەکانیان بۆ بەستنەوەی قورئان بە میراتێکی ئایینی لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلەوە، یاخود بوحەیرای ڕاهیب، یاخود جگە لەوانیش، نموونەی دیکەی ئەم قسە و باسانەش.

جا چاودێرێکی ڕاستاڵ کە دڵی پڕبێت لە بەمەزن دانانی (اللّٰه) و ڕێزگرتنی بە ڕێزی شایانی خۆی، گومانی لەوە هەیە کە هەموو ئەوانە لە بەشەکانی دووڕوویین؟! مرۆڤێک کە خوا بە گەورەتر ببینێت لە سەلیقەی هاوچەرخ شکی لەوە هەیە کە ئەم قسە و باسانە بەشێکن لە خراپەنانەوە لە سەرزەویدا، هەروا لەو خراپەکارییەی کە خوا لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿أَم نَجعَلُ الَّذينَ آمَنوا وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ كَالمُفسِدينَ فِي الأَرضِ أَم نَجعَلُ المُتَّقينَ كَالفُجّارِ﴾ [ص: ٢٨] «ئەرێ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کاری چاکەیان کردووە وەک خراپەنێرەوان لە سەرزەویدا دانێین، یان لەخواترسان وەکوو خراپەکار و تاوانباران.»

یانی جیاوازی لەنێوان ئەم جۆرە لە توێژەران کە قورئان بە ئەفسانەکانی پێش ئیسلامەوە دەبەستنەوە و لەنێوان بێباوەڕەکانی قوڕەیشدا چییە کە دەیانگوت: ﴿وَقالوا أَساطيرُ الأَوَّلينَ اكتَتَبَها فَهِيَ تُملى عَلَيهِ بُكرَةً وَأَصيلًا﴾ [الفرقان: ٥] «وتیان ئەوە ئەفسانەی گەلانی سەرەتا و دێرینە کە دووبارە نووسیوییەتیەوە جا بەیانان و ئێواران بەسەریدا دەیخوێننەوە و پێی دادەدەن.»

کە خودی تیۆرەکەی بێباوەڕانی قوڕەیشە کاتێک بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە قورئان لە هەرزەیەکی گاورەوە وەرگیراوە کە ناوی جەبرە و لای صەفا فرۆشیاری دەکرد کە کۆیلەی ئیبن حەضرەمی بوو، هەروەک ئیبن ئیسحاق ئەوەی لە سیرەدا هێناوە، کە پەروەردگار بە دەق ئەو قسەیانی گواستووەتەوە و بەوردیش ئاماژەی بە هۆکاری پووچەڵیتییەکەی کردووە کە بریتییە لە جیاوازی تەوەری زمان کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَد نَعلَمُ أَنَّهُم يَقولونَ إِنَّما يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِسانُ

الَّذی یُلحِدونَ إِلَیهِ أَعجَمِیٌّ وَهذا لِسانٌ عَرَبِیٌّ مُبینٌ﴾ [النحل: ١٠٣] «بەڕاستی ئێمە ئەوە دەزانین کە ئەوان دەڵێن تەنها مرۆڤ ئەوەی فێرکردووە، زمانی ئەوەی ئەوان باسی لێوە دەکەن عەجەمییە، بەڵام ئەم قورئانە زمانێکی ڕوون و ڕەوانی عەرەبییە.»

نزیک لەم هەڵیت و پڵیتانەش یەکێک لە توێژەران دەڵێت: "شەریعەت و پێشین ئێمەیان کۆت کردووە، جا پێویستە کە ئیدی تەنها لە بەڵگەوە بدوێین، واتە: عەقڵی ڕەها". ئەمە واتایەکی ترسناکە، بە لای کەسەوە ئاسایی نییە مەگەر پێگە و ڕێزی خوا لە دڵیدا نەمابێت.

زۆرێک لەوڕۆشنبیرە دژبەرانەش بەرانبەر بە «دەقی بنچینەساز» وەک هەندێکیان ئاوا ناوی لێدەنێن، پێچ لە قسەکانیان دەدەن و بەمینگەمینگ و ناڕوونی دەدوێن، قسەگەلێکی ناڕوون و چونیەک سەبارەت بە پیرۆزییەکانی وەحی دەهاون، ئەوەش لە ترسی غیرەکردنی خەڵک لەسەر ئایینیان، کەچی لە خوا ناترسن کە پێشێلی سنوور و حەرامکراوەکانی دەکەن، خۆ ئەگەر خوێنەری موسڵمان کاتی زیاتری هەبا، دەربڕینی ڕاشکاوی ناشرینتریشی لەوانە دەدی کە ئەوەش دیسان لە بەشەکانی دووڕووییە، کە پەروەردگارهەواڵی ئەوەی پێ داوین کە ترسان لە جەماوەر زیاتر لە ترسان لە خودا لە پشکەکانی نیفاقە، هەروەک دەفەرموویێت: ﴿لَأَنتُم أَشَدُّ رَهبَةً فی صُدورِهِم﴾ [الحشر: ١٣] «ترسی ئێوە لە سینەیاندا لە ترسی (اللّٰه) زیاترە.»

وێنەی ئەم واتایە لە سوورەتی نیسائیشدا هاتووە کە دەفەرموویێت: ﴿إِذا فَریقٌ مِنهُم یَخشَونَ النّاسَ کَخَشیَةِ اللَّهِ أَو أَشَدَّ خَشیَةً﴾ [النساء: ٧٧] «دەبینیت گرۆیەکیان بەوێنەی ترسان لە خودا یان زیاتریش لە خەڵک دەترسن.»

پەروەردگار فەرمانیشی پێ کردووین کە پشت لەم خەڵکانە بکەین و هەرگیز دۆستایەتییان نەکەین، وەک دەفەرموویێت: ﴿وَإِذا رَأَیتَ الَّذینَ یَخوضونَ فی آیاتِنا

﴿فَأَعرِض عَنهُم حَتَّى يَخوضوا فِى حَديثٍ غَيرِهِ﴾ [الأنعام: ٦٨] «جا وەختێک ئەوانە دەبینیت کە دەم لە ئایەتەکانی ئێمە دەدەن و گاڵتەی پێدەکەن پشتیان لێبکە هەتاکوو دەچنە باسێکی دیکەوە و دەست لەوە هەڵدەگرن.»

بەڵکوو بانگەوازیکردنیان بۆ تێپەڕاندنی تێگەیشتنی چاخە زێڕینەکان کە کۆتی کردووین وەک ئەوان بانگەشەی دەکەن، شەریعەت لەوەشی هۆشیار کردووینەتەوە کە ڕوودەدات و ئاگاداری کردووینەتەوە لە ڕەواجپێدەرانی کە پێشەوا موسلیم لە پێشەکی سەحیحەکەیدا، لە ئەبوو هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «لە پاشکۆی ئوممەتەکەمدا خەڵکێک دەبن کە قسانێکتان بۆ دەکەن نە خۆتان و نە باپیرانیشتان نەیانبیستووە، جا توخنی ئەوانە نەکەون.» [١]

نیشانەی ئەم جۆرە خەڵکەش بریتییە لە شوێنکەوتنی گومانەکان و پشتکردن لە چەسپاوەکان و شەیدابوون بە لێکدانەوەی سەیر و نامۆ و دوور لە سروشتی وەحی و سیرەی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی، وەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذى أَنزَلَ عَلَيكَ الكِتابَ مِنهُ آياتٌ مُحكَماتٌ هُنَّ أُمُّ الكِتابِ وَأُخَرُ مُتَشابِهاتٌ فَأَمَّا الَّذينَ فى قُلوبِهِم زَيغٌ فَيَتَّبِعونَ ما تَشابَهَ مِنهُ ابتِغاءَ الفِتنَةِ وَابتِغاءَ تَأويلِهِ﴾ [آل عمران: ٧] «ئەو خودایەیە کە پەرتووک -قورئان-ی دابەزاندووەتە سەر تۆ، تێیدایە ئایەتانێکی چەسپاو و ڕوون کە ئەو ئایەتانە بنچینە -سەرچاوە-ی پەرتووکەکە -قورئان-ن. ئایەتانێکی دیکەشی تێدایە کە لێکچوون، جا ئەوانەی کە دڵیان لادانی تێدایە شوێن لێکچووەکانی دەکەون -دەیگرن بەدەممەوە و بەکاریدێنن- بە مەرامی ئاشووب و سەرلێشێواندن.»

لە دوو سەحیحەکەشدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) جەختی لەم نیشانەیە کردووەتەوە کە ئەم ئایەتە باسی لێ فەرمووە کە دەفەرمووێت: «جا وەختێک

---

(١) "صحيح مسلم": (٦).

ئەوانەت دی کە شوێن لێکچووەکانی دەکەون، ئەوە خۆیانن کە پەروەردگار باس و دیاریکردوون سا وریایان بە.»[١]

پێغەمبەر (ﷺ) لە چوارچێوەیەکی دیکەشدا ئەوەی باسکردووە، وەک موسلیم لە سەحیحەکەیدا لە عەبدوڵڵایی کوڕی مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «هیچ پێغەمبەرێک نییە کە پەروەردگار بەر لە من ناردبێتی و لەناو ئوممەتەکەیدا حەواری و هاوەڵانێکی نەبووبێت کە دەستبگرن بە سوننەتیەوە و لەسەر فەرمانی بڕۆن، ئیدی لەپاش ئەوان پاشکۆیانێک دێن کە ئەوەی دەیڵێن کاری پێ ناکەن، ئەوەشی دەیکەن فەرمانیان بەوە پێ نەکراوە، جا هەرکەس بە دەست -هێز- لەگەڵیان بجەنگێت، ئەوە باوەڕدارە؛ ئەوەشی بە زمان لەگەڵیان بجەنگێت ئەوە باوەڕدارە؛ هەرکەسیش بە دڵ لەگەڵیان بجەنگێت، ئەوەش باوەڕدارە. لە پاشی ئەوەوە ئیدی دەنکە خەرتالێکیش لە باوەڕ بوونی نییە.»[٢]

مەبەستیش لە هەموو ئەمە: ئەوەیە کە توێژەری ژێری بەویژدانی یەکلابووەوە ئەگەر لە دەقەکانی وەحی خودایی ڕابمێنێت و ببینێت چۆن شەریعەت ناپاکی لە سپاردە و ناخۆشکردن لە دوژمنکاریدا، وازهێنان لە ختوورە و باسی جیهاد لە دەروونددا، ڕقبوون لە پشتیوانان، وەشککەوتن لە بەڵێنی خودا و گشت نموونەکانی ئەوانەی؛ بە پشک و بەش و ئاستەکانی دووڕوویی و نیفاق داناوە؛ ئەوسا چاوترووکانێکیش گومانی لەوە نابێت کە: قەڵسبوون بە سەرچاوەیێتی وەحی، بەکەم ڕووانین لە تێگەیشتنی چاخە زێڕینەکان، بەردەوام سەرقاڵی زار و گوتار بە گەورەیی و باسی باشی بێباوەڕان، هەواڵەکردنی چەمکەکانی قورئان و سوننەت بۆ کەلتوورەکانی پێش ئیسلام، ڕووانین لە شەریعەت و پێشین وەک کۆت و کەلەپچە، بڵاوکردنەوە و ڕەواجپێدانی گومانەکان لەسەر بنچینەکانی

---

(١) "صحيح البخاري": (٤٥٣٧)، و "صحيح مسلم": (٢٦٦٥).

(٢) صحيح موسليم (٥٠)

وەحی و بەڵگەهێنانەوە، هەموو ئەمانەش لە پشکگەلێکی نابووت و توندی نیفاقن، ئەم وێستگانە ئیتر بواری خاترگری و پەڵپهێنانەوەی تێدا نییە.

هەندێک لە خەڵکیش وادەزانن کە ئەمە هەندێک زێدەڕەوی تێدایە لەڕاستیشدا: ئەو ئایەتانەی کە خرانەڕوو ئەوە بەدەردەخەن کە ئەوەی ئێمە وتمان هێشتا ماویەتی بۆ ئەوەی لەناو ئایەتەکاندا هاتووە، سەرەڕای ئەوەش نموونەیەک دێنمەوە کە هیوام وایە وێنەکە زیاتر ڕوون بکاتەوە کە ئەگەر دەنگ بەرزکردنەوە لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەجۆرێک کە لەگەڵ ڕێزلێگرتنی دژبەری هەبێت؛ بەرەو هەڵوەشانەوەی کردەوەکان سەربکێشێت، هەروەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ [الحجرات: ٢] «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەرد بەرزمەکەنەوە، بەوێنەی ئەوەی لەگەڵ یەک دەیکەن، ئاوا بەدەنگی بەرز بانگ لەو مەکەن، نەوەکا کردەوەتان هەموو هەڵوەشێتەوە و پێشی نەزانن.»

ئیتر حاڵی کەسێک چۆن دەبێت کە خەریکی چەکوشکاری و بڕین و دوورین و پەرت و جەمکردنی ڕیوایەت و گێڕانەوە پووچەکان بێت بە مەبەستی نەهێشتنی متمانەی خوێنەر بە قورئان و سوننەت؟

# ٤- جنێوی «دۆگماتیزم»

چاودێر بۆ زێدەڕەوانی مەدەنییەت تێبینی شەیدایەتی بێسنووریان دەکات سەبارەت بە تاریفکردنی ڕێژەگەرایی و تۆمەتبارکردنی نەیارەکانیان بە دەستەواژەکانی «متمانەکوێری»، «دۆگماتیزم» و«دڵنیاییێتی» و نموونەی ئەوانە.

ڕێژەگەراییش لە بابەتە ئیجتیهادی-کۆڵینەوەییەکاندا ڕەوایە و گومانی تێدا نییە، شەریعەت لە چەندەها گەواهی و بەڵگەی زۆردا چەسپاندوویەتی، لەوانە ڕووداوی بەناوبانگی «هیچ کامتان نوێژی عەسر لە بەنی قورەیزەدا نەبێت، نەکات» [1]، کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) دانی خێری بە تێگەیشتنی هەردوو کۆمەڵدا بۆ دەقەکە نا.

بەڵام کێشە لە گوتاری مەدەنیدا ئەوەیە کە هەندێکیان لە ڕووی تیۆرییەوە باس لە ڕێژەییبوون دەکەن لە بابەتەکانی بەدەر لە بابەتە بڕاوەکان، بەڵام دواتر دەبینی ئەم ڕێژەیەییبوونە لەوێدا ناوەستێت، بەڵکوو هەڵدەکشێت و هەڵدەکشێت، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، جا هەرکەسێک لە یەکێک لە بڕاوەکانی وەحیدا سەرپێچی بکات -ئیدی لە دێرینەکان، یاخود هاوچەرخەکان-، یەکێکی بۆ دەبینیتەوە بە دروشمی ڕێژەییبوون پاساوی بۆ دێنێتەوە، یاخود پاساو بە هەر چەمک و دەفرگەلێکی سازێنراو لە ماددەی خامی ڕێژەییبوون.

لە واقیعی ئەزموونێکی تاڵەوە دەڵێم؛ زۆرینەی زێدەڕەوانی مەدەنییەت کە نووسراویانم خوێندووەتەوە لە سەرەتادا باسیان لە ڕێژەیەتی لەناو بابەتە ئیجتیهادییەکاندا کردووە، ئیدی دەقەکانی شەریعەت و زانایانیشیان لەڕێزگرتن

---

(١) "صحيح البخاري": (٩٤٦)، و "صحيح مسلم": (١٧٧٠).

و عوزرپێدان لە ڕاجیایی ناو بابەتە ئیجتیهادییەکاندا هێناوەتەوە، ئەمەش بێگومان ئاستێکی ستایشکراوە، بەڵام لەپاش دەمێک دەبینیت خەریکە فەرشی ڕێژەگەرایی لە دەرەوەی ژووری بابەتە ئیجتیهادییەکانیشدا ڕادەخەن، بەم شێوەیە تاکوو بازدەدات بەرەو جێبەجێکردنی ڕێژەیەتی لە هەموو شتێکدا، جا زۆرێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت هەموو شتێک بە دیدێکی کەسی پەتی دادەنێن، هیچ سەلمێنراوێکیش لە سەلمێنراوە شەرعییەکان چەندی بڕاوە و یەکلا و ڕاشکاو و ڕوونیش بێت مافی بڕاوەیی و دڵنیایی ڕەهای پێ نادەن.

لەو شتانەشی کە لەسەر بنچینەی ڕێژەیەتی بنیادیاننناوە: ئەوەی کە کۆمەڵێک ناوناتۆرەی نابووتکەر دەنێن بە حاڵەتی «هەستیاربوون» و «غیرەکردن» لەسەر شەریعەت و پاکیزەیی، جا ئەو بانگخوازەی کە کاتێک بنەما شەرعییەکان پێشێل دەکرێن لەبەر خوا تووڕە دەبێت و ڕەنگی تێکدەچێت، ناوی لێدەنێن کەسایەتییەکی پەشۆکاو و ناجێگیر، یاخود نادان یاخود هەڵەشە و وێنەی ئەم وەسف و سووچ و خەوشانەی دەدەنەپاڵ، ئەو گوتارەی بانگەواز کە بۆ ئایین دەخرۆشێت ناولێدەنێن: گوتارێکی هەستیار و نائارام!

هەروەها لەوەی کە دیسان لەسەر بنچینەی ڕێژەیەتی بنیاتیاننناوە: قەڵسبوون و پرتە بۆڵەکردن لە باسکردنی پلەی بەرزی ئەم ئوممەتە و پێگەی بەسەر ئوممەتانی دیکەوە، زۆریش بێزارن لە باسی هەڵبژاردن و پاڵفتەکردن و خۆشویستنی پەروەردگار بۆی، بە جۆرێک لە وەهم و چەواشەکاری لەقەڵەمی دەدەن.

دیسان لەوەش لەسەر بنچینەی ڕێژەیەتی دایانمەزراندووە ئەوەی کە ڕێگیریکاری شەرعی لە خراپەکان و نەهیکردن لە تاوانکاران بە توندوتیژی و تۆراندن دەزانن، هەربۆیە؛ زۆرێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت شانازی بە ساردوسڕیانەوە دەکەن لەهەمبەر ڕووالەتەکانی کەمتەرخەمی ئاییندariدا

بەو مەبەست و دیدەی کە ئەوە ئازادی کەسییە، تایبەتمەندی و شەرەفی ئامۆژگاریخوازی کە خودا ڕێزداری کردووە بە دەمسپێتیکردن و دەستێوەردان لە کاری خەڵکی لەقەڵەم دەدەن و زۆریشی لەسەر دەڕۆن و بێبەهای دەکەن.

سا وەختێک خوێنەر لەم دیاردەیە ڕادەمێنێت ئازار دەیگوشێت کە چۆن ئاوا جێ ستایشەکانی وەحی بوونەتە جێ عەیب و تانە لەڕێگای گەمەی وشە و دەستەواژە و ناووناتۆرەکانەوە.

زۆرێکیش لەوانەی چاودێری گرفتەکانی ڕێبازی زانستی دەکەن لە توێژینەوە و مەعریفەدا، دەزانن کە ئیتر ئاوازی وەسفییەت[1] و بابەتیبوون بەرزبووەتەوە، لە بەرانبەر بێبەهاکردنی پێوەرییەتی و بڕیارەکانی بەهادا، جا توێژەری کاریگەر بە میتۆدۆلۆژی ڕۆژئاوایی دەبینیت کە ئاستی وەسف و ڕاپۆرتکاری زانستی و گەیشتن بە زانیارییەکان دەباتە ئاسمان، ئاستی بڕیاردان و هەڵسەنگاندن و باسی هەڵە و ڕاست و ڕەوا و ناڕەواش دەباتە ژێرزەوی و سووکی دەکات[2]، کاتێکیش توێژەر ئەم دیاردەیە دەپشکنێت بەوە دەگات کە کرۆکی کۆرپەیی تێیدا چەمکی ڕێژەیەتییە کە وایان لێدەکات لە بڕیاردان دووربکەونەوە و تەنها بە وەسفکردن و تۆمارکاری قایل بن، پێشوازیکردن و هەڵپەڕینیش لەسەر ئاوازی وەسفییەت و بابەتیبوون لە فەلسەفەی ڕۆژئاواییدا گەیشتووەتە ئاستی زۆر توندڕەو و ترسناک، گەمەباز و نوکتەئامێزترینی هەمووی دەربڕینەکانی «جیل دۆلۆز»(ک: ١٩٩٥ز) فەیلەسووفی فەڕەنسی هاوچەرخن، کە دەڵێت:

"بڕیاردان لەسەر شتەکان پیشەی زۆرێکە لە خەڵک، بەڵام پیشەیەکی

---

(١) وەسفییەت بە واتای تەنها تۆمارکاری و تاریفکردنی شتەکان وەک ئەوەی هەن و دەرخستنیان بەبێ لێکدانەوە و بڕیار و قسەلەسەرکردن.

(٢) بۆ فراوانترچوون لەسەر ئەم بەرانبەرێتییە چەمکییە و شوێنەوارەکانی دەتوانی بگەڕێیتەوە سەر: محمد أمزيان، "منهج البحث الاجتماعي بين الوضعية والمعيارية"، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الطبعة الثانية، (١٤١٣هـ).

باش نییە، لەبری ڕێکخستن و ناسینەوە و بڕیاردان، چونکە گرنگتر بریتییە لە: دۆزینەوە و یەکتربینین و دەستبەسەرداگرتن، مرۆڤ گسک لێدەرێکی سەرڕێگە بێت، لەوە باشترە کە دادوەر بێت. دادپەروەری و ڕاستی و پێکان بیرۆکەگەلێکی چرووک و نزمن، ئەمە بە گوتەکەی گۆدار دەرهێنەری سینەمایی بەراوورد بکە: مەبەست وێنەیەکی ڕاست نییە، تەنها وێنەیەکمان دەوێت. بەهەمان شێوەش لە فەلسەفەدا دەڵێین: هزرگەلێکی ڕاستمان نەویستووە، تەنها هزرگەلێکمان ویستووە ..."[1]

هەرکەسێکیش کە شارەزاییەکی لەسەر بنچینەی هزرە نوێکان، و پشت و ڕەگی چەمکە هاوچەرخەکان هەبێت، ڕاست دەزانێت کە ڕەواجی ڕێژەیەتی و چەمکە پەیوەستەکانی دەگەڕێتەوە بۆ «ئازادی لیبڕالی» کە ڕۆشنبیری و کەلتووری نوێی ڕۆژئاوا سەپاندوویەتی و گەلانی بەزیو و داڕووخاویش لەوی وەردەگرنەوە، کە ڕێژەیەتی بنچینەی فەلسەفی ئازادی لیبڕالییە، بەڵام بڵێین چی کە بیرۆکەی براوەکان زۆرجار لە قاڵبی هزری ناڕاشکاودا ڕەواجیان پێدەدرێت.

لەڕاستیشدا: هەرکەس چاودێری سەرەنجامەکانی ڕێژەییێتی بکات دەبینێت کە ئەو ڕێگایەیە کە هەنگاو بە هەنگاو مرۆڤ بەرەو عەدەمییەت-نەبوونی پەتی دەبات کە ئیتر خەریکە دان بە هیچێکدا نەنێت و نەچەسپێنێت، واشت لێدەکات توانای گەرمی و پێداگربوونت لەسەر هیچ سەلمێنراوێکی شەرعی نەبێت، شەرەفمەندی یەقین و دڵنیایی لە مرۆڤ دەسەنێتەوە، گۆشەگیری ئەشکەوتی شک و گومان و سەرگەردانی دەکات، جا عەدەمییەت کۆتایی ڕێگای نەمانی پێوەر و تەرازووەکانە، ئیدی ئەسڵەن نەڕاستییەک و نە بنچینەیەک بۆ بەهاکان، بگرە زانین لە خودی خۆیدا ئیتر ڕێی تێناچێت و نامێنێت، بەڵکوو عەدەمییەت لە بازنەی ئەبستمۆلۆژیادا بەوە دەگات کە لە بنەڕەتدا مەعریفە-

---

(1) Deleuze, Dialogues II, trans. Tomlinson &Habberjam, Columbia University Press, 2007, p. 8 f.

زانین خۆ ی«نامومکین و ڕێتێنەچووە» کە عەدەمییەت ماڵەڕێکی کاولکەری ئەوپەڕ مەترسیدار و سامناکە.

ئەوەشی کە ڕێژەیەتی بەرەو عەدەمییەت دەچێت ئەمە ئەنجامگیرییەکی کەسی تایبەت نییە، بەڵکوو سەلمێنراوێکی زۆر دەستاودەستپێکراوە لەناو بازنەی فەلسەفەی ڕۆژئاواییدا، تەنانەت هەندێک لە توێژەران عەدەمییەت بە هاومانای ڕێژەیەتی توندڕەو دادەنێن، هەندێکیشیان عەدەمییەت دەکاتە هاومانای ڕێژەیەتی ڕادیکاڵی. هەربۆیەش؛ هەندێک لە توێژەران دەربڕینێکی خۆشی سەبارەت بەم پەیوەندی خزمایەتییە هزرییەی نێوان ئەم چەمکانە دارشتووە کە دەڵێت: "گومانسازی -زۆرجار- تێهەڵکێشی ئەو دوو چەمکەی خزمییەتی: عەدەمییەت و ڕێژەیەتی.»[١]

بەڵام پێگەی دڵنیایی و باوەڕکردن و متمانە لە وێنای شەرعیدا پێچەوانەی ئەوە هەموویەتی. هەربۆیە؛ کە وەختێک جبریل لە لای پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت و لەو دانیشتنەدا کە لەسەر سێ بنچینەکەی ئایین ئیسلام و ئیمان-باوەڕ و ئیحسان-چاککاری پرسیاری لێکرد، ئیحسان-چاککاری بە بەرزترینی ئەم سێ ئاستە دانا، کە ئیحسانیشی بەو دڵنیاییە یەکلا بڕاوە پێناسەکرد کە گچکەترین ڕاڕاییشی تێدا نییە، بەجۆرێک کە جگە لەم حەقیقەتە هیچی دیکە لە دڵی مرۆڤدا نییە، کە دەفەرموێت: «ئیحسان ئەوەیە کە وەها (اللّٰه) بپەرستی وەک ئەوەی بە چاوی سەر ببینی.»[٢]

جا ئیحسانی بە پڕبوونی دڵ دانا لە ڕاستییێتی خودایەتی بە جۆرێک وەک ئەوەی پەروەردگار بە چاوی خۆ ببینیت کە لە واقیعدا کەسێک لە شوێن تراویلکەی ڕێژەییێتییەوە هەڵپەی بێت، دەرگای لەنێوان خۆی و ئەم پلەیە

---

(1) Petr Lom, The Limits of Doubt: The Moral and Political Implications of Skepticism, SUNY Press, 2001, p. 3.

(٢) "صحيح البخاري"، (٥٠) و "صحيح مسلم"، (٨).

داخستووە کە شەرەفمەندترین پلەکانی ئایینە، جا لەبری ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بجەنگێت تاکوو دڵنیایی وەچنگ بخات، لەگەڵ خۆید دەجەنگێت تاکوو بکەوێتە گومانەوە.

لەڕاستیشدا: ڕامانی زانستی لە سیرەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەڕوونی نیشانمانی دەدات کە دەمارگیری و غیرەکردن و پێداگرتن لەسەر شەریعەت و تووڕەبوون بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)؛ لە پێگە ستایشکراوەکانە، نە ئاژاوەیە نە نائارامی و نە ڕاڕایی و نە خۆتێوەردان و توندڕەوی.

لەوانە ئەوەی کە لە دوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرموودەی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک ئەو قوماشەی دی کە وێنەی لەسەر بوو وەک پەردە بەکاریاندێنا ڕەنگی گۆڕا[1] لە تووڕەییدا.

دیسان لە دوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پیاوێک، لەوانەیە حەزمی کوڕی ئەبی کەعب یاخود جگە لە ئەو بووبێت، لە نوێژی بەیانیان دوادەکەوت، لەبەرئەوەی پێشنوێژەکەیان زۆر درێژەی بە نوێژەکە دەدا، کە موعاذی کوڕی جەبەل بوو، جا پێغەمبەر (ﷺ) زۆر تووڕە بوو، تەنانەت ئیبن مەسعوود دەڵێت: "پێغەمبەرم (ﷺ) لە هیچ تەمبێ و ئامۆژگارییەکدا هێندی هی ئەو ڕۆژ تووڕە نەدیبوو."[2]

دیسان لە دوو سەحیحەکەدا هاتووە: لە فەرموودەی خالیدی جوهەنی لە باسی ئەو کابرایەدا کە پرسیاری سەبارەت بە وشتری ونبوو کرد، فەرمووی: «جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووڕە بوو هەتا کوڵمەکانی سوورهەڵگەڕان -یاخود دەموچاوی سوورهەڵگەڕا-، لەپاشان فەرمووی: چیت داوە بەسەریەوە؟ پێڵاو و ئاوی خۆی پێیە تا خاوەنی دەیگاتێ و دەیدۆزێتەوە.»[3]

---

(١) "صحيح البخاري"، (٦١٠٩)،و "صحيح مسلم" :(٢١٠٧).

(٢) "صحيح البخاري": (٩٠)، و "صحيح مسلم": (٤٦٦).

(٣) البخاري: ٩١، مسلم: ١٧٢٢

لە بوخاریدا هاتووە: لە فەرموودەی ئیبن عومەر کە پێغەمبەر (ﷺ) لەناو مزگەوتدا بەڵغەمێکی دی «جا توورە بوو و هەڵشاخا بە ئەهلی مزگەوتدا." [١]

نموونەی ئەم هەواڵە نەبەوییانەش زۆرن، بەڵام تەنها مەبەستمان نموونە بوو نەک کۆکردنەوەی کە ئەم فەرموودانە غیرەکردنی خودی پێغەمبەر (ﷺ) و توورەبوونی بۆ خودا لە بابەتانێکی بنچینە و بابەتانێکی نابنچینە و لقوپۆپیش بەدەردەخەن، جا لەسەر درێژکردنەوەی نوێژ توورە بوو، لەسەر هەڵواسینی وێنە توورە بوو، لەسەر هەڵگرتنەوەی وشتری ونبوو و تفکردن و قرخاندنە ناو مزگەوت توورە بوو، هەروا جگە لەوانەش.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە کاروباری ئیسلامدا گوتارێکی ساردوسڕی نەبوو وەک زێدەڕەوانی مەدەنییەت خەیاڵی دەکەن، بەڵکوو توورەیی و غیرەی لێ بەدیار دەکەوت، لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە فەرموودەی جابر کە دەفەرمووێت: **«پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێک وتاری دەدا چاوەکانی سووردەبوونەوە و دەنگی بەرزدەبوویەوە و توورەیی تینی بۆ دێنا، هەتا ئەوەی دەتگوت هاوار و ئاگاداری لە هاتنی سوپایەک دەدات و دەڵێت وا بەیانی هاتنە سەرتان، وا ئێوارە هاتنە سەرتان، هەروەها دەیفەرموو من و قیامەت وەک ئەم دووانە نێردراو و لێک نزیکین، پەنجەی شایەتومان و ئەوەی تەنیشتی (بەرزەلووتە)ی لێکدەنا.»** [٢]

جا چۆن لەدوای ئەمە دەوترێت کە غیرەکردن لەسەر چەسپاوەکانی باوەڕ و شەریعەت و پاکیزەیی و توورەبوون بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی لە هەستیاری و هەڵەشەیی و خۆتێوەردان و توندڕەوێتی و ملشکێنی و نموونەی ئەم جنێو و ناووناتۆرانەیە؟

جا توورەبوون بۆ خوا و بۆ پێغەمبەرەکەی تۆڵەکردنەوەیەکی کەسی و تایبەت

---

(١) البخاري: ١٢١٣

(٢) مسلم: ٨٦٧

و ئارەزوویەک نییە بۆ زاڵبوون و دەستگرتن بەسەر خەڵکدا، بەڵکوو لە بەرزترین بارەگاکانی ئیمانە کە ڕەنگدانەوەی لێوانلێوبوونی دڵە لە خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

ئیدی شانازیکردن و خۆهەڵکێشانیش بە دەمارساردی و نەرێنیبوون لە هەمبەر ڕوواڵەتەکانی کەمتەرخەمی ئایینی بە ناوی ئەوەوە کە ئازادیی کەسییە، ئەمە ئیدی نەخۆشییە کە مرۆڤ دەبێت چارەسەری بکات نەک بەهایەکی ڕۆشنبیرانە بێت کە خەڵکی بۆ بانگ بکرێت کە یەک لە هۆکارەکانی نەفرەتلێکرانی بەنی ئیسرائیل ساردوسڕی و نەبزووتنیان بوو لەمەڕ ڕووالەتەکانی کەمتەرخەمی ئایینی، هەروەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ(٧٨) كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ [المائده: ٧٨ - ٧٩] «نەفرین کراوە لەوانەی بێباوەڕ بوون لە بەنی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەمیش، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە سەرپێچی و دەستدرێژییان دەکرد (٧٨) لەناو خۆیاندا نەهی و ڕێگری خراپەیان لەیەکدی نەدەکرد خراپترین کارێ بوو ئەوەی کە دەیانکرد.»

لە گرنگترین ئامرازەکانی پارێزراوبوونیش لە کارەساتەکانی خەشمی خودایی؛ بوونی توێژ و خەڵکێکە لەناو کۆمەڵگادا کە غیرەیان لەسەر حەرامکراوە شەرعییەکان هەبێت، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُو بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ [هود: ١١٦] «دە با لە خەڵکی چاخانی بەر لە ئێوە گرۆیەکی دەستگرتوو بە پاشماوەیەک (لە چاکی و پاکی) هەبان کە ڕێگرییان لە خراپە بکردایە لە ڕووی زەویدا، بەڵام نەبوون کەمێک نەبێت لەوانەی کە ئێمە ڕزگاریمان بۆ نووسیبوون.»

ئیدی هەڵبژارتن و پاڵفتەکرنی ئەم ئوممەتە و باشییەتییەکەی و

شەرەفمەندکردنی بە گەواهیدان لەسەر خەڵکی جگە لە خۆی ئەوەیان لە چەسپاوەکانی وەحییە، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَجاهِدوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهادِهِ هُوَ اجتَباكُم وَما جَعَلَ عَلَيكُم فِي الدّينِ مِن حَرَجٍ مِلَّةَ أَبيكُم إِبراهيمَ هُوَ سَمّاكُمُ المُسلِمينَ مِن قَبلُ وَفي هذا لِيَكونَ الرَّسولُ شَهيدًا عَلَيكُم وَتَكونوا شُهَداءَ عَلَى النّاسِ﴾ [الحج: ٧٨] «سا تێبکۆشن لەڕێی خوادا بە تێکۆشانی شایان و حەقی خۆی کە ئەو ئێوەی هەڵبژاردووە و لە ئاییندا قورسایی و زەحمەتی نەخستوونە تەسەر، دەستی پێوە بگرن ڕێگە و ئایینی بابتان ئیبراهیم، ئەو بوو لەپێشدا ناوی لێنان موسڵمان و لەمەشدا با پێغەمبەر گەواهیدەر بێت بەسەر ئێوەوە و ئێوەش گەواهیدەر بەسەر خەڵکەوە.»

هەروا فەرموویەتی: ﴿وَكَذلِكَ جَعَلناكُم أُمَّةً وَسَطًا لِتَكونوا شُهَداءَ عَلَى النّاسِ﴾ [البقرة: ١٤٣] «ئاوەها ئێوەمان کردە ئوممەتێکی چاک و نێوەنج تاکوو ببنە شاهێد بەسەر خەڵکەوە.»

ئەم دەقانەش تەنها بەڵگەی نموونەن، وەگەرنا قورئان و سوننەت بە وێنەی زۆری دیکە لەوانە ئاوەدانە، بەجۆرێک کە هەرکەس لێی وردبێتەوە و ڕابمێنێت؛ "بڕاوەیی بڕی هاوبەش لەنێوانیان و بەتاڵییەتی دژەکانی لە چەمکەکانی زێدەڕەوی مەدەنی" دڵنیایانە دەزانێت.

# ٥- بە مەزندانانی بابەتە زەینییەکان

زۆرێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت، واتا زەینییەکان کە لەسەر گەڕان و بیر و تێڕوانین و دیدەکییەتیی پەتی و مانا ئاڵۆز و چەمکە وردەکان و ئەگەرەکانی گوتار و سەروەتی وشەسازی دامەزراوە گەورە دەکەنەوە، یانەی هزری و میوانداری ڕۆشنبیری بۆ دەکەنەوە، زۆریش لەبارەی چێژی مەعریفەتەوە دەدوێن، چێژێکی ڕاستەقینەشی لێ دەبەن نەک دەستکرد و ساختە، زۆر سەرسامیشن بە لێهاتووانی ناو ئەو بازنە مەعریفیانە، کردووشیانە بە پێوەری هەڵسەنگاندن لە ڕووانینیان بۆ خەڵک و تاکەکان، بەپێی توانا و تیژبینیان لەم بوارەدا ڕێز و پێگە بۆ خەڵک دادەنێن.

بەڵام واتا سولووکییەکان کە لەسەر: بژاری دەروون و پاککردنەوەی ویستەکانی، ڕێپێگرتنی لە هەوا و هەوەس، دەستپێگرتنەوەی لە ئارەزووەکان، ڕەتاندنی لە غەریزەکانی و وردەکارییەکانی ئەدەبی چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ پەروەردگار، چی پێ شیاوە و چی شیاو نییە، ڕێگای بەرەو بەندایەتی بۆ کردنی، نەویبوونەوە و کڕووزانەوە لەبەر دەستیدا، سکاڵا بۆ لابردنی، درێژوەستان لە میحرابی دەست لێ پانکردنەوەی، بینین و هەستبردنی واتای ناو و سیفاتەکانی، دروشم و پلەکانی دیکەی باوەڕ و پلیکانەکانی ڕێگرتنەبەر و پەرستش، هەموو ئەوە بە بەهای کەسی دادەنێن کە باسلێکردن و پێشبڕکێ تێدا کردنی بەلایانەوە زۆر جێی سەرنج و چێژ نییە و بەدڵیان نییە هەرگیز باسی بێتە ناو باسانی ناو دانیشتن و شەوچەرەکانەوە.

ئەمەش چونکە ئەم خەڵکانە هاودەمی «ڕوانین و باس»ن نە هاودەمی «بزووان و کار»، هاوەڵی «زەینییات»ن نە هاوەڵی «ویست و ورە» جا پێگەی

عەقڵ کە پادشای تێگەیشتنە لەلای ئەوان لەپێش پێگەی دڵەوەیە کە پادشای پەل و ئەندامانە، بگرە دڵ لەئاست عەقڵدا لە لایان هەر پێگەی نییە.

هەربۆیە گەورە و سەردار و خاوەنرێز لە لایان و ئەوەی مل بۆ هەژموونی دەدەن و بۆ سەرکردەیێتی دەنووشتێنەوە و خۆکوژی لەسەر سەری خۆیانی دەنێن و دەیخەنە ئاسمانەکانەوە و یەکێکیان شانازی بەوەوە دەکات کە ئەوی دیوە و پێی گەیشتووە؛ تەنها ئەو کەسەیە کە دەستی باڵای لە زانستە دیدەکی و زەینی و عەقڵییەکاندا هەبێت، ئەوەی توانای هزری و لێوەشاوەیی فەلسەفی پێوە دێت.

بەڵام کەسێکی لە خواترس کە خودا ناسینی خۆی، ویست و ورەی بەرزی لە پابەندبوون و دەستەودامانگرتنی بارەگای بەندایەتی و زاڵبوون بەسەر پاڵنەری هەوەس و غەریزەدا، چوونەخزمەت پەرتووکەکەی پەروەردگار و بەڕێکردنی کاتی دوورودرێژ لە موناجات و پاڕانەوە پێ بەخشیبێت، بەڵام دەستی لە زەینییات و زانینە عەقڵییەکاندا نەبێت؛ ئەوە بە کەسێکی سادە و ساویلکە لێ دەڕوانن، زۆرجار ناوی لێدەنێن: «دەروێش»، وەک کەم تەماشاکردن و توانجلێدان یاخود بێنیازبوون لەو حاڵەی ئەو، بگرە زۆرینەی جاران خواپەرەستی ئەم کەسە و قووڵبوونەوەی لە واتاکانی زانین و ناسینی پەروەردگاردا، وەک دەرهاویشتە و دەرەنجامی سەرنەکەوتن و بێتوانایی لەئاست زانینە هزری و تیژبیری و بابەتە عەقڵییەکاندا دەخوێننەوە.

بنچینەی ئەم حاڵەتەش بۆ پرسێکی فەلسەفی دەگەڕێتەوە هەر لە ڕۆژانی فەلسەفەی یۆنانییەوە، هێشتاش وەک فەلسەفەیەکی شاراوە و ناوەرۆکیش زیندووە، هەرچەندی لە شێوەیەکی تیۆری ڕێکخراویشدا ئاشکرا نەکرابێت، ئەم گرفتە فەلسەفییەش لەم پرسیارەدا پوخت دەبێتەوە و خۆی دەنوێنێت:

تەواوییەتی -کامڵییەتی- دەروونی مرۆڤی بە چی دەبێت؟

لە واقیعدا: فەلسەفەی کۆنی یۆنانی وەڵامێکی دەست و بردی لەسەر ئەم پرسە پێشکەشکرد کە هەندێک لەوانەی وابەستەی ئەوان بوون لە موسڵمانان لەمەدا پوختیان کردووەتەوە کە «تەواو کامڵبوونی دەروونی مرۆڤی بە وەچنگخستنی بابەتە عەقڵییەکان و زانینی نەزانراوەکان دەبێت»، سا زانینی «شتە عەقڵی» و «شتە نەزانراوەکان» ئەوەیە کە تایبەتمەندی و پێگە و کامڵییەتی بە مرۆڤ دەدات لە ئاست بوونەوەرانی دیکەدا، تێروتەسەلیێتی دەروونی مرۆڤایەتییش پەیوەستە بەوەوە.

بەگەورەدانانی گەڕان و لێکدانەوەی عەقڵی و شەیدابوون پێی، بەربڵاوە لەناو وێژەکانی ئەفلاتۆندا، تەنانەت لە وتووێژە بەناوبانگەکەی فیدۆندا هاتووە کە ئەفلاتۆن دەڵێت: "سیفەتی جیاکەرەوەی فەیلەسووف بریتییە لە پشتگوێخستنی جەستە."[١]

ئەم پرەنسیپە فەلسەفییەش کە کامڵبوونی دەروونی مرۆڤی بە زانینی نەزانراوەکان و درکپێکردنی عەقڵیاتەکان دەبێت، بە فەیلەسووفە دێرینەکانی ئیسلامیش گەیشووە، بەتایبەت بریکاری باوەڕپێکراوی دابەشکردنی فەلسەفە لەناو کەلەپووری ئیسلامیدا کە ئەبوو عەلی ئیبن سینایە؛ چونکە ئەو زانستەکانی فەلسەفەی پێش خۆی کۆکردووەتەوە و لەگەڵ بابەتە خوداییە ئیسلامییەکانی متوربەکردووە، جا ئیدی لەناو عەقڵی کەلامی ئیسلامیدا ناسراو و ئاسایی بوویەوە، هەروەها دووبارە بە ڕێکخستنێکی سەرنجڕاکێش و زمانێکی شیرین و ڕەوان دایڕێژایەوە، جا لەڕێی ئەوەوە ڕەواجێکی گەورەی پەیداکرد، هەتا ئەوەی شەهرستانی وەختێک هەژدە ڕەمز لە فەیلەسووفانی ئیسلام نمایش دەکات؛ بەوە دوایی پێ دێنێت کە دەڵێت: "بەڵام گەورە زانای ئەم گرۆیە ئەبووعەلی ئیبن سینایە، گواستنەوەی ڕێبازەکەیم لە پەرتووکەکانییەوە هەڵبژاردووە، ئیدی

---

(١) أفلاطون، "المحاورات الكاملة"، ترجمة: شوقي تمراز، الأهلية للنشر والتوزيع، (١٩٩٤م): (٣/٣٧٤).

نێچیر هەبێت لە سکی کەرەکێویدایە (نانە و کەوتووەتە ڕۆنەوە)."[١]

بەڵکوو ئیبن خەطیب فەخری ڕازی لە مەزن ڕاگرتنی ئیبن سینای فەیلەسووفی ئیسماعیلی عوبەیدیدا گەیشتووەتە ئاستێکی توندتر لەوەش، تەنانەت وەختێک بابەتی هۆکاری دروستییەتی سەربڕینی ئاژەڵ لەکاتێکدا کە ئەشکەنجەدانە و پێچەوانەی عەقڵە خراوەتە بەرباس، ئامەدەی وەک نمایشکردنی هۆکارێک دەڵێت: "بەکاربردنی بێئەرزشان بۆ بەئەرزشان لە ڕێچکە ڕێپێدراوەکانی عەقڵە"، فەخری ڕازی لە وەڵامیدا دەڵێت: "گەر وا بووایە ئەوکات دروستبوو تۆش لەبەرپێی ئیبن سینادا سەرببڕدرێیت!"[٢]

توێژەری بابەتیی گەر فووتێکردنی پێشەوایانی کەلام بۆ ئەم فەیلەسووفە ببینێت ئەوکات ناوازەیی و تیژ تێگەیشتنی پێشەوایانی ئەهلی سوننەی بۆ بەدەردەکەوێت لە بەدگومانی هەمیشەییاندا لە زانستی کەلام و کێشانی بازنەیەکی شک و تۆمەت و خۆلێپارێزی بەدەوریدا و بینینی وەک دەلاقەی دزەکردنی بیروباوەڕی ئوممەتانی دیکە بۆ ناو ئوممەتی موحەممەد (ﷺ).

ئەوەشی کە ئیبن سینا لەناو ناوخۆی فەلسەفیدا پێی هەستا، هەر وێنەی ئەوەیە کە فەخری ڕازیش لەناو ناوخۆی کەلامیدا پێی هەستا، پەیوەندی تۆکمەش لەنێوانیاندا هەیە کە ئێرە شوێنی درێژەپێدانی نییە.

مەبەستیش ئەوەیە کە فەیلەسووفانی ناو ئیسلام وەختی قسەکردنیان لەسەر ئەو هێزانەی دەروون کە تایبەتن بە مرۆڤ لە بابەتەکانی دەرووندا بە گشتی، لەوێشدا لەسەر ئەم پڕەنسیپە دەدوێن، جارجارێکیش ناوی لێدەنێن هێزە ئاخێوەرەکانی دەروون، تیایدا باس لە عەقڵی کرداری و عەقڵی تیۆری

---

(١) الشهرستاني، "الملل والنحل"، مؤسسة الرسالة، (ص ٤٣٠).

(٢) الشاطبي، "الإفادات والإنشادات"، تحقيق: أبو الأجفان، مؤسسة الرسالة، الطبعة الثانية، (١٤٠٦هـ)، (ص ٨٧).

دەکەن، یاخود هێزی توانا و هێزی زانا، هەروەها ئەوەی کە زانینی بابەتە ئەقڵی و نەزانراوەکان؛ تایبەتمەندی پایەپێدەری مرۆڤن، هەروەک ئیبن سینا لە ئینسکلۆپیدیاکەیدا دەڵێت: "تایبەتترین تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ: وێناکردنی واتا گشتییە عەقڵییە پەتییەکان و گەیشتنیەتی بە درک و لەخۆگرتنی زانیارییە نەزانراوەکان."[١]

هەر ئەوەش بە کامڵبوونی نەفس دادەنێن! هەروەک ئیبن سینا لە پەرتووکێکی دیکەدا دەڵێت: "کەماڵ و تەواوییەتیش ئەوەیە کە عەقڵپێشکاوەکانی بە واقیع بێتە چنگ، بە بینراوی و نوێنراوی لە زەیندا."[٢]

ئەمە بۆ زانایانی کەلامی ئیسلامیش گوازراوەتەوە، هەر لەوە بە نموونە ئەو وتەیەی سەیفەدین ئامەدی: "کامڵبوونی دەروونی مرۆڤی، بە وەچنگخستنی تەواوییەتییەکانیەتی کە ئەویش درککردنی عەقڵییاتەکان و زانینی نەزانراوەکانە."[٣]

قورسیش نییە دۆزینەوەی بەستەری نێوان ئەم دەربڕینەی ئامەدی و ئەو وتەیەی پێشووی ئیبن سینا کە وتی: "تایبەتترین تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ: وێناکردنی واتا گشتییە عەقڵییەکان و گەیشتنە بە درک و لەخۆگرتنی زانیارییە نەزانراوەکان."

بەڵکوو کۆڵەکە و دەمسپی زانایانی کەلامی ئەو دواییانە فەخرەدین ئیبن

---

(١) ابن سينا، "الشفاء"، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر، الفن السادس من الطبيعيات، (ص ٢٠٣)، وانظر أيضاً، ابن سينا، "النجاة"، تحقيق: عبد الرحمن عميرة، دار الجيل، الطبعة الأولى، (١٤١٢هـ): (٢/١٠).

(٢) ابن سينا، "الإشارات والتنبيهات"، مع شرح الطوسي، تحقيق: سليمان دنيا، الطبعة الثالثة، القسم الثاني، (ص ٣٩١).

(٣) الآمدي، "أبكار الأفكار"، تحقيق: أحمد المزيدي، دار الكتب العلمية، الطبعة الأولى، (١٤٢٤هـ): (١/١٣).

خەطیبی ڕازی خاوەنی (مفاتیح الغیب)، (المحصول) و (المباحث المشرقیة) و نموونەی ئەو پەرتووکانە کە ئیدی بوونە سەرچاوەی زۆرێک لە زانایانی ئەو دەمە و پاش خۆشی، پەرتووکێکی لەسەر جۆرەکانی چێژ نووسیوە کە چێژەکانی تێدا کردووەتە سێ بەشەوە، کە (چێژە عەقڵییەکان)ی بە بەرزترینیان داناوە کە فەخری ڕازی دەڵێت: "بەرزترینیشیان چێژە عەقڵییەکانن، ئەو چێژانەی کە لەڕێی زانینی شتەکان و وەستان لەئاست حەقیقەتەکانیاندا دێنە کایەوە." (١) لەپاشانیش پەرتووکەکە بە باسی سەرگەردانی و تێنەگەیشتن لەئاست ناسینی پەروەردگار، بگرە ئەستەمی ستایشکردنی؛ کۆتایی پێدێنێت، چونکە پاک و بەرزڕاگرتنی خودا لەوەی کە شایستەی نییە لەخۆیدا کەم ئەدەبییە، سیفەتە جێگیرکراوەکانیشی خۆ لەلای ئەو تەعطیلکراون-لەکارخراون جا ستایشکردنی بەوانەش هەر بێئەدەبییە، سا سەرەنجامی بەوە گەیاند -پەنا بەخوا- کە داوای لێبوردن بکات لە خودا کە چی بکات ستایشی ئەو گونجاو نییە و ڕێی تێناچێت، ئەمەیە سەرەنجامی نابووتی تەعطیل و دوا دۆڵی کۆتای لێژایی بەرەوخوارکەی بابەتە کەلامییەکان!

ئەم پڕەنسیپە تەنانەت گەیشتووەتە ناو دەقی فەرمی کەلامی کە دانراوە بۆ فێرکاری گشتی، هەروەک ئیجی لە (المواقف)دا دەڵێت: "کامڵبوونی مرۆڤ بە عەقڵپێشکانی عەقڵییاتەکان و بەدەستهێنانی نەزانراوەکانە." (٢)

پەرتووکە کەلامییەکانی ڕازی و ئامەدی بابەت و باسی تەنگەبەر و وردی هەڵبژاردەیی تێدایە کە مەرج نییە لەسەر زانستی کەلامی فەرمی ئەژمار بکرێت، بەڵام هەڵوێستەکانی ئیجی زیاتر بە دانراوێکی ئەکادیمی خوێندنی باڵا دەچن، جا ئەو وێنایانەی کە لەناو هەڵوێستەکانی ئیجیدا پشتیان پێ دەبەسترێت

---

(١) الرازي، "ذم لذات الدنيا"، (ص ٢١٢)، نص عربي منشور ضمن:
Shihadeh, The Teleological Ethics of Fakhr al-Din al-Razi, Brill, 2006, p. 212.

(٢) الإيجي، "المواقف"، دار عالم الكتب، (ص ٣).

مانایەکی چەندهێندە پەیدادەکەن لە بەهێزی دانەپاڵیان بۆ لای زانستی فەرمی کەلام، سا دزەکردنی ئەم بنچینە مەعریفییە فەلسەفییە بۆ ناو هەڵوێستەکانی ئیجی دیسان ڕەنگدانەوەی قووڵ دزەکردنی سینایی یۆنانییە بۆ ناو ڕشتەبەندی کەلامی.

دیسان لەوەشی کە توێژەر سەری لێ سوڕدەمێنێت ئەوەیە کە مامۆستایانی کەلام لە وێنەی شەهرستانی و ڕازی و ئامەدی و ئیجی هەستاون بە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی کۆڵەکە مەعریفییەکانی فەلسەفەی سینایی کە ئەویش لە فەلسەفەی نۆژەنکراوەی یۆنانییەوە وەرگیراوە، چونکە ئیبن سینا تاکە وێنایەکی فەلسەفی یۆنانی بەجێنەهێشتووە بەڵکوو پێداگربووە لەسەر پەڕاندنەوە و جێکردنەوەی هەمووی، هەروەک خودی ئیبن سینا لە سەرەتای (الشفاء) دا دەڵێت: "لە پەرتووک و پەڕاوی دێریناندا شتێکی پشتپێبەستراو نییە لەم پەرتووکەماندا دانەنابێت و جێنەکردبێتەوە."[1]

وشەی(القدماء - دێرینان)یش دەستەواژەیەکی زانستی ناو خۆیانە کە مەبەستیان لێی فەیلەسووفانی دێرینی پێشووی وەک ئەفلاتون و ئەرستۆ و نموونەی وانە کە لەگەڵ دەستەواژەی (علوم الأوائل - زانستی دێرینەکان)دا کە لەلای زانایانی سوننەت بەکاردێت؛ یەکتربڕینیان هەیە.

مەبەستیش ئەوەیە کە توێژەر ئەگەر بەراورد بکات لەنێوان ئەوەی کە لە مێژووی فەلسەفەی کۆندا هەیە لە گەورەکردنەوەی ڕوانینی عەقڵی و کردنی بە ئەوپەڕی کەماڵ و تەواوەتییەکان و لەپاشان تێبینی بخاتە سەر هەوادار و خەریکبووانی خوێندنەوەی فەلسەفە لەمڕۆدا، سەرسامبوونیان بە ڕووانین و گەڕان و تێفکران و یەکلاکردنەوەی عەقڵی، نەک کردەوە و سولووک و ئایینداری،

---

(١) ابن سينا، "الشفاء"، تحقيق: قنواتي وزملائه، المطبعة الأميرية، (١٣٧١هـ)، القسم الأول، (ص ١٠).

دەرگای درککردنی بە «پەیوەندی (فەلسەفەی) کۆن لە قاڵبی (فەلسەفەی) نوێدا» لێ دەکرێتەوە!

جا سەرقاڵانی ئەمڕۆی دۆخی فەلسەفی زانینی پەتی و واتا عەقڵی و زانستییە پەتییەکان گەورە دەکەنەوە، بە بەرزترین ئاستی کەماڵیشی دەبینن، خاوەنەکەشی بەپێی پێگە و ڕۆچوونی تێیدا پێگە بۆ دادەنێن، ئیدی ئەم مامەڵەیە ئاشکراکراو بێت، یاخود بە شێوەیەکی مەنهەجی ڕێکخراو کاری پێ بکرێت ئەگەر ناڕاشکاوانەش بێت؛ بەهای مرۆڤ لەناو ئەم توێژانەدا بەپێی زانستی عەقڵی و مەدەنی ئەو مرۆڤەیە.

لێکۆڵەرانی بلیمەتیش لە زانایانی شەریعەت لەژێر ڕۆشنایی وەحی خوداییدا وتووێژیان لەسەر ئەم فەلسەفەیە کردووە، پێکدادانی ئەم فەلسەفەیەشیان لەگەڵ دیدگای قورئاندا بۆ کەماڵ و تەواوەتی دەروونی مرۆڤ ئاشکراکردووە کە ئەو دیدە لەسەر دوو بنەما دامەزراوە، یەکەمیان: ئەوەی کە کامڵبوون بە تەنها زانست و زانیاری دەبێت، دووهەمیشیان: ئەوەی کە کامڵترینی زانستەکانیش بریتین لە زانستە عەقڵی و مەدەنییەکان.

ئەم دوو بنەمایەش هەردووک پووچەڵ و پێکدژن لەگەڵ بنچینەکانی وەحیدا، بنەمای یەکەمیان چونکە کامڵبوون لە قورئاندا بە تەنها زانست نییە بەڵکوو بە زانست و کردەوەشە، بنەمای دووهەمیشیان چونکە کامڵترینی زانستەکان بریتی نییە لە زانستە عەقڵی و مەدەنییەکان، بەڵکوو زانستە خوداییەکانە بە هەرچی لەخۆی دەگرێت لە زانست بە خودا و بە پەرتووکەکانی و بە ڕۆژی دوایی و گەڕانەوە و وێنەی ئەوانە لە واتا و ناوەڕۆکە بەرز و پیرۆزەکان.

وەڵامدانەوەی ئەم فەلسەفەیەش لەیەک ئایەتی ناو پەرتووکەکەی پەروەردگاردا پوختدەبێتەوە، کە دەفەرموێت: ﴿فَاعلَم أَنَّهُ لا إِلهَ إِلَّا اللَّهُ وَاستَغفِر لِذَنبِكَ﴾ [محمد: ١٩] «سا بزانە کە هیچ خوداییێکی پەرستراوی ڕەوا نییە جگە لە

(اللّٰه) و داوای لێخۆشبوون بۆ گوناهت بکە.»

جا ئەم ئایەتە دوو ڕستەی لەخۆگرتووە، یەکەمیان: شەرەفمەندترین زانستەکانی دەرخستووە کە زانستی پەرستراویێتییە، دووهەمیشیان: شەرەفمەندترینی کردەوەکان کە پەرستشە، ماناگەیێنی ئەم ئایەتەش بە ڕێگای (ضرب الأمثال-نموونە هێنانەوە)یە کە ڕێبازی قورئانە لە واتاسازی و ڕوونکرنەوەدا.

ئەم بیرۆکە فەلسەفییە شوێنەواری گەورەی لەسەر بونیادی فەلسەفەی دێرین و نوێ داناوە، بگرە نزیکە ڕۆڵی بنچینەی ئیبستیمی شاراوە ببینێت لە زۆرێک لە تێزە هزرییە تازەهەڵکەوتووەکاندا، هەربۆیە پێشەوا ئیبن تەیمییە لە (درء التعارض)دا دەفەرمووێت:

"هەمان بنەما و پێشەکی زەبەلاح کە کردوویانەتە ئامانج و سەرەنجامی داخوازییان کە -کامڵبوونی نەفس تەنها لە زانینی عەقڵ پێشکاوەکاندایە- پێشەکییەکی پووچە."[١]

پێشەوا ئیبن تەیمییە لە ناواخنی وتووێژەکەی لەسەر ئەم فەلسەفەیە شیکردنەوەیەکی بۆ بنەما ناوخۆییەکانی ئەم بیرۆکەیە پێشکەشکردووە کە لە (درء التعارض)دا دەفەرمووێت:

"گومڕاییشیان لە چەند ڕوویەکەوەیە، لەوانە: ئەوەی کە وادەزانن کامڵبوون تەنها لە زانیندایە، دووهەم: ئەوەی کە وادەزانن کە ئەوەی لای ئەوانە ئەوە زانستە، سێهەمیشیان: ئەوەی وا دەزانن کە ئەوە ئەو زانستەیە دەروون تەواو و کامڵ دەکات، سەرجەم ئەم پێشەکییانەش ناڕاستن و درۆن."[٢]

---

(١) ابن تيمية، "درء تعارض العقل والنقل"، تحقيق: محمد رشاد سالم: (٣/٢٦٩).

(٢) ابن تيمية، "درء تعارض العقل والنقل"، مصدر سابق: (٣/٢٧٤).

لەوەدوا ئیتر خامەی ئیبن تەیمییە بە درێژە و وردەکاری ئەوەدا دەڕوات، ئەوەشی لێرەدا ئێمە ئاماژەی پێ دەدەین ئەوەیە کە لە ئەنجامی ئەم دیدە جەوهەرییە لەناو بونیادی گوتاری زێدەڕەوانی مەدەنییەتدا، بەهای بەندایەتی و ڕێڕەوشتەکانی پاکی و پاکیزەیی پاشەکشەیان کردووە، پێشەوا ئیبن تەیمییە لە (الصفدية)دا ئاماژەی بەوەش کردووە کە دەفەرموویت: "جا خودی بەندایەتیکردنی یەکتاپەرستانە بۆ پەروەردگار و خۆشویستن و بەگەورەڕاگرتنی؛ لە گەورەترین تەواوەتی و بەختەوەرییەکانی دەروونن، نەک بەختەوەرییەکەی لە تەنها زانینێکی چۆڵ و هۆڵدا بێت لەخۆشویستن و پەرستش و بەندایەتی."[١]

بەهەرحاڵ، پێگەی «ڕووانین و تێفکران و کاروکردەوە»، هەردووک داخوازی شەرعین کە فاتیحەی قورئان هۆشیاری لەسەر داون، شەریعەت لۆمەکردنی ڕەهای خودی ئەوەی تێدا نییە، بەڵام هاتووە تاکوو تەواو و ڕێکوپێکی بکاتەوە و ئاستەکانی ڕێک بخات، بەڵام تەنها زۆرینەی فەیلەسووفەکانن کە بەڕەهایی تێفکران پێش دەخەن، زۆرینەی سۆفییەکانیشن کە کاروکردەوە بەڕەهایی پێش دەخەن، هەردووکیش جۆرێکن لە لادان، هەربۆیە پێشەوا ئیبن تەیمییە لە دەقێکی بنچینەسازی کۆکەرەوەدا فەرموویەتی:

"هەریەکێکیش لە دوو ڕێگای تێفکران و خۆیەکلاکردنەوە ڕێگای بە قازانج و سوودی مەزن و گەورەن، بەڵکوو هەریەکێکیان پێویست و ناچارییە، بەختەوەریش بەوە نەبێت بەدەست نایەت، قورئانیش هەمووی بانگەوازیکردنە بۆ ڕووانین و پەندوەرگری و فکران، هەروەها بۆ بژاری دەروون و دونیانەویستی و پەرستش، قورئان باسی لە چاکی و بەکەڵکی هێزی دیدەکی زانستی و هێزی ویستی کرداریش فەرمووە، لە زیاد لە شوێنێکیدا، لە وێنەی ئەوەی کە دەفەرموویت: "هەر ئەو خودایەیە کە پەیامبەرەکەی بە ڕێنومایی و ئایینی

---

(١) ابن تيمية، "الصفدية"، تحقيق: محمد رشاد سالم، دار الهدي النبوي، الطبعة الأولى، (١٤٢١هـ): (٢/٢٣٤).

حەق و ڕەوا ناردووە تاکوو بەسەر گشت ئایینداا زاڵ و سەرکەوتووی بکات"، جا ڕێنومایی: تەواویێتی زانست، و ئایینی حەق: تەواوی کردەوە و کارە، هەروا لە وێنەی ئەوە کە دەفەرمووێت: "(پێغەمبەرانێکی) خاوەن دەست و بینایی ..."[(١)]

لێرەشدا سەرنجێکی زۆر ناسک و پاراو هەیە کە بریتییە لە دانایی وردی شەرعی ئاوێزان بە دانایی گەردوونی، ئەوی کە پەروەردگار هەر گرۆیەک لە بەندەکانی بە جۆری غەریزە و ئارەزووی چێنراو تێیاندا تاقیکردووەتەوە، جا لە ڕووی شەرعەوە بەوەی تاقیکردوونەتەوە کە لەگەڵ واقیعی گەردوونیان دەگونجێت، یانی ئەوەی کە پەروەردگار توانا عەقڵییە بێشومارەکانی پێ بەخشیوە؛ بە ملکەچی و ڕادەستبوون بۆ شەرع و شوێنکەوتنی وەحی و کارکردن بەوەی تێیدا هاتووە تاقیکردوونەوە؛ کە کارکردن لەسەر ئەم جۆرە نەفس و دەروونانە گەلێک سەختە.

ئەوەشی پەروەردگار هێزی ویست و ورەی پێداوە؛ بە شوێنکەوتنی بەڵگە و زێدەڕەوی نەکردن لە ڕەبەنی و خۆدابڕینی پەرستشی بە ئامانجی گەیشتن بە چێژێکی غەریزەیی ڕۆحی، تاقیکردوونەوە کە گرتنەوەی نەفس لە زێدەڕۆیشتن و لەدەستدەرچوون بەناو ڕۆحانییاتێکدا لە دەرەوەی ئەوەی کە پەروەردگار فەرمانی پێکردووە؛ لەسەر ئەم جۆرە دەروونانە گەلێک سەختە.

جا پەروەردگار زیرەکان و عاقڵمەندانی بە هەڵنان و پاڵنانی نەفس بۆ بەندایەتی تاقیی کردەوە، ڕۆحانی و پەرستشکارانی بە چاک و ڕاست پەرستشکردن لەسەر ڕێنمایی و دەستگرتنەوە و سوننەتی موحەممەد (ﷺ) تاقیی کردەوە، کۆتایی فاتیحەش بە دوو نموونەی خەشملێگیراوان و گومڕایان ئاماژەی بەوە کردووە و بە پاراوترین واتا کە لە ڕێگای (ضرب الأمثال-نموونەهێنانەوە)یە کە زۆرینەی شێوازی قورئان ئەوەیە.

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٢/٥٩).

هەرکەسیش لەم پرسە فەلسەفییە و ئاڕاستە جیاجیاکانی خەڵک تێیدا بکۆڵێتەوە، هەم لە ڕووی تیۆری و هەم لە ڕووی کردارییەوە؛ نهێنی ئەو دەستگرتنەوە و بێباکییە قووڵە کە لە ئاست بەهای ناسین و تێگەیشتنی وەحیدا لەلای زێدەڕەوانی مەدەنییەت هەیە بۆی دەردەکەوێت، ئەوەش لەبەرانبەر سەرسامی و شەیدایی و لێبراوییان لە خوێندنەوە و بەدواداچوونی زانستە مەدەنییەکان و گەورەکردنەوەی هاوەڵانی، بگرە دانانی فیقهی شەریعەت لە نزمترین ئاستەکاندا لەبەرئەوەی کە بابەتی عەقڵپێشکاو و مەدەنی تێدا نییە، بەڵکوو ئەوپەڕی تەنها باسکردنە لە وردەکاری بابەتە کردارییەکان، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە لە (الصفدية)دا دەفەرمووێت: "ئیدی زانستی دیدەکی و تیۆریشیان کردووەتە ئەوسەری ئامانج، بنیاد لەسەر ئەوەی کە کەماڵ و تەواوەتی نەفس لەزانستدایە، جا «زانستی فیقهـ» بە زانستی کرداری دەبینن، بۆیە بردوویانەتە نزمترین پلە و ئاستەوە.» [1]

قورئان ئەم حەز و هەوا مرۆڤییەی بۆ وەدەرخستووین و لەوەشی هۆشیارکردووینەتەوە کە زانستە خوداییەکان بە مەزنترینی سەرزەوی دابنێین لەناو سەرجەم زانست و ڕوواڵەتە مەدەنییەکاندا، بەڵکوو پەروەردگارمان باسی لە سات و پێگەی دڵخۆش و شادبوون بە قورئان فەرمووە، هەروەک لە سوورەتی یونوسدا دەفەرمووێت: ﴿يا أَيُّهَا النّاسُ قَد جاءَتكُم مَوعِظَةٌ مِن رَبِّكُم وَشِفاءٌ لِما فِي الصُّدورِ وَهُدًى وَرَحمَةٌ لِلمُؤمِنينَ(ﶋ) قُل بِفَضلِ اللَّهِ وَبِرَحمَتِهِ فَبِذلِكَ فَليَفرَحوا هُوَ خَيرٌ مِمّا يَجمَعونَ﴾ [يونس: ٥٧ - ٥٨] «ئەی خەڵکینە بەڕاستی ئامۆژگارییەکتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە و هەروەها شیفا و چارە بۆ ئەوەی لەسینەکاندایە بۆ هاتووە و هەروا ڕێنومایی و میهر بۆ باوەڕداران. بڵێ بە فەزڵ و مننەت و بە میهری خودا سا بەوە با دڵخۆش و شاد بن ئەوە چاکترێکە لەوەی گلێری دەکەنەوە و

---

(١) ابن تيمية، "الصفدية"، تحقيق: محمد رشاد سالم، دار الهدي النبوي، الطبعة الأولى، (١٤٢١هـ): (١/٢٧٢).

هەڵیدەگرن (لە ماڵی دونیا).»

جا ئەم قورئانەی بە مەزنترین مننەت و بەخششێک داناوە کە مایە و شایانی خۆشی و شادی بێت، وەک ڕێک و ڕاستەوخۆ پەروەرگارمان لە ئایەتەکەدا دەفەرمووێت: «سا بەوە با دڵخۆش و شاد بن.»

یەکەم خوێنەریش ئوبەی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێت) تێبینی ئەو واتا مەزنەی نێو ئەم ئایەتەی دابوو کە وەختێک ئوبەی کوڕی کەعب چیرۆکە ناسراوەکەی خۆی بۆ شوێنکەوتووان گێڕایەوە کە پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) کردبوو کە سوورەتێکی دیاریکراو بەسەر ئوبەی کوڕی کەعبدا بخوێنێتەوە، شوێنکەوتووی پایەبەرز عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبزا لێی پرسی: "ئەرێ بابی مونذیر، جا تۆش بەوە دڵت خۆشبوو؟"، ئوبەی کوڕی کەعب فەرمووی: "جا بۆ پێی دڵخۆش نەبم وەختێکی کە (الله) فەرموویەتی: «بڵێ بە فەزڵ و مننەتی خودا و بە میهری، دە با بەوە دڵخۆش و شاد بن ئەوە لەوی چاترە کە گلێری دەکەنەوە و هەڵیدەگرن (لە ماڵی دونیا)»"[١]

هەربۆیە؛ گەورەزانا ڕاغیبی ئەصفەهانی باسی لەوە کردووە کە مۆڵەتی شادی لەم ئایەتەی سوورەتی یونوسدا نەبێت، نەدراوە، هەروەها ئایەتی ﴿وَيَومَئِذٍ يَفرَحُ المُؤمِنونَ﴾ [الروم: ٤] «ئەو ڕۆژی باوەڕداران دڵخۆش و شاد دەبن!»[٢]

لە زۆر شوێنی قورئانیشدا بەراورد لەنێوان بەهای وەحی و بەهای سەرمایە دونیاییەکاندا کراوە، بەم وەحییە ئاگاداری داوەتە باوەڕداران کە ئەوەی ناوەڕۆک تێیدایە گەورەترە لە هەرچییەک کە دەیبینین لە ڕوواڵەتە دونیاییەکان، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَد آتَيناكَ سَبعًا مِنَ المَثاني وَالقُرآنَ العَظيمَ(٨٧) لا تَمُدَّنَّ

---

(١) "مسند الإمام أحمد": (٢١١٣٧).

(٢) الأصفهاني، "المفردات"، تحقيق: صفوان داوودي، دار القلم، الطبعة الأولى، (١٤١٢هـ)، (ص٦٢٨).

عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ﴾ [الحجر: ٨٧ - ٨٨] «بەڕاستی ئێمە حەوتی دووپاتبۆوە (حەوت ئایەتی فاتیحە کە هەرچی نوێژە دەخوێندرێنەوە)مان بە تۆ بەخشی هەروا قورئانی مەزنیش. چاو بۆ ئەوە درێژ مەکە کە بە پۆلانێک لەو بێباوەڕانەمان بەخشیوە لە جوانی و زیبایی ژیانی دونیا.»

ئەمانەشی کە زەینییات و عەقڵییات و هزرییاتەکان گەورە و زل دەکەنەوە هەمیشە ڕەهەندە پەنهانەکانی تێگەیشتن و ڕاستی و پێکانیان لێ بزردەبێت، تەنها هۆشیان لای ئەوەیە کە تێگەیشتن وابەستە بە زیرەکییە، پێکانیش وابەستە بە توانا عەقڵییەکانە، لە وەختێکیدا کە هۆیێکی سەرووتر و زۆر بەهێزتر لەوە هەیە کە «دەستگیرۆیی خودایی»ە.

هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت:

"لەوانەیە کەسێک لە توێژی زیرەک و بلیمەت و بیرتیژانی ناو خەڵک بێت، بەڵام خودا لە سادەترین شتەکانیشدا کوێرایی بەسەر بێنێت، لەوانەشە لە گەوج و داماو و زەینلاوازترینیان بێت، کەچی لە بابەتی ڕاجیایی بەهێزدا خودا بە ویستی خۆی ڕێنماییکراو و بەرچاوڕۆشنی بکات، سا هیچ هێز و بزووتنێک بەبێ (اللّٰه) نییە، هەرکەسیش پشتی بە گەڕان و ڕووانین و زەین و بەڵگەسازی و عەقڵ و ئاوەزی خۆی بەستبێت، پشتی دەشکێت"(١)

لەپاش ئەم گەشتە بەناو تۆمارگای زلکردنەوەی عەقڵییاتەکان و فووکردن لە زەینییاتەکان لەناو گوتاری بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددیدا، دەچینە سەر دوو گرفتی دیکەی تۆکمەبەستراو بە هەر ئەم بابەتەی گەورەکردنەوەی زەینیاتەکانەوە، ئەوانیش: هۆسازی ماددی بۆ شەریعەت و کارلێکی دەروونی بە وەحین کە لە دوو بەشی داهاتوودا قسەیان لەسەر دەکەین.

---

(١) ابن تيمية، «درء تعارض العقل والنقل»، تحقيق: محمد رشاد سالم: (٩/٣٤).

# ٦- هۆسازی ماددی بۆ شەریعەت

زۆرێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت لە میانەی هەوڵەکانیاندا بۆ چەسپاندنی گرینگی بابەتی مەدەنییەت، هەوڵدەدەن دروشم و شەریعەتەکان بە شارستانییەت و ژیانی مەدەنییەوە ببەستنەوە، جا -بەنموونە- دەیانبینیت دەڵێن: "ئامانج و مەبەست لە دروشمەکان ڕێکخستنی خوڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکانە، ئامانج و مەبەست لە تەشریعیش بەڕێوەبردنی بەرژەوەندییە گشتییەکانە"، هەروا وێنەی دیکەی ئەو قسەیەش.

هەندێک لە شوێنکەوتووانی تەوژمە ئیسلامییەکانیش لە نیازپاکییەوە لەوەدا هاوبەشیان کردووە کە مەبەستیان نزیککردنەوەی ئیسلام بووە لە چینی ڕۆشنبیری ڕۆژئاواپەروەر، جا لەسەر ئەم بنەمایە قسەیان لە مەبەستەکانی شەریعەتدا کردووە، لە زۆرترینی ئەو هۆکارانەش کە لەو وەهمەدا یارمەتیداون هەڵە تێگەیشتنیانە بۆ هەندێک لە دەربڕینەکانی زانایانی ئەودواییانەی ئوسووڵییەکان لە زانستی مەبەستەکانی شەریعەت و زانستی سیاسەتی شەرعی لەمەڕ بەرژەوەندی و (پێنج پێویستێکە - الضرورات الخمس) و نموونەی ئەوانە.

ئەوەشی بەشوێن ئەم ئاڕاستانەدا نووسیبێتی لە شوێنکەوتووانی هزری ئیسلامی بە پاڵنەری ئەوەوە کردوویەتی کە لە ڕوواڵەتی ئەم بیرۆکەیەدا بەمەزن ڕاگرتنی شەریعەت و ستایشکردنی دیوە، ئاگاشی لە شوێنەوار و سەرەنجام و دواهاتەکانی نەبووە.

کە لە لێکەوتەکانی ئەم دیدە کە زۆرێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی پێی گەیشتوون ئەوەیە کە وەختێک هەندێک لە کۆمەڵگا ناموسڵمانەکانیان

دیوە گرنگی بە هەندێک خوڕەوشتی کۆمەڵایەتی و سیاسەتی بەرژەوەندییە گشتییەکان دەدەن، هەستیان کردووە کە ئەو کۆمەڵگەیانە مەبەستی ئیسلامیان بەجێهێناوە، با ئامراز و ڕێگاکانی ئەویشیان نەگرتبێتەبەر، پەندیش لە مەبەست و ئەنجامەکاندایە نەک لە ئامراز و ڕێگاکاندا، بەڵکوو هەندێکیان ئەو دەربڕینە ساویلکانەیەی عەبدە دووبارە دەکەنەوە: "لە ڕۆژئاوا ئیسلامێکم دی بەبێ موسڵمانان"، واتە: ئەو مەبەستەکانی ئیسلامی دیوە با ئەوانەش موسڵمان نەبووبێتن کە نواندوویانە، جا بەهای فەرمانپێکراو و ڕێلێگیراوە خوداییەکان پاشەکشەی کرد، وەختێک مەبەستەکانی تەنها لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ماددیدا کورتکرانەوە.

بگرە ئەوان زۆرجار ئاماژە بەوە دەکەن کە فەقیهە دێرین و هاوچەرخەکانی ئیسلام تەنها سەرقاڵی وردەکاری ئەو فەرمان و نەهیانە بوون کە لە دەقەکانی وەحیدا هاتووە، لەکاتێکدا کە گەلانی پێشکەوتوو مەبەستەکانیشیان بەبێ ئەم ڕۆچوونە لە وردەکارییەکان بەدیهێناوە، سا سەرەنجامی ئەم بیرۆکەیە دەستگرتنەوە و بێباکی بوو لە تێگەیشتنی وەحی و هەروەها سەرسامبوون بوو بە کۆمەڵگا بێباوەڕەکان.

لە شوێنەوارەکانی ئەم تێڕوانینەش ئەوەبوو کە بەهای وردەکارییەکانی وەحی پاشەکشەی کرد، هەربۆیە هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی بە چەند شێوازی جیاواز بیرۆکەیەکیان هاویشتووە و نووسیوە کە دەڵێت: ئەو مرۆڤەی کە لە خوڕەوشتی کۆمەڵایەتیدا ڕێکوپێک و بەجێیە، بەڵام (اللّٰه) ناپەرستێت باشترە لەو کەسە خواپەرستەی کە لەڕەوشتیدا هەندێک وشکوڕەقی و ناچیزەیی هەیە، چونکە یەکەمیان مەبەستی هێناوەتەجێ، بەڵام دووەمیان ئامرازی بەدەستە، پێگەی مەبەستیش لەپێش ئامرازەوەیە.

بەڵکوو هەندێک لەوانەی پیشەیان بۆتە گسکلێدان و سڕینەوەی بابەتە

شەرعییەکان، پرسیار و گرفتسازییەکانیان گەیشتووەتە ئاستی تاوانە گەورەکان، هێشتا تاڵی و نابوودی ئەو قسەیەی یەکێکیانم لەیادە کە سەبارەت بە «ڕۆڵی پێشکەوتنی نوێ لە لادانی حەرامییێتی حەرامکراوەکاندا» قسەی دەکرد، بەوەش نموونەی هێنایەوە کە حەرامکردنی مەی مەبەستی شەرعی لێی تەنها پاراستنی تەندروستی جەستە و کۆنترۆڵکردنی هەڵسوکەوتەکانی عەقڵە، جا لەگەڵ گەشەسەندنی میکانیزمە تەشریعییەکان و دەزگا تەندروستییەکان و کارگەکانی بەرهەمهێنان و سیستمەکانی تاوانکاریدا؛ دەگونجێت ئەوە ڕێک بخرێت و بەپێی چەند کۆت و مەرجێک ڕێگەی پێ بدرێت، بە شێوازێک کە بکرێت بەرژەوەندی مەی تێدا وەچنگبخرێت کە ئەو ئایەتە ئاماژەی پێ کردووە «.. . و سوودگەلێکی بۆ خەڵک تێدایە... » لەگەڵیشیدا لادانی ئەو زیانەی کە شەریعەت مەبەستی لادانی بووە.

یەکێکی دیکەیان دەنووسێت: مەبەستی شەرعی لە حەرامکردنی سەرجێیی لە دەرەوەی دامەزراوەی هاوسەرگیریدا تەنها بریتییە لە «پاراستنی نەژاد و وەچە» بنیاد لەسەر ئەوە؛ ئێستا کە تەکنیکە تازەکانی شیکاری پزیشکی لە دۆزینەوەی نەژاددا لەڕێی ترشی ناوکی (DNA)یەوە پەرەیان سەندووە و سیستمەکانی چاودێری کۆمەڵایەتی مناڵان گەشەیان سەندووە، ئیدی ئەنجامی ئەوە دەبێتە حەڵاڵییێتی پەیوەندی ناشەرعی لەنێوان هەردوو ڕەگەزدا؛ چونکە حوکم بە بوون و نەبوون پێوەندە بە هۆکاری خۆیەوە، زیانی تێکەڵبوونی نەژادەکان و زایەبوونی وەچەش ئیدی گەلێک دوورە و ترسی نەماوە.

ئەم نموونانەی پێشووش -هەرچەندی نموونەگەلێکی توندڕەون- و بەهۆی قێزەونی و ناشرینی ئەنجام و وێنەی کۆتاییانەوە بڵاو نەبوونەتەوە؛ بەڵام ئەو سەرەنجامە ترسناکانە بەدەردەخەن کە بەستنەوەی دروشم و شەریعەتەکان بە تەنها مەبەستە ماددی یاخود کۆمەڵایەتی یاخود مەدەنییەکان و نموونەی ئەوانەوە هەیانە، هەروەها بێئاگابوون لە مەبەستە سەرەتایی و یەکەمەکان کە

وەحی لەسەریان هاتووەتەدەنگ.

بنچینەی سەرجەم ئەم لادانانەش گومڕابوونە لە تێگەیشتنی مەبەستی شەریعەت لە دروشم و حوکمە شەرعێکانیدا و کورتکردنەوەی گشت ئەو مەبەستانە لە بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی و مەدەنی و ماددیدا، هەتاکوو وەختی هەندێک لەو مەبەستە کۆمەڵایەتییانە لە جگەڕێگای شەریعەتەوە بەدیهاتن، ئیدی ئەوان مانایەک بۆ پەرستش و تەشریعە خوداییەکان نابیننەوە، لێرەدا بەکورتی ئاماژە بە کۆمەڵێک لە مەبەستەکان دەدەین؛ تەنها وەک نموونە نەک تاسەرچوون و کۆکردنەوەی گشتی، نموونەش بەسە بۆ هۆشیاریدان لە جۆری ئەم هاوشێوانە.

جا پەرستشە دەرەکییەکان و ناوەکییەکان -نموونەی دەرەکییەکان: نوێژ، نموونەی ناوەکییەکانیش: پشتبەستن -ئەوانە- بەر لە هەموو شتێک- بنەڕەتی تەشریعیاندا تەنها ئامڕاز نین بۆ غەیری خۆیان، بەڵکوو لە خودی خۆیاندا ئامانج و مەبەستی داواکراو و ویستراو و خۆشویستراوی پەروەردگارن، چونکە خودا پێی خۆشە بەندەکەی ببینێت کڕنوش و ڕکوع دەبات و دەوەستێت و دەچێتە تەواف، یادی بەرزڕادەگرێت، یەقینی پێیەتی، نییەت سافە بۆی، خۆشی دەوێت و بە قەزای ئەو ڕازی و بڕوادارە؛ کە پەروەردگار بە پەروەردگارییێتی خۆی پێی خۆشە لە بەندەکەی بەندایەتی ببینێت.

سا مەبەستی یەکەمی (اللّٰه) لە تەشریعکردنی ئەم پەرستشە دەرەکی و ناوەکییانە ئەوەیە کە لەلای خۆشەویستە، بەوەش شوێنەواری ناو و سیفاتە تەواو و کامڵەکانی دێنەدی، لە ئێمەشی دەوێت و پێخۆشە کە پێی هەستین. هەربۆیە؛ وەختێک پەروەردگار وا باس لە پاکییەتی دەفەرمووێت: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾ [التوبه: ١٠٨] «(لەوماڵانەی خودادا) پیاوانێک هەن کە پێیانخۆشە پاکببنەوە و پاک بمێنن کە خوداش خۆپاکڕاگرانی

خۆش دەوێت.»

لە دوو سەحیحەکەشدا لە فەرموودەی ئەبوو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «خودا تاکە و تاکیشی پێ خۆشە و خۆشدەوێت.»[1]

ئیدی مەبەستی یەکەمی بەندەش لە هەستان بەم کردەوانە پەرستشکردنە بۆ پەروەردگار و گەیشتنە بە میهری ئەو، هەروەک دەفەرموێت: ﴿وَهذا كِتابٌ أَنزَلناهُ مُبارَكٌ فَاتَّبِعوهُ وَاتَّقوا لَعَلَّكُم تُرحَمونَ﴾ [الأنعام: ١٥٥] «ئەمەش پەرتووکێکە دامانبەزاندووە پیرۆز و پڕفەڕ، سا شوێنی بکەون و لەخوا بترسێن، با بێتە هۆی ڕەحمپێکردنتان.»

ئەوەشی کە هاتووە لە ڕۆڵی پەرستشەکان لە ڕێکخستن و بژارکردنی ڕەوشتدا، وەک ئەوەی دەفەرموێت: ﴿اتلُ ما أوحِيَ إِلَيكَ مِنَ الكِتابِ وَأَقِمِ الصَّلاةَ إِنَّ الصَّلاةَ تَنهى عَنِ الفَحشاءِ وَالمُنكَرِ﴾ [العنكبوت: ٤٥] «بەڕاستی کە نوێژ ڕێگری لە سەرپێچی و تاوانانی نابوود و بەد دەکات.»

ئەوپەڕی واتا و مەبەست لەم ئایەتە و هاوشێوەکانی ئەوەیە کە شوێنەواری ڕەوشتی یەک لە شوێنەوارەکانە لەناو ئەو هەمووە مەبەست و داناییە ستایشکراوانەی دیکەدا، نەک هۆی بنچینەیی تەشریعکردن بێت، جیاوازیش زۆرە لەنێوان هۆکار و شوێنەواردا، لەپاشان ئەم ئایەتەش ڕوونی دەکاتەوە کە شوێنەواری ڕەوشتی تەنها لە خوڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکاندا کورت نابێتەوە، بەڵکوو لە پێشدا خۆڕەوشتە ئیمانییەکان دێنی وەک دوورکەوتنەوە لە تاوان و سەرپێچێکان.

خۆ ئەگەر خوڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان هۆی کرۆکی تەشریعکردن بوونایە لەم پەرستشانەدا، پەروەردگار ئاوا هەستان بەم دروشمانە و وردەکارییەکانیانی

---

(١) "صحيح البخاري": (٦٤١٠)، و "صحيح مسلم": (٢٦٧٧).

نەدەخستە ئەستۆی بەندەکان لەکاتێکدا ئێمە خەڵکێکی زۆر دەبینین کە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی جوانیان تێدایە بەبێ ئەم دروشمانەش، تەنانەت پەروەردگار باسی لە سپاردەپارێزی هەندێک لە جوولەکە فەرمووە لەگەڵ بێباوەڕیشیاندا، هەروەک دەفەرموویت: ﴿وَمِن أَهلِ الكِتابِ مَن إِن تَأمَنهُ بِقِنطارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيكَ﴾ [آل عمران: ۷۵] «لە هاوەڵانی پەرتووک هەن کەسانێک کە گەر باروبنەیەکیش (بڕێکی زۆر) بە سپاردە بدەیتە دەستیان بە پارێزراوی بۆتی دەگەڕێننەوە»، بگرە ئەوکات ڕاسپاردنی بەدیهێنراوان بەم دروشمانە لەلایەن پەروەردگارەوە تەنها لەپێناو خوڕەوشتی کۆمەڵایەتیدا درێژکردنەوەی ڕێگا و عەبەسییەتێک دەبوو کە دوورە لە زاتی بەرز و پیرۆزییەوە.

لەپاش ئەوەی کە لە خودی خۆیاندا حاڵێکی داواکراو و ویستراون، لەوەودوا مەبەستگەلێکی دیکەش دێن کە مەزنترین و گرینگترین مەبەستی دروشمە دەرەکییەکان بژارکردنی دەروونە بەناو پلە و پێگەکانی باوەڕدا، لە وێنەی پاڕانەوە و ملکەچی و خۆبچووککرنەوە و سەرکزکردن و موناجات و وابەستەبوون و هاوار بۆ لابردن و خۆگەوزاندن و زەبوونبوون لەبەردەست پەروەردگاردا و هەڵهاتن بۆ لای و پڕبوونی دڵ لە سوپاس و ستایش بۆ ئەو.

ئەم مەبەستە مەزنەش کە بژارکردنی دەروون و ئاوەدانکردنەوەی دڵەکانە بە (اللّٰه) هەم دروشم و هەم شەریعەتەکانیش دەگرێتەوە، چونکە بنچینەی فەرمانپێکراوەکان و بنچینەی ڕێلێگیراوەکان سەرجەم پاکی و چاکی و پارێزراوی بۆ دڵ دێننە بەرهەم کە لە گەورەترین داخوازییە خوداییەکانە، چەند نموونەیەکیش بۆ ئەوە باس دەکەین.

لەوانە ئەوەی وەختێک خودا ڕۆژووی تەشریع کرد مەبەستی جەوهەری ڕێجیمی تەندروستی نەبوو، هەروەک زێدەڕەوانی مەدەنییەت دەیڵێن لەوانەی کە تەشریعەکان لەسەر مەبەستی ماددی پەتی بنیاددەنێن، بەڵکوو ئامانجی

سەرەکی ئەو لەخواترسییەیە کە لە دڵدا بەجێیدێڵێت، (اللّٰه) دەفەرموویت: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا كُتِبَ عَلَيكُمُ الصِّيامُ كَما كُتِبَ عَلَى الَّذينَ مِن قَبلِكُم لَعَلَّكُم تَتَّقونَ﴾ [البقرة: ١٨٣] «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە (فەڕزکراوە) وەک چۆن لەسەر ئەوانەی بەر لە ئێوەش نووسراوە تا هۆی لەخواترسانتان بێت.»

وەختێکیش باس لە تەشریعکردنی زەکات و خێرکردن و بەستنەوەیان بە بژاری نەفسەوە دەکات، دەفەرموویت: ﴿خُذ مِن أَموالِهِم صَدَقَةً تُطَهِّرُهُم وَتُزَكّيهِم بِها﴾ [التوبە: ١٠٣] «لە ماڵ و سامانەکانیان بەشێک وەربگرە لێیان کە پاکیان بکاتەوە و بژاری دەروونیان بکەیت پێی.»

کاتێکیش پەروەردگار باس لە تەشریعکردنی جیهاد دەکات ئەو پاڵفتەکردن و بژارەی کە جیهاد بۆ دڵی دێنێتە بەرهەم دەخاتەڕوو، کە دەفەرموویت: ﴿وَلِيَبتَلِيَ اللَّهُ ما في صُدورِكُم وَلِيُمَحِّصَ ما في قُلوبِكُم﴾ [آل عمران: ١٥٤] «تاکوو پەروەردگار ئەوەی لە سینەتاندایە تاقیبکاتەوە و تاکوو ئەوەی لە دڵەکانتاندایە پاڵفتەی بکات.»

کاتێکیش تەشریعاتەکانی خێزان باس دەکات سەبارەت بە ڕێگریکردنی سەرپەرشتانی ئافرەتان لەو ئافرەتانە دەفەرموویت: ﴿فَلا تَعضُلوهُنَّ أَن يَنكِحنَ أَزواجَهُنَّ إِذا تَراضَوا بَينَهُم بِالمَعروفِ ذٰلِكَ يوعَظُ بِهِ مَن كانَ مِنكُم يُؤمِنُ بِاللَّهِ وَاليَومِ الآخِرِ ذٰلِكُم أَزكىٰ لَكُم وَأَطهَرُ﴾ [البقرة: ٢٣٢] «.. . سا ئەوکات ڕێگرییان لێ مەکەن کە بگەڕێنەوە لای مێردەکانیان ئەگەر لەنێوان خۆیاندا بە چاکە ڕازیبوون و ئاشتەواییان کرد، ئەوە ئامۆژگاری یەکێکی پێ دەکرێت لە ئێوە کە باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت ئەوە پاکتر و باشترە بۆتان.»

وەختێکیش باس لە ئادابی مۆڵەت وەرگرتن دەکات دەفەرموویت: ﴿وَإِن قيلَ لَكُمُ ارجِعوا فَارجِعوا هُوَ أَزكىٰ لَكُم﴾ [النور: ٢٨] «ئەگەریش پێتان گوترا

بگەڕێنەوە، ئەوسا بگەڕێنەوە ئەوە بۆتان پاکتر و باشترە.»

کاتێکیش باس لە بنەماکانی پاکیزەیی دەکات لە وێنەی چاوپارێزی و زاڵبوون بەسەر غەریزەدا، باس لە شوێنەوارەکەشی دەکات لە پاککردنەوە و بژاری نەفسدا، دەفەرموویێت: ﴿قُل لِلمُؤمِنينَ يَغُضّوا مِن أَبصارِهِم وَيَحفَظوا فُروجَهُم ذٰلِكَ أَزكىٰ لَهُم﴾ [النور: ٣٠] «بە پیاوانی باوەڕدار بڵێ چاویان بگرنەوە و داوێنیان بپارێزن ئەوە بۆیان پاکترە.»

لەبارەی شێواز و ئادابی باڵاپۆشیشەوە دەفەرموویێت: ﴿ذٰلِكُم أَطهَرُ لِقُلوبِكُم﴾[الأحزاب: ٥٣] «ئەوە بۆ دڵی ئێوە و دڵی وانیش پاکترە.»

وەختێکیش لە تەشریعاتی داوەری و گەواهییەکانەوە دەدوێت، دەفەرموویێت: ﴿وَلا تَكتُمُوا الشَّهادَةَ وَمَن يَكتُمها فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلبُهُ﴾ [البقرة: ٢٨٣] «گەواهی مەشارنەوە هەرکەسیش بیشارێتەوە ئەوا دڵی تاوانبارە.»

هەرکەسیش لەم دەقانە ڕابمێنێت کە نموونەشیان گەلێک زۆرە[١]، یەکلا و بڕاوە و دەستبەجێ دەزانێت کە لە مەزنترین مەبەستەکانی تەشریع بژاری دەروون و ئاوەدانکردنەوەی دڵانە بە (اللّٰه)، ئیدی چاککردن و ڕێکخستنی خوڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان و بەرپاکردنی بەرژەوەندییە گشتییەکان ئەوە لە کۆی ئەو مەبەست و ئامانجانەیە کە (اللّٰه) خۆشی دەوێن، بەڵام دروست نییە کە کورتبکرێتەوە و بخزێنرێتە تەنها ئەو سووچەوە، چجای ئەوەی پێش بخرێت بەسەر بنچینەی باوەڕ و فەرزەکاندا.

زێدەڕەوانی مەدەنییەتیش نزیکە بڵێم پیتێکیش لە زاریان نایەتە دەرێ لەسەر ئەم مەبەستە مەزنە کارا و زیندووە، بگرە کەسێکیش کە باسی

---

(١) بۆ زیاتر چوون لە نمایشکردنی ئایەتە قورئانییانەکان سەبارەت بە مەبەستی ئاوەدانکردنەوەی دەروونەکان بە پەروەردگار؛ دەتوانن بەشێک بە ناونیشانی "الحبل الناظم في كتاب الله" لە پەرتووکی " الطريق إلى القرآن"دا چاولێ بکەن، مركز الفكر المعاصر، (ص٧٩)

لێوە بکات بە حەکایەتخوان و وتاربێژێکی سادە و ساویلکەی دادەنێن کە هیچ شتێک لە پرسە هزری و فەلسەفی و مەدەنییەکان تێناگات، سا چەند بەئازارە کە گەورەترین داخوازییە خوداییەکان بە لای ڕۆشنبیری موسڵمانەوە بەهایەکی لاوەکی بێت، بەڵکوو پەروەردگار باسی لەوە فەرمووە کە پەیامبەرانی بۆ گەلان ناردووە و لەپاشان جۆرەهای قەیران و کارەساتی بەسەردا هێناون تەنها بە ئامانجی ئەوەی کە ئەو گەلانە هانا و هاوارێک بۆ لای (اللّٰه) بەرن و لێی بپاڕێنەوە، ئەو پێگەیە و ئەو شکانەوەیە کە پەروەردگار پێیخۆشە لە بەندەکانیەوە، هەروەک لە سوورەتی ئەنعامدا دەفەرموویت: ﴿وَلَقَد أَرسَلنا إِلى أُمَمٍ مِن قَبلِكَ فَأَخَذناهُم بِالبَأساءِ وَالضَّرّاءِ لَعَلَّهُم يَتَضَرَّعونَ﴾ [الأنعام: ٤٢] «بەڕاستی کە (پەیامبەرانمان) بۆ گەلانێکی بەر لە تۆ ناردووە و بە تەنگەبەری (لەڕۆزی و بژێویدا) و بە ئازار (لە گیان و لەشدا) گرتوومانن کە هۆکار بێت هانا و هاوار و پاڕانەوەیەکیان لێوە دەرکەوێت.»

لە ئایەتی دواتریشدا جەختی لەم مەبەستە خودایيە کردووەتەوە کە دەفەرموویت: ﴿فَلَولا إِذ جاءَهُم بَأسُنا تَضَرَّعوا وَلٰكِن قَسَت قُلوبُهُم﴾[الأنعام: ٤٣] «دە با وەختێک سزای ئێمە گەیشتە سەریان بپاڕانایەتەوە و کزییان بنواندایە بەڵام دڵەکانیان ڕەق ببوو.»

بەڵکوو پەروەردگار پێغەمبەرانی تەنها لەپێناو ئەم ئامانجەدا ناردووە کە مرۆڤ لە پێگەی سەرکزی و لالانەوەدا بوەستێت لە بەردەستی (الله)دا کە لە سوورەتی ئەعرافدا دەفەرموویت: ﴿وَما أَرسَلنا فى قَريَةٍ مِن نَبِيٍّ إِلّا أَخَذنا أَهلَها بِالبَأساءِ وَالضَّرّاءِ لَعَلَّهُم يَضَّرَّعونَ﴾ [الأعراف: ٩٤] «بۆ هیچ شارودێهاتێک پێغەمبەرێکمان نەناردووە کە خەڵکەکەیمان بە نەهامەتی و ئازاری (هەم ماڵی و هەم گیانی) نەگرتبێت، تاکوو هۆکارێک بێت بشکێن و بلالێنەوە.»

هەروەها پەروەردگار سزاکان دەنێرێتە سەر گەلان تاکوو مەبەستی لێپاڕانەوە

و شکانەوەیان بەبیربێنێتەوە، هەروەک لە سوورەتی موئمینوندا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَد أَخَذناهُم بِالعَذابِ فَمَا استَكانوا لِرَبِّهِم وَما يَتَضَرَّعونَ﴾[المؤمنون: ٧٦] «هەروەها بەڕاستی بە سزا گرتمانن، کەچی بۆ پەروەردگاریان نە ملکەچی و زەبوونی و نە لاڵان و پاڕانەوەیەکیان نەنواند.»

هەربۆیە؛ یەکەم هەستێک کە مرۆڤ دەبات لە وەختی باوەڕهاوردنیدا بەم وەحییە بریتییە لە سەرکزکردن و ملکەچی نواندن، هەروەک لە سوورەتی حەجدا دەفەرموویت: ﴿وَلِيَعلَمَ الَّذينَ أوتُوا العِلمَ أَنَّهُ الحَقُّ مِن رَبِّكَ فَيُؤمِنوا بِهِ فَتُخبِتَ لَهُ قُلوبُهُم﴾ [الحج: ٥٤] «بۆئەوەی ئەوانەی زانستیان پێ دراوە بزانن کە ئەوە حەقە و لەلای پەروەردگاریانەوەیە، جا باوەڕی پێ بێنن، جا دڵەکانیان بۆی نەرم و نەوی بێتەوە.»

بۆشی وەدەرخستووین کە گەلان بەبێ ئەم هانا و هاوار و پاڕانەوەیە لەلای خودا هیچ بەهایەکیان نییە، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿قُل ما يَعبَأُ بِكُم رَبّي لَولا دُعاؤُكُم﴾ [الفرقان: ٧٧] «بڵێ گەر پەرستش و پاڕانەوەتان نەبێت پەروەردگارم هیچ باک و بایەخێکتان پێ نادات.»

ئەم واتا گەورانەن کە خودا لە بەندەکانی دەوێت کە ئەسڵەن هەر ئەوانەشن ئامانج لە بەدیهێنانی مرۆڤ کە پوختە و پاڵفتەی پڕۆژەی پەیامەکانن لە هەر لە سەرەتای دەستپێبوونی بوونەوەرانەوە، دروست نییە بزر بکرێن و شەریعەتەکان لە ئامانجگەلێکی ماددیی پەتیدا بنوێنرێن و تێیبخزێنرێن.

کاتێکیش مرۆڤ مەبەستی خودای لە زەبوونی و شکانەوە و لاڵانەوەدا و خۆشویستنی بۆ ئەم حاڵەتە ئیمانییە وەیاددێتەوە، هەروەها چۆن پێغەمبەرانی ناردووە و خۆشی و ناخۆشی بەشوێنیدا تووشی میللەتان کردووە تەنها لەپێناو ویستنی ئەم پەرستشە؛ بێگومان هەمیشە چیرۆکی لاڵانەوەکەی پێغەمبەریشی (ﷺ) دێتە وەیاد هەتا ئەوەی کە ئەبوو بەکر بەزەیی پێدا هاتەوە هێندی خۆی

ماندوو کرد و بڕسکاند لە ئەڵهابردنیدا.

فەرموودەیەکی سەیر، موحەممەد (ﷺ) تێیدا بانگ لە پەروەردگاری دەکات و ئەبوو بەکر بەزەیی پێیدا دێیتەوە، بەڕێکەوت ئەوەشی کە ئەم دیمەنەی دی و گێڕایەوە عومەری کوڕی خەتاب بوو، سێ پیاوەکەی ناو مێژووی ئیسلام!

لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە فەرموودەی عومەری کوڕی خەتاب کە فەرموویەتی:

"کە ڕۆژی بەدر بوو پێغەمبەر (ﷺ) سەیری موشریکانی کرد کە هەزار کەس بوون، هاوەڵانی ئەویش سێسەد و نۆزدە پیاو بوون، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی لە قیبلە کرد و لەپاشان دەستەکانی درێژ کرد، ئەوجا دەنگی بەرزکردەوە بە هاوار لە پەروردگاری پەروەردگارم ئەوەم بۆ بەجێ بێنە کە بەڵێنیت پێی دام، پەروەردگارم پێم ببەخشە ئەوەی کە بەڵێنیت پێ دام، پەروەردگارم خۆ ئەگەر ئەمڕۆ ئەم گرۆیە لە ئەهلی ئیسلام بفەوتێنیت و بدەیت بە دەستەوە ئیدی لە سەرزەویدا ناپەرسترێیت، ئیدی هەر لەو حاڵەیدا بوو دەلالایەوە، هەر بە دەستی پان، ڕوو بە قیبلەوە، هەتا عەباکەی لە شانی کەوتە خوارەوە، ئەوجا ئەبوو بەکر هاتە نزیکی و عەباکەی هەڵگرتەوە و دایەوە بەسەر شانیدا و لە پشتەوە گرتی، پێی وت ئەی پێغەمبەری (ﷺ) خوا بەستە هێندە سکاڵا و پاڕانەوەت لە پەروەردگارت، سا دڵنیابە ئەو بەڵێنیت بۆ وەجێ دێنێت، لەپاشان پەروەردگار ئەوەی دابەزاند: ﴿إِذ تَستَغيثونَ رَبَّكُم فَاستَجابَ لَكُم أَنّي مُمِدُّكُم بِأَلفٍ مِنَ المَلائِكَةِ مُردِفينَ﴾ [الأنفال: ٩] «وەختێک ئێوە هانا و پەنا بۆ پەروەردگارتان دەبەن و ئەویش وەڵامی دانەوە کە من یاریدەتانم بە هەزارییەک لە دوایەک لە فریشتەکان."[١]

هەربۆیە کاتێک بژاری دەروونەکان ئەو تەوەرە بوو کە کردەوەکان لەدەوری

---

(١) "صحيح مسلم": (١٧٦٣).

دەسوورِانەوە، پەروەردگاریش جیاوازیکردن و پێشخستنی هەندێک لە خەڵکی بەسەر هەندێکی دیکەدا بەپێی ئەو واتایانەی باوەڕ کە لە دڵەکاندا هەیە داناوە و بنچینەی لێگرتن و لەسەرئەژمارکردنی بە کاری دڵەوە بەستاوە کە دەفەرموویت: ﴿وَلَـكِن يُؤاخِذُكُم بِما كَسَبَت قُلوبُكُم﴾[البقرة: ٢٢٥] «بەڵام ئەوەتان لێدەگرێت کە لە دڵەکانتان وەشاوەتەوە و ڕوویداوە.»

بەڕەنگدانەوەی ئەوەش گۆڕانکاری و چاکسازی دەستپێکی بە چاکسازیکردن لە دڵدا و ئاوەدانکردنەوەی بە باوەڕ داناوە، هەروەک دەفەرموویت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ ما بِقَومٍ حَتّى يُغَيِّروا ما بِأَنفُسِهِم﴾[الرعد: ١١] «پەروەردگار هیچ لە خەڵکێک ناگۆڕێت هەتا خۆیان ئەوەی لەناو خودی خۆیاندایە نەیگۆڕن.»

جا کە ئەم دونیایە دوایی هات و ژیانی داهاتوویی هەتاهەتایی دەستی پێکرد، ئەوسا پەروەردگار ئەم دڵ و دەروونانە و ئەوەی لە سینەکاندایە دەخاتە سەر تەرازوو دەکێشێت، وەک دەفەرموویت: ﴿أَفَلا يَعلَمُ إِذا بُعثِرَ ما فِي القُبورِ(٩) وَحُصِّلَ ما فِي الصُّدورِ﴾[العاديات: ٩ - ١٠] «ئەرێ نازانێت کە وەختێک ئەوەی لە گۆڕەکاندایە ورووژاو و زیندووکرایەوە. هەروەها ئەوەی لە سینەکاندایە چنرایەوە.»

لە مەزنترین ئامانجەکانی تەشریعیش کە لە وابەستەبووانی مەدەنییەتی ماددی بزر بووە مەبەستی تاقیکردنەوەیە بە ڕادەستبوون و جێبەجێکردن کە باوەڕدار ڕاستەوخۆ دەردەپەڕێت بۆ بەجێهێنان، بەڵام ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە دەبینیت پشت لە فەرمان دەکەن، یان بەدووی پەڵپ و بەهانەوەن. هەربۆیە؛ کاتێک پەروەردگار باسی لە جیاوازی شەریعەتی ئوممەتان فەرموو، ڕوونی کردەوە کە مەبەست لەوە تاقیکردنەوەی ملکەچییە، هەروەک دەفەرموویت: ﴿لِكُلٍّ جَعَلنا مِنكُم شِرعَةً وَمِنهاجًا وَلَو شاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُم أُمَّةً واحِدَةً وَلـكِن لِيَبلُوَكُم في ما آتاكُم﴾ [المائدە: ٤٨] «بۆ هەر (ئوممەتێک) لە ئێوە

شەریعەت و ڕێبازێکمان گێڕاوە، خۆ گەر پەروەردگار بیویستایە سەرجەمتانی بە تەنها ئوممەتێک دەگێڕا بەڵام بۆئەوەی بەوەی کە پێیداون (لە فەرمان و نەهی و شەریعەت) تاقیتان بکاتەوە.»

وەختێکیش ڕاو و نێچیرگرتنی لە ئەهلی ئیحرام حەرام کرد، هاوەڵانی موحەممەدی (ﷺ) بە ڕاوی نزیک و ئاسان لە وەختی قەدەغەبوونیدا تاقی کردەوە؛ تاکوو ڕادەستبوون و فەرمانبەرداریانی بۆ تاقی بێتەوە (وەدەربخات)، هەروەک دەفەرموویێت: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا لَيَبلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيءٍ مِنَ الصَّيدِ تَنالُهُ أَيديكُم وَرِماحُكُم لِيَعلَمَ اللَّهُ مَن يَخافُهُ بِالغَيبِ﴾[المائدە: ٩٤] «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بەڕاستی (دڵنیابن) کە پەروەردگار بە هەندێک لە ڕاو و نێچیر تاقیتان دەکاتەوە کە لە دەست و ڕمتانەوە نزیکە، تاکوو (اللّٰه) بزانێت کێ لە پاشەملەی خەڵک و لە پەنهاندا لێی دەترسێت.»

هەر نموونەی ئەوە کاتێک بەنی ئیسرائیلیشی بە ڕاوی ئاسان لە ڕۆژی حەرامییێتیدا تاقی کردەوە، فەرمووی: ﴿إِذ تَأتيهِم حيتانُهُم يَومَ سَبتِهِم شُرَّعًا وَيَومَ لا يَسبِتونَ لا تَأتيهِم﴾[الأعراف: ١٦٣] «وەختێک ماسی لە ڕۆژی شەممەیاندا بۆیان دەهات و نزیک دەبوویەوە، ڕۆژێکیش شەممە نەبووایە، نەدەهات و وەچنگ نەدەکەوت.»

هەروەها مەبەستی تاقیکردنەوەی ملکەچبوون و جێبەجێکردنی بە دەربڕینێکی گشتگیر هێناوە، کە دەفەرموویێت: ﴿ثُمَّ جَعَلناكُم خَلائِفَ فِي الأَرضِ مِن بَعدِهِم لِنَنظُرَ كَيفَ تَعمَلونَ﴾ [یونس: ١٤] «لەپاشان لە سەرزەویدا ئێوەمان کردە جێنشین لەپاش ئەوان تاکوو ببینین چۆن کارێک دەکەن.»

ئەم بیرۆکەیەش کە زێدەڕەوانی مەدەنییەت دووبارەی دەکەنەوە سەبارەت بە مەبەستی دروشم و شەریعەتەکان پەیوەندی بەو بنەما فەلسەفییەوە هەیە کە لە بڕگەیەکی پێشووتردا ئاماژەمان پێکرد کە وابەستەی کرۆکی کەماڵ دەروونی

مرۆڤییە، جا هەر ئاڕاستەیەکی هزری یاخود فەلسەفی مەبەستی شەریعەت بەپێی دیدگای خۆی سەبارەت بە کامڵبوونی دەروونی مرۆیی دەبەستێتەوە، نەک بەپێی واتاکانی قورئان کە سەبارەت بە مەبەستەکانی شەریعەت دەدوێن.

پێشەوا ئیبن تەیمییە گفتوگۆیەکی ناوازە و قەشەنگی لەسەر ئەم پرسە پێشکەشکردووە کە لەلای هەردوو دیمەندا وەستاوە دیمەنی فەلسەفی و هەروەها دیمەنی ئوسوولییە دواییەکان، ئەوەشی ڕوونکردووەتەوە کە لە هەریەکێکیاندا کەمتەرخەمی هەیە لە لێکدانەوەی مەبەستی تەشریعدا، سەرەڕای درێژی دەقەکەش بەڵام لەبەر گرینگییێتی زۆری پێویستمان پێیەتی کە ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت:

"زۆرێک لە خەڵکی ڕووانینیان کورتە لەئاست ناسین و زانینی ئەوەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی پێیان خۆشە لە بەرژەوەندییەکانی دڵ و دەروون و زیانەکانیان و ئەوەی سوودیان پێ دەگەیەنێت لە حەقیقەتەکانی باوەڕ، هەروەها ئەوەی زیانیان پێ دەگەیەنێت لە بێئاگایی و ئارەزوو، جا زۆرێک لەوانە دەبینیت کە لە زۆرێک لە ئەحکامدا تەنها ئەو بەرژەوەندی و زیانانە دەبینن کە بۆ ماڵ و سامان و لەش و گیان دەگەڕێتەوە، ئەوپەڕی بەئەنجامگەیشتنی یەکێکیان گەر ئەوەش تێپەڕێنێت ئەوەیە کە لە بەڕێوەبردنی نەفس و ئەدەبدادان و ڕێکخستنی ڕەوشتەکانیش بڕوانێت بەوەی پێیگەیشتوون لە زانست، هەروەکوو فەلسەفە لێدەران و وێنەی ئەوان ئەوە و وێنەی ئەوە باسلێدەکەن؛ کە لە بەڕێوەبردنی نەفس و چاککردنی ڕەوشتدا بە ئەوەی کە لە زانستی فەلسەفە دەیزانن و بەوەشی لەگەڵ ئەودا کۆیانکردووەتەوە لەوەی وادەزانن کە لە شەریعەتە دەدوێن، ئەوانیش لە ئەوپەڕی ئەوەدا کە پێیگەیشتوون هێشتا زۆر لە دوای جوولەکە و گاوریشەوەن، خەڵکانێکیش لەوانەی سەرقاڵی ئوسوولی فیقهـ و هۆسازین بۆ حوکمە شەرعییەکان بە سیفەتگەلی گونجاو، کاتێک باس لە هۆکار و گونجاوییێتی دەکەن و ئەوەی کە دانانی شەریعەت بۆ حوکمەکان لەسەر بنەمای

سیفەتی گونجاوی خۆیان لە هێنانی بەرژەوەندیی بەندەکان و لادانی زەرەریانی لەخۆگرتووە. هەروەها وایان دیوە کە بەرژەوەندی دوو جۆرە دوارۆژی و دونیایی؛ جۆرە دوارۆژییەکەیان بەوە داناوە کە لە حوکمەکەدا هەیە لە بەڕێوەبردنی نەفس و چاککردنی ڕەوشت و ڕەفتار، دونیاییەکەشیان بە پاراستنی خوێن و ماڵ و داوێن و عەقڵ و ئایینی ڕوواڵەتی لێکداوەتەوە، پشتیشیان لەوە کردووە کە لە پەرستشە ناوەکی و دەرەکییەکاندا هەیە لە جۆرەها ناسین و زانست بە خودا و فریشتەکانی و پەرتووک و پێغەمبەرانی، حاڵەکانی دڵ و کردەوەکانی لە وێنەی خۆشویستنی پەروەردگار و، ترسان لێی، یەکلاکردنەوەی ئایین بۆی، پشتپێبەستنی، ئومێدبوون بە میهری، لێپاڕانەوەی و جگە لەوەش لە جۆرەها بەرژەوەندی لە دونیا و دوارۆژدا، هەروەها لەوەدا کە شەریعەت تەشریعی کردووە لە وەفاداربوون بە پەیمانەکان و بردنەسەریان، بەجێگەیاندنی سیلەی ڕەحم، مافەکانی کۆیلە و کەنیزەک و دراوسێ، مافی موسڵمانان بەسەریەکەوە، جگە لەوەش لە هەرچی جۆری فەرمان و نەهیەکان هەن، بۆ پاراستنی حاڵە سوننەتییەکان و چاککردنی ڕەوشت و ڕەفتارەکان، وادیارە کە ئەمەش بەشێکە لەو بەشانەی کە شەریعەت هێناوییێتی لە بەرژەوەندییەکان."[١]

جا لەم دەقە بەنرخە توێکارییەدا، ئیبن تەیمییە زۆر بە لێهاتووییەکی ناوازەوە گرفت لە «لێکدانەوەی ماددی بۆ شەریعەت»دا لە دوو بازنەی مەعریفیدا دەستنیشان دەکات، لەلای فەیلەسووفانی ئیسلام و لەلای ئوسووڵییە دواییەکان، ئەوەشی کە وەهمی ئەوەیان کردووە کە ئەوپەڕی ئامانجەکانی شەریعەت دەگەڕێتەوە بۆ بەرژەوەندی ماڵ و لەش و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان، ژێری ئەوەیان لێ بزربووە کە لەوە بگەن شەریعەت لەخۆیگرتووە لە بەندایەتییە مەزنەکانی دڵ لە وێنەی پشتبەستن و خۆشویستن و نییەتپاککردنەوە و جگە لەوانەش لە بەرژەوەندی و زیانەکان.

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٤/٤٦٨ - ٤٧٠).

ئەم دەقە بەهادارەی ئیبن تەیمییە -بەبێ زێدەڕەوی بڵێم- بە بابەتێکی لقی دانانرێت، بەڵکوو بە کرۆکی پرۆژەیەکی زانستی دادەنرێت لە پێداچوونەوەی کەلەپووری مەبەستەوانی -مقاصدي-دا و دووبارە خوێندنەوە و بێژانی لەژێر ڕۆشنایی دەقەکانی شەریعەتدا و دەربازکردنی لە مەیلی ماددی دواکەوتوو لە لێکدانەوەی مەبەستەکانی شەریعەتدا.

بەهەرحاڵ، لەگەڵ دڵنیاییشمان بەوەی کە دروشمەکان لە وێنەی نوێژ و ڕۆژوو و جێپەرستشەکانی حەج و عەمرە و یادی پەروەردگار و قوربانی و نموونەی ئەوانە ڕێگایەکن بۆ بژاری دەروون و چاککردنی ڕەوشتەکانی و پاککردنەوەی لە خڵتەکانی ماددە کە بە دڵەکانەوە دەنووسێن، بەڵام پێویستە وریای ئەوەش بین کە زێدەڕەوی لە جەختکردنەوە لە مەبەستە ڕەوشتییەکانی لە بەهای دێنێتە خوارەوە؛ کە دەیگۆڕێت بۆ تەنها ڕێگا و ئامرازی پەتی کە دەکرێت بە جگە لە خۆشی لێی بێنیاز بین، مادەم مەبەست و ئامانجی کۆتایی لێی بژاری دەروون و پاککردنەوەیەتی، هەروەک هەندێک لە خوداپەرستانی فەیلەسووفان بڕوایان وایە کە مرۆڤ گەر بە خاوێنی ڕۆحی بگات سا بە هەر ڕێگایەک بێت، ئەوا مەبەستی خودایی بەجێهێناوە، بێ ئەوەی خۆشی بە گرتنەبەری ئەم دروشمانە و پابەندبوون پێیانەوە ماندوو بکات، ئەم بیرۆکە ساویلکانەیە قۆڵی هەندێک لە سۆفیگەرانیشی بڕیوە و هەندێک لە وابەستەبووانی مەدەنییەتی ماددیش تێوەی گلاون.

پێشەوا ئەبوو ئیسماعیلی هەرەوی(٤٨١ک) تێبینییەکی ناوازەی کردووە سەبارەت بە ڕۆڵی گرفت لە «هۆسازی بۆ حوکمەکان»دا لە لاوازکردنی «بەهای حوکمی شەرعی» لە نێو دەروونەکاندا، بەجۆرێک کە چوونەوەیەکی پاڵنەرەکانی لێ دێتە کایەوە، وەک لە مەتنە بەناوبانگەکەیدا (منازل السائرين) دەفەرمووێت: "بەمەزن ڕاگرتنی فەرمان و نەهییەکان: ئەوەیە کە نە بە مۆڵەت خواستن و ئاسانکاری بێکەڵک ڕووبەڕوویان بێتەوە، نە بە زێدەڕەوی توند و بێواتا، نە بە

هۆکارێکشیان ببەستێتەوە کە ملکەچی و پەیڕەویلێکردن لاوازبکات." [١]

وانازانم دەرچوون بێت لە بابەتەکە گەر ڕاشکاوانە بە خوێنەر بڵێم کە من وەختێک ئەم دەربڕینەی «هەڕەوی»م خوێندەوە لە بەمەزن ڕاگرتنی فەرمان و نەهیدا "نە بە هۆکارێکیان ببەستێتەوە کە ملکەچی و پەیڕەویلێکردن لاواز بکات" ماوەیەک زۆر سەرسامانە هەر لە دڵی خۆمدا دەموتەوە و دەمهێنا و دەمبرد، چۆن «هەڕەوی» توانیویێتی ئەم پەیوەندییە وردە لە نێوان «هۆسازی بۆ تەشریع» و «شوێنەواری ڕەفتاریی»دا پێ بزانێت و بدۆزێتەوە، لەپاشان بەم خەستی و شیرینییەش دەری ببڕێت؟! نموونەی ئەم دەربڕینە زۆر کورتبڕ و واتا قووڵانە توێژەری بابەتی -کرداریانە- بەرەو تێگەیشتن لە قووڵی زانستی پێشینان دەبات، هەروەها ئەوەی کە واتا چڕو پڕ و لێکگیربووەکان و پەیوەندییە زانستییەکان بە وشەگەلێکی کورت و پوخت دەردەبڕن، چەند زۆرە ئەوەی هەندێک لە هاوچەرخان وایانزانیوە کە زۆری قسەی خەڵکانی دوایی لە فراوانی و زۆری زانستیانەوەیە، وادیارە پێچەوانەکەی ڕاستە کە قسەی پێشینان کورتبڕ و قووڵ واتا و قسەی دواییان درێژدادڕ و کەمواتایە.

مەبەستیش ئەوەیە کە بەستنەوەی دروشمەکان بە هۆگەلێکی ڕەفتاری پەتییەوە، یاخود بەستنەوەی تەشریعەکان بە داناییگەلێکی کۆمەڵایەتی پەتییەوە؛ لە گەورەترین هۆکارەکانی لاوازکردنی پاڵنەرەکانیەتی، هۆی ئەوەش ئەوەیە کە مرۆڤ هەمیشە چاوەچاوی ئامانج و کۆتاییەکانیەتی و گوێ بە ئامرازەکان نادات، ئەوەش ڕواڵەتە بینراوەکان و ئەزموونە زیندووەکان جەختیان لێ کردووەتەوە، جا هێندەی نابات کە ڕۆشنبیر خۆی نوقمکرد لە هۆکاری دروشمەکان و دانایی پشت تەشریعەکانەوە؛ ئیدی پاش لەوە دەبیینیت کە گوێی پێنادات و گاڵتەشی بەوانە دێت کە سەرقاڵی بەدواداچوونی وردەکارییەکانی وەحی دەبن، ئەوە وەک

---

(١) الهروي، "منازل السائرين"، دار الكتب العلمية، (١٤٠٨ك)، (ص٨١).

جۆرێک ساویلکەیەتی دەبینێت لە تێگەیشتنی قووڵاییەکانی شەریعەتدا.

ئەم چرکاندنە هەڕەوییەی پێشووش، کە "لە بەمەزنڕاگرتنی فەرمان و نەهییەکان ئەوەیە کە بە هۆکارێک لێکنەدرێنەوە کە ملکەچی و پەیڕەویلێکردن لاواز بکات" پێشەوا ئیبن قەییم شیی کردووەتەوە و هەندێک بەڵگەنموونەشی بۆ هێناوەتەوە کە ئیبن قەییم دەفەرمووێت:

"کە دەفەرمووێت «هەڕەوی»: 'بە هۆکارێک لێکنەدرێنەوە کە ملکەچی و پەیڕەویلێکردن لاوازبکات'، مەبەستی ئەوەیە کە فەرمان و نەهی بە هۆ و ئامانجێک لێکنەداتەوە کە لەوسەرەوە هەڵگەڕێتەوە و خودی فەرمان و نەهییەکە بەتاڵکاتەوە، هەروەک هەندێک حەرامکردنی مەی دەبەنەوە سەر هۆکاری نانەوەی دوژمنایەتی و ڕق و کینە و تووشبوون بە خراپە، جا ئەگەر ترسی ئەمەی نەما دروستە بیخواتەوە، وەک وتراوە:

أدرها فما التحريم فيها لذاتهاولكن لأسباب تضمنها السكرُ

إذا لم يكن سكر يُضل عن الهديفسيَّان ماء في الزجاجة أم خمرُ

ئەو جامە مەیە بسووڕێنە کە حەرامکردنەکەی لەبەر خۆی نییە

بەڵکوو لەبەر هۆکارگەلێک کە مەستی دەیانهێنێت

مەستییەک کە لە هیدایەت و چاکە نەترازێنێت

ئیدی یەکسانە پەرداخەکە ئاوی تێدا بێت یان مەی

ئەمەش خەڵکانێکی گەیاندووەتە خۆدارنینی یەکجاری لە ئایین، لەو

هۆکارانەشی کە ملکەچی و پەیڕەویلێکردن لاوازدەکەن ئەوەیە کە حوکمەکە ببرێتەوە سەر هۆکارێکی لاواز کە لەڕاستیدا ئەوە هۆکاری حوکمەکە نەبێت، هەربۆیە دابی ئەو پیاوانە -ئەهلی سولوک- وابووە کە دەم لە باسی هۆکاری پشت ڕاسپاردنەکان-تکالیف- نەدەن، لە ترسی هەمان نەگبەتی، هەروەها: ئەگەر بەنموونە لە حیکمەتی پەرستش و ڕاسپاردنەکان بڕوانێت و وای دابنێیت کە هۆکاری پشتەوەی گورجبوونەوە و کۆبوونەوەی دڵ و ڕوونانیەتی لەپەروەردگار، جا بڵێت من بە مەبەستەوە خەریک دەبم لەبری ئامڕاز و ڕێگا، ئەوجا بە دڵکۆبوونەوە و خەڵوەت سەرقاڵ بێت لەبری جێگە و وادەی پەرستشەکان، ئیدی لەکاریان بخات و پەیڕەویلێکردن دەست لێ بەربدات بەهۆی بردنەوەی فەرمانەکان بۆ سەر ئەو هۆکارەی کە ملکەچی و پابەندی ئەمی بەتاڵکردەوە و پچڕاند، هەموو ئەوەش بەش و لقی ئەم وازهێنانەن لە بەمەزن ڕاگرتنی فەرمان و نەهی، لەم گەندەڵییەش هێندە تووشی ئەو گرۆ و کۆمەڵانە بووەتەوە مەگەر خوا بزانێت، ئیدی نازانن هۆکارە بەتاڵ و بەدفەڕەکان چەندێک ملکەچبوون بۆ خودایان لاوازکردووە، چەند فەرمانی ئەویان لەکارخستووە و چەند نەهی و ڕێلێگیرییان پێشێل و حەڵاڵ کردووە و چەند حەڵاڵیشیان حەرامکردووە، هەر ئەوەشە کە پێشین یەکدەنگن لەسەر زەم و سەرکۆنەکردنی." [١]

هەربۆیە؛ هەروەختی کتێبێک دەبینم کە دروشمەکانی وەک حەج و ڕۆژوو بەنموونە دەخاتەڕوو و ڕەهەندەکانی تەشریعکردنی دەبەستێتەوە بە بنیادنانی شارستانییەت و مەدەنییەتی ماددی و ئەوانەوە و لەوێشدا دەوەستێت، ئیدی باس لەو جۆرانەی بەندایەتیش ناکات کە لەم دروشمانەدا هەن، ئەم دەربڕینەی هەڕەویم بیردەکەوێتەوە لە بەستنەوەی هۆسازی بە لاوازکردنی پەیڕەوی و پابەندییەوە و ئەوەی کە «فەرمان و نەهی شەرعی نەبرێنەوە سەر هۆکارێک کە پەیڕەوی لێکردن لاواز بکات.»

---

(١) ابن القيم، "مدارج السالكين"، تحقيق: مصطفى شيخ، مؤسسة الرسالة، (ص٧٣٢).

لەوەشی ئەوە ڕوون دەکاتەوە: ئەوەی کە پادشا وەختێک فەرمانێک بۆ یەک لە دامەزراوەکانی دەوڵەتەکەی دەردەکات بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو لەڕێی دەستوورێکی دیاریکراوەوە، بەوەڕازی نییە کە بگەن بە هەمان ئامانج بەڵام لەگەڵ سەرپێچیکردنی ئەو دەستوورەی ئەودا کە لەسەری سەپاندوون، بە هەمان شێوەش پادشای پادشایان زێدەتر، نموونەی هەرەبەرزیش بۆ (الله)یە، بەوە ڕازی نییە کە ئەوەی بۆی تەشریع کردووین لە دروشمەکان و ئامرازەکانی بژاری نەفس و پاککردنەوەی واز لێ بێنین، بەڵکوو پابەندبوون بەم ئامرازە خوداییانەوە بەشێکە لە خودی پرۆسەی پاکبوونەوەکە خۆی؛ چونکە ئەو کەسەی کە پەروەردگار بەپێی ئەو ئامانجەی کە خۆی مەبەستیەتی و ئەو ئامرازەشی تەشریعی کردووە هەمووی پێکەوە بپەرستێت، باشتر و خۆشەویستترە لەلای (اللّٰه) لەو کەسەی کە بەپێی ئامانجەکە بیپەرستێت و لووتی لەئاست ئامرازەکان بەرزێت بە ئاسماندا.

لەوەشی کە سەر بە هەمان داو و تەڵەی هۆسازی ماددییە بۆ شەریعەت بەڵگەهێنانەوەی هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتە بەو فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿لَقَد أَرسَلنا رُسُلَنا بِالبَيِّناتِ وَأَنزَلنا مَعَهُمُ الكِتابَ وَالميزانَ لِيَقومَ النّاسُ بِالقِسطِ وَأَنزَلنَا الحَديدَ فيهِ بَأسٌ شَديدٌ وَمَنافِعُ لِلنّاسِ وَلِيَعلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالغَيبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزيزٌ﴾ [الحديد: ٢٥] «بەڕاستی ئێمە پەیامبەرانمان بە بەڵگەی ڕوون و ڕۆشن ناردووە و پەرتووک و تەرازوومان لەگەڵیان دابەزاندووە تاکوو خەڵک بە دادپەروەری هەستن.» بە لێکدانەوەی ئەوە بە دادپەروەری سیاسی و دەستاودەستکردنی دەسەڵات و نموونەی ئەوانە، هەروا ئەوەی کە فرمانی پێغەمبەران لە بنەڕەتەوە بۆ بەرهەڵستیکردن لە زۆرداری سیاسی هاتووە.

ڕاستییەکەش ئەوەیە کە دادپەروەری سیاسی تەنها بەشێکە لە ئایەتەکە، بەشێکی مەزن و بەرزیش بێگومان، بەڵام ئەسڵەن واتای یەکەمی ئایەتەکە

نییە، چجای ئەوەی تاکە واتای ناو ئایەتەکە بێت.

ئەمە هاوشێوەی ئەوەیە کە «تەرازوو» لە قورئاندا بە لۆژیکی کرداری لێکدەداتەوە، هەموو ئەوانەش یاخود بریتین لە لێکدانەوەی دەق بە بەشێکی واتاکەی کە ئەو بەشە بەرزترین و مەزنترینی ناو کۆی واتاکانی نییە، یاخود خزاندنی واتایەک بۆ ناو ئایەتەکە کە ئەسڵەن ئەو واتایەی تێدا نییە.

جا (القسط) لە قورئاندا واتە دادپەروەری، دژەکەشی (الظلم) ستەمە، ئەوەش تایبەت نییە بە تەنها دادپەروەریی سیاسی یاخود بەرهەڵستیکردنەوە لە زۆرداری، بەڵکوو دادپەروەری گشتی و تایبەتییش دەگرێتەوە، چونکە سەرجەم فەرمانپێکراوەکانی شەریعەت جۆرێکن لە دادپەروەری، سەرجەم ڕێلێگیراوەکانیشی جۆرێکن لە ستەم، چونکە ئەسڵەن شەریعەت هەمووی چەند نموونەیەکن هێنراونەتەوە بۆ هەستان بە دادپەروەری، بەشی سەرەکی دادپەروەریش لە شەریعەتدا یەکلاکردنەوەی دڵ و پاککردنەوەیەتی لە هەرچی جگە لە خودایە و ئاوڕنەدانەوەیەتی بە لایاندا، هەروەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿قُل أَمَرَ رَبِّي بِالقِسطِ وَأَقيموا وُجوهَكُم عِندَ كُلِّ مَسجِدٍ وَادعوهُ مُخلِصينَ لَهُ الدّينَ﴾ [الأعراف: ٢٩] «بڵێ پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری کردووە و هەروا لە لای هەموو جێنوێژ و مزگەوتێکدا لە پەرستشدا نییەت و ڕووی دڵانتان بۆ ئەویەکلاکەنەوە.»

ئاوڕدانەوەی دڵیش بە لای جگە لە خوادا یان بە خەرجکردنی پەرستشێکی تەواو دەبێت کە ئیدی ئەوە بوتپەرەستی گەورەیە، وەک دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الشِّركَ لَظُلمٌ عَظيمٌ﴾ [لقمان: ١٣] «بەڕاستی کە هاوەڵپەیداکردن ستەمێکی گەورە و زلەیە»، یاخود ئاوڕدانەوەکەی دڵ بۆ ویستنی خاتر و پێگەیەکی لای خەڵکە ئەمەیان پێغەمبەر (ﷺ) دەستەواژەی شیرکی بچووکی پێ ناولێناوە، هەروەک لەبارەی ڕیاوە دەفەرمووێت: «بەڕاستی ئەوەی لە هەمووشتێک زیاتر

لێی دەترسم لە سەرتان هاوەڵپەیداکرنی گچکەیە، جا کە پرسیاری لێ کرا لەبارەیەوە، فەرمووی: ئەوەڕیایە.»[١]

جا هەر ئاوڕدانەوەیەکی دڵ بە لای غەیری خوادا -ئیدی بە پەرستنی جگە لە ئەو بێت، یاخود بە مەیلکردنی لە ستایش و تاریفی خەڵکی بۆی- ستەمێکە کە دژ بەو دادپەروەرییەیە کە پێغەمبەران پێی هاتوون.

مەبەستیش -پەنا بەخوا- ئەوە نییە لە پایەی ڕێگری و ئامۆژگاری سیاسی و دەستدان لە بابەتی دادپەروەریی گشتی کەم بکرێتەوە، بەڵام مەبەست تەنها دەستنیشانکردنی پێگەیەتی لە ئیسلامدا کە لە خوار باوەڕ و فەڕیزەکانەوەیە، وەگەرنا؛ دەستبردن بۆ پاراستن و چاککردنی دادپەروەری گشتی لە بەرزترین واتاکانی ئەم ئایەتەیە. هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) کەسێک کە لەپێناو دادپەروەری گشتیدا خۆی کردبێتە قوربانی لە «سەردارانی شەهیدەکان»ی ئەژماردکردووە، سەردارییەتیش لە شەهیدیدا پلەیەکی زیاترە بەسەر تەنها شەهیدییەتییەوە، هەروەک لە فەرموودە بەناوبانگەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «سەرداری شەهیدەکان حەمزەیە، هەروا پیاوێک هەستابێت بۆ دەسەڵاتدارێکی ستەمکار و ڕاست و ناڕاستی پێ دابدات، ئەویش بیکوژێت.»[٢]

هۆکاری ئەوەشی کە شەهیدە ئەوەیە کە دەستبردن بۆ بابەتی دادپەروەری گشتی لە باشترین پێگەکانی جیهادە، هەروەک هاوەڵانی سونەن و جگە لەوانیش گێڕاویانەتەوە لە فەرموودەی ئەبوو سەعیدی خودری و جابر و ئەبوو ئومامە و طاریقی کوڕی شیهاب و جگە لەوانیشەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «باشترین جیهاد، قسەیەکی ڕەوا و دادپەروەرانەیە لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار.» لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: «خۆشەویسترین جیهاد

---

(١) "مسند الإمام أحمد": (٢٣٦٣٠).

(٢) "المستدرك"، للحاكم: (٤٨٨٤)،وكذا "تاريخ بغداد" للخطيب البغدادي: (٧/٤٠٦) وقد تابع فيه حكيم بن زي حفيد الصفار، وجاء من طرق أخرى أيضا.

لەلای پەروەردگار، قسەیەکی حەقە کە لەڕووی سەرکردەیەکی ستەمکاردا بگوترێت.»(١)

لە هۆکارەکانی سزادانی خەڵکی مەدیەنیش ستەمکارییە گشتییە سامانییەکان بوو، هەربۆیە پێغەمبەریان شوعەیب بەمە هەستا، هەروەک پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾[الأعراف: ٨٥] «بۆ مەدیەنیش شوعەیبی برایانمان نارد گوتی ئەی گەلەکەم (اللّه) بپەرستن، هیچ خودایەکی بەحەق پەرستراوی جگە لەوتان نییە، وا نیشانەی ڕوون و ڕۆشنتان لای پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە سا کێشانە و پێوانە و تەرازوو بەڕەوایی و مافی خۆی بەرن بەڕێوە و شتی خەڵک سووک مەکەن.»

هەروا لە هۆکارەکانی خەشمگرتنی پەروەردگار لە فیرعەون لووتبەرزیی سیاسی و چەوساندنەوەی خەڵکی بوو، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ﴾ [القصص: ٤] «بەڕاستی فیرعەون لە سەرزەویدا لووتبەرز و لەخۆدەرچوو بوو و خەڵکەکەی چین چین و جیاوازی تێکردبوو کۆمەڵێکیانی دەچەوساندەوە.»

ئیبن داوود، عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی بەکری حەنبەلی (ک: ٨٥٦ك) ڕێبازی پێشینی لە دەستگرتنی سیاسیدا پوختکردووەتەوە کە لە پەرتووکە بەناوبانگەکەیدا لە فیقهی فەرمان بە چاکە و ڕێگیری لە خراپەدا فەرموویەتی:

"مەبەستیش ئەوەیە کە نکۆڵیکردن لە هەڵەی پادشایان و کاربەدەستان و بەئاشکرا وتنی حەق و کەم گوێدان بە هێز و دەستوەشاندنیان نەریتی پێشین بووە، لەبەر پێشخستنی هەستان بە حەقی پەروەردگار.»(٢)

---

(١) "سنن أبي داود": (٤٣٤٤)، و "سنن الترمذي": (٢١٧٤)، و "سنن ابن ماجه": (٤١١).

(٢) ابن داود الحنبلي، "الكنز الأكبر في الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر"، تحقيق: مصطفى

ئەبوو حامید ئاماژەی بە بابەتێکی ورد کردووە کە ڕێبازی پێشینە لە بەمەرجگرتنی مۆڵەتپێدانی کاربەدەست لە نکۆڵی و دەستگرتنیدا کە فەرموویەتی:

"بەردەوامیی نەریت و دابی پێشین لە «ڕەخنەگیری و دەستگرتنی کاربەدەستان»دا بڕینەرەوەیە بە کۆدەنگییان لەسەر بێنیازبوون لە گەڕاندنەوەی بۆ لایان -کاربەدەستان-، بەڵکوو هەموو چاکەیەک ئەگەر کاربەدەست پێی ڕازیبوو باشە، وەگەرنا پێی سەغڵەت ئەبوو، ئەوکات سەغڵەتی و ناڕازیبوونی ئەو لە خۆیدا خراپەیە و دەبێت نکۆڵی لێ بکرێت، جا چۆن مۆڵەت لە خۆی وەربگیرێت بۆ نکۆڵی لێکردنی، دابی پێشینیش لە نکۆڵیکردن لە کاربەدەستان بەڵگەیە لەسەر ئەوە."[١]

هەرچەندە ئەسڵەن لە گوتاری زێدەڕەوانی مەدەنییەتدا تێبینی ئەوە دەدرێت کە لە ئاست گەندەڵی و ستەمکارییە گشتییەکاندا بێدەنگ و خۆونکەرن، زۆرینەی قسە و باسیان تەنها لەسەر: ئازادییە ڕەفتارییەکان، داهێنانی ڕۆشنبیری، تۆمەتبارکردنی توراس، بەستنەوەی دامەزراوە بانگخوازییەکان بە توندوتیژییەوە و چەپڵەلێدان بۆ دەستکەوتی ڕۆژئاوایی، نموونەی ئەو کەیسانەیە. هۆکاری بێدەنگبوونیشیان لە گەندەڵییەکانی ستەمکاری گشتی، ئەو ڕووگیربوون و پێگیرانەیە کە وایان پێ باشترە تێی پەڕێنن.

بە ئەرکباری ویژدانیش لەسەرمانە کە بڵێین: ئەو کەسەی کە دەست بۆ پرسی دادپەروەری گشتی دەبات لەپێناو خوادا، با زێدەڕەوی لە هەندێک لە لایەنەکانی مەدەنییەتیشدا هەبێت هێشتا پاکتر و چاکتر و پێگەی لەپێشترە لەوانەی خۆیان گەوزاندووەتە: تانەدان لە سوننەت، تۆمەتبارکردنی توراس،

---

صميدة، دار الكتب العلمية، الطبعة الأولى، (١٤١٧هـ)، (ص٢٠١).

(١) الغزالي، "إحياء علوم الدين"، دار الخير، الطبعة الثانية، (١٤١٣هـ): (٣/١٦).

گەورەکردنەوەی ڕۆژئاوا، هاندان لە دژی کاری بانگخوازی، بۆسەنانەوە بۆ هەڵە و پەڵەیەکی پیاوچاکان و ڕێگیریکاران لە خراپە، ناشرینکردنی فەتوا ئاینییەکان، ڕازاندنەوە سپیکاری بۆ ڕژێمەکان و نموونەی ئەوانە لە کەیسە چارەڕەشە ڕۆژنامەوانییەکان، ئەمە لە کوێ و ئەوە لە کوێ؟!

ئەوەشی لێرەدا لامان گرنگە ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە کە ڕوونکردنەوە و دەرخستنی پێگە و پایەی ڕێگیریکاری سیاسی و دەستدانە پرسی دادپەروەری گشتی و ئەوەی کە لە خوار باوەڕ و پاکیزەیی و فەڕیزەکانەوەیە، لە بەهای ناڕووشێنێت و لە شانی کەمناکاتەوە، بەڵکوو ئەوەی ئەمەی بەسەردا دێنێت و خەڵکی لێ دەڕەتێنێت و لایان ناشیرینی دەکات ئەگەر ڕاشکاو بین، زێدەڕەوی تێداکردنی هەندێک لەوانەیە خۆیانی دەدەنەپاڵ، هەتاکوو بەوەی گەیاندن کە: لە شکۆی پێشەوایانی ڕێنومایی و بەرزەزانایانی خاوەنشان بێننە خوارێ، زۆرینەی فەقیهەکانی پێشین تۆمەتباربکەن بە ماستاوچییەتی کردن بۆ دەسەڵاتی عەبباسی، هەروەها تانە لە سەرچاوەکانی توراسی ئیسلامی بدەن و بڵێن کە تەنها سەرقاڵی بابەتی پەڕاوێز بوونە و نموونەی ئەوانە کە ئامانجی گلێرکردنەوەی تەواوی خەم و گرینگیپێدانە بە بەرهەڵستکاری سیاسی.

بەجۆرێک کە هەندێک لەوانەی گرینگیدەرن بە فایلی دادپەروەری و شورا-ڕاوێژ وایان زانیوە کە بەتاڵکردنەوەی خەمخۆری لە کەیسەکانی بابەتی خودایی و وردەکارییەکانی تەشریعدا کە چاخە زێڕینەکان گرینگیان پێداوە و خەمیان لێ خواردووە، ڕاستەوخۆ و خودکارانە بەرەو چوونەناو پڕۆژەکانی چارەسەرکاری و سەرقاڵی بە دادپەروەری گشتی و دەستاودەستکردنی دەسەڵات و بەدەستوورکردنی سیستمی سیاسی و نموونەی ئەو کەیسانە هەنگاو دەنێت.

لەڕاستیشدا: ئەم شێوازە زۆرجار دژمەبەستانە دەشکێتەوە، وا لە لاوی موسڵمانی مەزن ڕاگری پێشین دەکات کە هەر لە بنچینەوە بکەوێتە گومان لەم

جۆرە بانگەشە و بانگەوازییانە و خۆی لێ بەدوور بگرێت، ئەوەش ئەنجامێکی سروشتییە؛ چونکە زێدەڕەوی زۆرجار ئەنجامی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە.

بەڵکوو ئەم چەواشەکارییە شەرعییانە بە ئامانجی لێخڕکردنەوەی خەم و گرینگیپێدان بە نکۆڵیکاری سیاسی دەکرێت گەورە ببێتەوە، ئەوکات ئیدی زیانی ستەمی سیاسی کەمتر و سادەتر بنوێنێت لەم بانگەشە چەواشەکارانە، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "پێشەوایانی بیدعەچییەتی زەرەرهێنترن بۆ ئوممەت هەتا تاوانکاران، هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە کوشتی خەواریج داوە، بەڵام نەهی و ڕێگیری کردووە لە کوشتنی کاربەدەستانی ستەمکار."[١]

زێدەڕەویکردنیش لە کەیسی چارەکردنی دادپەروەری گشتیدا هەندێکیانی بەرەو سەرەنجامگەلێکی کارەساتبار بردووە، تەنانەت هەندێک لە خۆدەرەپاڵانی ئەم ئاڕاستەیە وای لێهاتووە بەڕاشکاوی دەڵێت کە مەبەستی پەیامبەریەتی تەنها بەرپاکردنی دادپەروەری دونیایی و ئەوانەیە، ئەوەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە کە ئەنجامگەلی مەترسیداری بەشوێنەوەیە،

پێشتریش ئاماژەمان پێداوە، پێشەوا ئیبن تەیمییە لە (الصفدية)دا ئاماژەی بەوە کردووە، کە فەرموویەتی: "لەوەشی کە قسەی بەتاڵیان بەدەردەخات- مەبەست فەیلەسووفەکانن- ئەوەی کە وا بانگەشە دەکەن کە مەبەست لە پەیامبەرییەتی بەرپاکردنی دادپەروەری دونیایە. [٢]

مەبەستیش لەم ئاماژە کورتە جەختکردنەوەیە لە دوو پرسی هاوتەریب کە لێک جیانابنەوە، یەکەمیان: ئەوەی کە چارەسەری دادپەروەریی گشتی

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٧/٢٨٤).

(٢) ابن تيمية، "الصفدية"، تحقيق: محمد رشاد سالم، دار الهدي النبوي، الطبعة الأولى، (١٤٢١هـ): (٢/٢٣٨).

پێگەیەکە لە شەرەفمەندترین پێگەکانی جیهاد، دووەمینیشیان: خەم و هەوڵ گلێرکردنەوە بۆ نکۆڵیکاری سیاسی نابێت لە ڕێگای شکاندنی پێگەی پێشەوایانی چاخە زێڕینەکانەوە بەڕێوەبچێت و نە لەڕێگای کورتکردنەوەی شەریعەت لەو پرسەشدا.

نزیکترین نموونەیەکیش ئەوە ڕوون بکاتەوە: ئەوەی کە موجاهیدێکی ڕێگای پەروەردگار ئەگەر لە پرسی جیهاددا زێدەڕەوی بکات بەجۆرێک کە پێشیبخات بەسەر گرینگیدان بە بنچینەکانی باوەڕ، یاخود فەرزەکاندا، یاخود هاوەڵانیان شوێنکەوتووانیان شوێنکەوتووانی وان بەکەم بگرێت لەو پێناوەدا بە جۆرێک کە لە دڵی بیسەرانیدا کینە بەرانبەر بە چاخە زێڕینەکان بسازێنێت، ئەوکات ئاڵا جیهادییەکەی دەبێتە ئاڵایەکی زەمکراو و نابوود کە لاوی موسڵمان زیاتر لەوەی کەمەندکێشی بێت لێی دووردەکەوێتەوە.

لە نیشانە دیاریکەرە دیارەکانی ئەو توێژەی کە دیدی ماددییان بۆ ڕابوون و پێشکەوتن قووتداوە و ئیدی مەبەستی شەریعەت تەنها بە بونیادنانی ماددی کۆمەڵگاکان تێگەیشتوون؛ ئەوەیە کە ئەوپەڕی ساردی دەنوێنن لە ئاست خراپەکارییەکان لە بیروباوەڕ و تاوانکارییەکاندا، کەچی لە بابەتە داراییەکاندا ئاگری غیرەگیری و هەستیاریان هەڵدەستێت، ئیبن تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەم هەستە ماددیانە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ژیاندا ئاوا وێنادەکات: "مرۆڤی دونیایی و دونیا یاران ئەوانەن کە ئەگەر دونیایان سەلامەت بوو ئیدی گوێ بە زایەچوونی ئاینیان نادەن." (١)

---

(١) ابن تیمیة، "مجموع الفتاوی": (١٠/٦٠٣).

# ٧- کارلێکی دەروونی بە باوەڕ

چاودێر تێبینی ئەوە دەکات کە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی گەر یەکێکیان بە قەدەر تووشی مامەڵەکردن لەگەڵ هەندێک لە دەقە شەرعییەکان بێت؛ ئەوا تەنها مەیلی بەو لایەدایە کە وەک گوتارێکی مەعریفی هەڵگری زانیاری پەتی مامەڵەی لەگەڵدا بکات کە کۆمەڵێک پرسی مەعریفی لەخۆگرتووە و تەواو، نەک وەک گوتارێکی ئیمانی زیندوو کە پەیامێکی لەخۆگرتبێت. هەربۆیە خەڵک دووردەخەنەوە لە دیاردەکانی کارلێکی دەروونی لە هەمبەر قورئاندا، لە وێنەی سەرلەسینەنووسان ئەستۆیەکی کەچ و شلبوونەوەی پەلەکان و فرمێسک ڕشتن و لەرزینی و داچڵەکینی لەش، هەندێکیشیان بە مەیلێکی پاک نیشاندانی پیۆریتانی زێدەڕەو لەم حاڵەتە ئیمانییانە دەڕوانن کە بەلایانەوە لە ساویلکەییێتی حەکایەتخوانانەوە نزیکترە هەتا سەنگی مەعریفی.

ئەم وێناکارییەش بەهۆی نەزانین و نەناسینی مەبەست و ویستی خودا لە مرۆڤ لە وەختی خوێندنەوەی فەرمایشتەکانیدا هاتووە و ئەوەی کە ئایا حاڵەتی بەرز و نموونەیی لە هەمبەر وەحیدا چییە.

بەڕاستی بەتەنها هەستکردن بەوەی کە وەحی «وتەی خودایەکە» بەسە بۆ هەژاندنی باوەڕدار لە قووڵاییەکانیەوە، پەروەردگار لە وێنەگەلێکی ڕۆشنا و سەرنجڕاکێشدا حاڵەتی باوەڕدارانی بۆ باسفەرمووین، هەروەها کارلێکی دەروونیان لە هەمبەر وەحیدا چۆن بووە، ئەو وێنانە کە ستایشێکی جەوهەرییان بۆ ئەو حاڵەتانە هەڵگرتووە، جا کاتێک ڕێڕەوی ڕەوتی پێغەمبەرانی باسفەرموو لە پاشکۆیدا حاڵیانی خستەڕوو لە وەختی بیستنی ئایەتەکانی وەحیدا کە دەفەرموویت: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ أَنعَمَ اللَّهُ عَلَيهِم مِنَ النَّبِيِّينَ مِن ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّن حَمَلنا

مَعَ نوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبراهيمَ وَإِسرائيلَ وَمِمَّن هَدَينا وَاجتَبَينا إِذا تُتلى عَلَيهِم آياتُ الرَّحمٰنِ خَرّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩﴾ [مريم: ٥٨] «ئەوانە کە پەروەردگار نیعمەتی بەسەردا ڕێژاون لە پێغەمبەران لە نەوەی ئادەم و لەوانەی لەگەڵ نووح هەڵمانگرتن (لە کەشتێکەدا) و لە نەوەی ئیبڕاهیم و ئیسڕائیل (یەعقوب) و لەوانەش کە خۆمانڕێنموونیمان کردوون و هەڵمانبژارتوون و پاڵاوتوومانن وەختێک کە ئایەتەکانی خودای میهرەبانیان بەسەردا دەخوێنرایەوە بەدەم کڕنووش و گریەوە بەردەبوونەوە.»

ئەم ئایەتە کە ڕەگەزی پەیامبەران وێنا دەکات، نەک هەندێکیان، کە کامڵترین و شەرەفدارترینی مرۆڤایەتین، ناوازەترینن بە ڕۆشنگەڕیی ڕاستەقینە و باڵاترینن لە ئاست تاریکپەرەستی ڕاستەقینە، سا بنوارە چۆن بە بەربوونەوە سەر زەوی و گریان و کڕنووشەوە پێشوازییان لە ئایەتەکانی وەحی کردووە، جا چ کارلێکێکی دەروونی لەوە توند و گەورەتر؟

لە دیمەنێکی دیکەدا وێنەی هەڕۆژان و گریان تاریفدەداتەوە، کاتێک دەفەرموویێت: ﴿وَيَخِرّونَ لِلأَذقانِ يَبكونَ وَيَزيدُهُم خُشوعًا ۩﴾ [الإسراء: ١٠٩] «بە چەناگەدا دەهەڕۆژان بەرەو زەوی و دەگریان و ملکەچیان پێی زێدە دەبوو.»

دیمەنێکی دیکەی باوەڕداران تاریفدەدات لە وەختی پێشوازیکردندا لە ئایاتی وەحی، کە دەفەرموویێت: ﴿وَإِذا سَمِعوا ما أُنزِلَ إِلَى الرَّسولِ تَرى أَعيُنَهُم تَفيضُ مِنَ الدَّمعِ﴾ [المائده: ٨٣] «کاتێکیش ئەوە دەبیستن کە بۆ سەر پێغەمبەر دابەزیوە، دەبینی چاوانیان بە فرمێسک دەخرۆشێت و دەڕژێت.»

هەروەها کارلێکی دەروونی بە وەحی؛ لە ڕەفتار و ڕەنگدانەوەکانی مەعریفە و زانستی ڕاستەقینە دادەنێت، دەفەرموویێت: ﴿قُل آمِنوا بِهِ أَو لا تُؤمِنوا إِنَّ الَّذينَ أوتُوا العِلمَ مِن قَبلِهِ إِذا يُتلى عَلَيهِم يَخِرّونَ لِلأَذقانِ سُجَّدًا﴾ [الإسراء: ١٠٧] «بڵێ باوەڕی پێ بێنن یاخود نەیهێنن، بەڕاستی ئەوانەی کە لە پێشووتردا زانستیان پێ دراوە

وەختێک بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە بە چەناگەدا و بۆ کڕنووش دەکەونە سەر زەوی.»

جارێکی دیکەش کاریگەری جەستەیی بە قورئان نەک تەنها دەروونی باس لێ دەکات، دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحسَنَ الحَديثِ كِتابًا مُتَشابِهًا مَثانِيَ تَقشَعِرُّ مِنهُ جُلودُ الَّذينَ يَخشَونَ رَبَّهُم ثُمَّ تَلينُ جُلودُهُم وَقُلوبُهُم إِلى ذِكرِ اللَّهِ﴾ [الزمر: ٢٣] «(اللّٰه) باشترین وتە و باسی دابەزاندووە پەرتووکێکی لێکچووی دووبارەبووەوە (لە جوانچاکی و تۆکمەیی، و لە چیرۆک و حوکم و پەندەکانیدا) کە لە هەمبەریدا ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەترسێن پێستیان هەڵدەلەرزێت و گرژدەبێت لەپاشان پێست و دڵانیان ئەوجار نەرم و مایلی یادی خوا دەبێت.»

بەڵکوو پەروەردگار ئەم کاریگەربوونە دەروونییە لە هەمبەر وەحیدا لەو لێکەوت و شوێنەوارانەی باوەڕ دادەنێت کە بزربوون و نەمانی بەڵگەیە لەسەر لاوازیی باوەڕ، گەرچی هەمووشی لەدەست نەدرابێت، هەروەک دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا المُؤمِنونَ الَّذينَ إِذا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَت قُلوبُهُم﴾[الأنفال: ٢] «بەڕاستی باوەڕداران ئەوانەن کە ئەگەر ناوی (اللّٰه) هێنرا و یادی هات، دڵیان دەترسێت و ڕادەچڵەکێت.»

بە نەریتی قورئانیش؛ ئەگەر حاڵەتێکی ستایشکراو باسبکات، دژەکەشی باس لێدەکات و لۆمەی دەکات بۆ تەواوکاری ڕوونکردنەوە و مانابەخشی. هەربۆیە دەشفەرمووێت: ﴿فَوَيلٌ لِلقاسِيَةِ قُلوبُهُم﴾ [الزمر: ٢٢] «سا پەژارە وماڵوێرانی بۆ دڵڕەقان لە ئاست یادی (اللّٰه).»

بەڵکوو پەروەردگار نموونەیەکی بۆ کاریگەربوون بە وەحی لە تێڕامان و لێوردبوونەوەیدا بۆ هێناوینەتەوە کە پڕ بووە لە شەرم و شکان بۆ (اللّٰه)؛ کە پەروەردگار باسی لەوە فەرمووە کە بێگیانترینی بێگیانەکان کە چیا و بەردەکانن ئەگەر ئەم قورئانەیان لەسەر دابەزێت پێی کاریگەردەبن و بۆی دەورووژێن،

کە دەفەرموویت:

﴿لَو أَنزَلنا هذَا القُرآنَ عَلى جَبَلٍ لَرَأَيتَهُ خاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِن خَشيَةِ اللَّهِ﴾ [الحشر: ٢١] «ئەگەر ئەم قورئانەمان بۆ سەر کێوێکیش دابەزاندایە، دەتبینی دەستەمۆ و زەبوون و قڵیشاوە لە ترسی (اللّه).»

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَإِنَّ مِنَ الحِجارَةِ لَما يَتَفَجَّرُ مِنهُ الأَنهارُ وَإِنَّ مِنها لَما يَشَّقَّقُ فَيَخرُجُ مِنهُ الماءُ وَإِنَّ مِنها لَما يَهبِطُ مِن خَشيَةِ اللَّهِ﴾[البقرة: ٧٤] «لەو بەردانە تێیدایە کە ڕووبارەکانی لێوە دەتەقنەوە و تێیاندایە کە شەق دەبات و ئاوی لێدەردەچێت و تێیاندایە کە لە ترسی (اللّه) گلێردەبنەوە.»

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَلَو أَنَّ قُرآنًا سُيِّرَت بِهِ الجِبالُ أَو قُطِّعَت بِهِ الأَرضُ أَو كُلِّمَ بِهِ المَوتى﴾[الرعد: ٣١] «خۆ ئەگەر قورئانێک شاخەکانی پێ بخرێتە سەرپێ و ڕۆشتن یاخود زەوی پێ لەت لەت بکرێت، یاخود مردووانی پێ بدوێنرێت."

بەڵکوو خودی درەختەکانیش کاریگەر دەبن بە یادی خودا، وەک لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کە کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) جێگای خۆی گۆڕی بۆ لای مینبەر، قەدی دارخورماکە وەکوو مناڵێک کە بنرکێنێت و ژیری بکەنەوە دەینرکاند، هەروەک لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە:

«کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی هەینی بە لای دارخورمایەکەوە دەوەستا، جا ئافرەتێک لە ئەنصار-پشتیوانان وتی: ئەرێ مینبەرێکت بۆ دروست نەکەین؟ فەرمووی: ئەگەر ویستتان. جا مینبەرێکیان بۆ دروستکرد، ئەوجا کە ڕۆژی هەینی هات، هاتە لای مینبەر، ئیتر دارخورما وەکوو مناڵ زاری دەهات، لەپاشان پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی و باوەشی پێدا کرد، وەکوو نرکاندنی مناڵێک کە ژیر بکرێتەوە، دەینرکاند، فەرمووی: بۆ ئەویادەی (اللّه) کە دەیبیست دەگریا... »[١]

---

(١) "صحيح البخاري": (٣٥٨٤).

جا بڕوانە چۆن بێگیانێک لە شەیدایی و تینوێتی بۆ یادی خوا و وەحییەک کە لە پێغەمبەری (ﷺ) دەبیست دەگری، تەنانەت حەسەنی بەسری جارێک کە دانیشتبوو ئەم فەرموودەیەی بۆ هاوەڵانی دەگێڕایەوە، گریا، لەپاشان فەرمووی: "ئەرێ بەندەکانی خوا! تەختەیەک بیری پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات لەبەر ئەو پێگەیەی لای خوا هەیەتی، ئێوە شایانترن کە بیری دیداری ئەو بکەن".(١)

بەڵکوو ئەم کاریگەربوونە دەروونییە تەنها لە گوێڕاگرتن لە وەحیدا خۆی نانوێنێت، بگرە باوەڕدار لە هەمبەر حەقیقەتەکانی دیکەی باوەڕیش خۆی بۆ ناگیرێت کە لە ئەنجامی لەدەستدانی تەنها کردەوەیەکی چاکە کە لە خوای نزیکدەکاتەوە لەوانەیە نغرۆی خەفەت و گریان بێت، ئەم ناوەندەش زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی عەقڵیان پێی ناشکێت، جا ئەگەر پیاوێک ببینن کە لەبەر فەوتانی پەرستشێک لە پەرستشەکان دەگری، دڵیان پڕ دەبێت لە سووک تەماشاکردنی، لەکاتێکدا پەروەردگار چمکێکمان لە هەواڵی هاوەڵان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن بە لەدەستچوونی کردەوەیەکی چاکە کاریگەر دەبوون، کە دەفەرمووێت: ﴿وَلا عَلَى الَّذينَ إِذا ما أَتَوكَ لِتَحمِلَهُم قُلتَ لا أَجِدُ ما أَحمِلُكُم عَلَيهِ تَوَلَّوا وَأَعيُنُهُم تَفيضُ مِنَ الدَّمعِ حَزَنًا أَلّا يَجِدوا ما يُنفِقونَ﴾ [التوبه: ٩٢] «(جیهاد) نە لەسەر ئەوانەشە کە وەختێک دێنە لات تاکوو بە سوارییەک (بۆ جەنگ) هەڵیان بگریت و تۆش دەڵێیت هیچ شک نابەم هەڵتانگرم پێی ئەوسا دەگەڕێنەوە و چاویان خڕۆشاوە بە فرمێسک لە خەفەتی ئەوەی کە هیچێکیان نییە ببەخشن.»

جا ئەگەر ئەوە وابێت، ئیدی کەی ڕەوایە ئێمە بە ساردییەکی مەعریفی پەتییەوە گوێ لە وەحی و حەقیقەتەکانی باوەڕ ڕابگرین؟! یان چۆن کارلێکی دەروونی بە وەحی و باوەڕ وەک ساویلکەییەکی حەکایەتخوانی مامەڵە

---

(١) "صحيح ابن حبان": (٦٥٠٧).

لەگەڵدا بکەین؟ بە واقیعی: ئەم حاڵەتە مەزنانە بەهای خۆیان تەنها بەهۆی گەورەکردنەوەی مەدەنییەتی دونیایی و زانستە ماددییەکانییەوە لەدەست داوە، ئەم خستنەڕووە خوداییەش بەسە بۆ مرۆڤی ژیر: ﴿أَلَم يَأنِ لِلَّذينَ آمَنوا أَن تَخشَعَ قُلوبُهُم لِذِكرِ اللَّهِ وَما نَزَلَ مِنَ الحَقِّ وَلا يَكونوا كَالَّذينَ أوتُوا الكِتابَ مِن قَبلُ فَطالَ عَلَيهِمُ الأَمَدُ فَقَسَت قُلوبُهُم﴾ [الحديد: ١٦] «ئەرێ وەختی نییە بۆ باوەڕداران کە دڵیان بۆ یادی خوا و ئەو حەقەی دابەزیوە نەرم بێت و بجوێت و وەک ئەوانە نەبن کە لە پێشوودا پەرتووکیان پێ درا جا کە دەمێکی درێژیان بەسەرداچوو؛ دڵیان ڕەق بوو.»

# ٨- گرفتی گەورەکردنەوەی تیۆری بۆ بابەتە گشتییەکان (الکلیات)

سەرقاڵانی عەمبارکردنی مەدەنییەتی ماددی زۆر دژبەرانە دەدوێن سەبارەت بە دڵخۆشکردن بە شتە بەشەکی و لقی و وردەکارییەکانی شەریعەت، هەروەها کاتێک فەقیهێکی شەرعی یاخود بیریارێکی موسڵمان لە بابەتێکی شەرعیدا خۆی ماندوو دەکات؛ بەوە بەرانبەری دەبنەوە کە ئێمە دەبێت لە شتی لقی و بەشەکییەوە بۆ ئاستی گشتییەکان بەرزببینەوە، هەروەها گرنگ خودی بابەتەکان نییە، گرنگ بنچینە گشتییەکانە و ئێمە نابێت لە تایبەتدا ونبین و گشتی فەرامۆش بکەین، وە نموونەی ئەم دەربڕینانە، هەندێکیشیان هەوڵ دەدەن ئەم بیرۆکەیە بدەنەپاڵ کۆمەڵێک دەقی توراسی لە زانستی مقاصد- مەبەستەکانی شەریعەتدا سەبارەت بە گرنگیی گشتییە شەرعییەکان، بەتایبەت لە ڕێبەری زانستی مەبەستەکانەوە پێشەوا شاطیبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

لە ڕاستیشدا: ئەم ڕوانینە بۆ پەیوەندیی نێوان بەشی و گشتی، فەرامۆشکردنی هەندێک لە پێدراوەکانی وەحی تێدایە، بەڵکوو بووەتە میکانیزمێکی ڕێکخراو بۆ قووتدانی زاراوە شەرعییەکان لەژێر ناونیشانی گرنگیدان بە گشتی و سەرجەم و تێکڕا و ئەوانەدا.

لە گرنگترین ڕەهەندەکانی هەبوونی گرفت لەم دیدگایەدا ئەوەیە کە ڕۆڵی بەشەکی ونکردووە لە پاراستنی گشتیدا، جا وای داناوە کە بەشەکەی دژ بە گشتییە، لە واقیعیشدا: بەشەکی واتە بەدیهاتنی ڕاستەقینە بۆ گشتی، جا هەر جێبەجێکارییەکی واقیعی لە توێی خۆیدا واتای گشتییەکەی هەڵگرتووە کە

«گشتی» تەنها بڕی زەینی هاوبەش و پوختکراوەیە کە لە لادانی باری تووشهات و لەناکاو و هێشتنەوەی واتای هاوبەش دێتەکایەوە.

جا ئەگەر گشتیمان گەورەکردەوە و جێبەجێکارییەکانیمان بزرکرد ئەوکات ئەم گەورەکردنەوەیە دەبێتە گەورەکردنەوەیەکی تیۆری شێوەیی کە ئەسڵەن حەقیقەتی نییە، نموونەیەکیش بۆ ئەوە بێنینەوە:

دەبینیت یەک لە نووسەران دەڵێت: "دەبێت پاکیزەیی وەک بەهایەکی گەورەی گشتی گرینگی پێ بدەین، نەک گرنگی بە جێبەجێکارییە بەشییەکانی بدەین." لەپاشان هەرچی میکانیزم کە پارێزگاری لەو بەهایە دەکەن بەتاڵ دەکاتەوە و شلگیریش دەکات بە کردنەوەی گشت ئەو ڕێگایانەی کە دژ بەم بەهایەن، کەچی پاش ئەوەش دەڵێت کە پاکیزەیی وەک بەهایەک تەماشا کردووە نەک کۆمەڵێک جێبەجێکاری، جا پارێزگاری ئەم کابرایە لە «گشتی پاکیزەیی» پارێزگارییەکی تیۆری شێوەیی ناڕاستەقینەیە.

ئەوەی دیکەشیان کە بانگەشەی مەزن ڕاگرتنی بنچینەی گشتیی بانگەواز و گەیاندن دەکات، بەڵام تاک تاکی خودی ئامرازەکانی بانگەوازی شەرعی بەکەم دەگرێت، مەزن ڕاگری ئەمەشیان بۆ بانگەواز، مەزن ڕاگیرییەکی تیۆری ناڕاستەقینەیە.

لەسەریشی چەندێک مرۆڤ مەزن ڕاگرتنی بۆ بەشییەکانی شەریعەت زیاتر بێت، هێندەش مەزن ڕاگرتنی بۆ گشتییە ناوەڕۆکییەکانیشی زیاترە. چەندێکیش بەشییەکانی شەریعەت بەکەم بگرێت، زیاتر لەوە گشتییە ناوەڕۆکییەکەشی بەکەم گرتووە، سا ڕێگایەک بۆ مەزن ڕاگرتنی گشتی نییە مەگەر بە مەزن ڕاگرتنی بەشی و جێبەجێکارییەکانی. بەوەش ڕوون دەبێتەوە کە بانگەشەکانی مەزن ڕاگرتنی گشتی کە زێدەڕەوانی مەدەنییەت دەیڵێنەوە؛ هەموو ئەوە لە کۆتاییدا تەنها ئامرازێکە بۆ بەتاڵکردنەوەی گشتی لە ناوەڕۆکی خۆی لە ژێر ناوی

بەمەزن ڕاگرتنی.

پێشەوا شاطبی لە پەرتووکەکەیدا (الموافقات) ڕوونکردنەوە بە سەلمێنراوێکی گەوهەری دەدات کە بانگەشە هاوچەرخەکان سەبارەت بە گرینگیدان بە گشتی پووچەڵ دەکاتەوە، ئەویش «ڕۆڵی بەشی لە بەرپاکردن و ڕاگرتنی گشتیدا»، ئەوەش لە بەشێکی ناوازەی تایبەتدا کە بۆ ئەم بابەتەی دامەزراندووە و بەڵگەی زۆری بۆڕیزکردوون، لەوەش ئەو وتەیەی کە دەفەرمووێت: "بەشییەکان مەبەست و ویستراو و لەبەرچاوگیراون بۆڕاگرتن و بەرپاکردنی گشتی." [١] هەروەها ئەوەی کە دەفەرمووێت: "بەشییەکان وەک گشتییەکان وان لە خوازراوی و پارێزگاری لێکردنیاندا." [٢]، نموونەی زۆری دیکەی ئەم هۆشیاری دانانەش لە (الموافقات) دا.

لەپاشان شاطیبی ئاماژە بەوە دەکات کە گشتی تەنها «چەمکێکی تیۆرییە»، هەربۆیە زۆرینەی مەنطیقییەکان جەختیان لەوە کردووەتەوە کە گشتی تەنها لە زەیندا هەیە، ئەوەشی لە دەرەوەی زەیندایە ئەوە تەنها جێبەجێکارییەکانیەتی، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەوەی گشتی گەورە دەکاتەوە دوور لە جێبەجێکارییەکانی، ئەوە تەنها چەمکێکی تیۆری زەینیی پەتی گەورە کردووەتەوە نەک واقیعێکی کرداری ئەو گشتییە، هەروەک شاطیبی لە بەڵگەهێنانەوەدا بۆ ئەم کەیسە دەفەرمووێت:

"بەشییەکان ئەگەر لەبەرچاوگیراو و مەبەست نەبوونایە لە ڕاگرتنی گشتیدا ئەوکات خۆ هەر لە بنەڕەتەوە نەدەکرا فەرمان بە گشتی بکرێت، چونکە گشتی وەک ئەوەی کە گشتییە ناسازێت لە تەکلیف-ڕاسپاردندا مەبەست بێت، چونکە بۆ شتێکی عەقڵی دەگەڕێتەوە کە لە دەرەوەدا نایەتە چنگ مەگەر لە توێ و

---

(١) الشاطبی، الموافقات» تحقیق: محمد مرابي، موسسة الرسالة: (١٨٠/١)

(٢)الشاطبی، الموافقات» تحقیق: محمد مرابي، موسسة الرسالة: (١٨٠/١)

ناواخنی بەشییەکاندا."[١]

لە ڕوویەکی دیکەشەوە: کەسێک لە هەواڵی هاوەڵانی کیتاب ڕابمێنێت کە خودا لە قورئاندا هێناوییەتی، تێبینی ئەوە دەدات کە هاوەڵانی کیتاب پەرتووکە ئاسمانییەکانیان بە مەزن و پیرۆز ڕادەگرت، لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگار هەر دژیان دوواوە و لۆمەی کردوون؛ چونکە پیرۆز و مەزن ڕاگرییان بۆ ئەو پەرتووکە ئاسمانییانە تەنها پیرۆزڕاگرییەکی تیۆری و مەزنگیرییەکی شێوەیی بوو کە نە ڕاستییەکی هەبوو نە شوێنەوارێکی جێبەجێکاری کرداری، بۆیە سوودی بۆیان نەبوو.

کەواتە مەبەست پیرۆزگرتنی شێوەیی دەق نییە، یاخود پیرۆزگیری تیۆری چەمکەکان، بەڵکوو ڕاگرتن و بەرپاکرنی حەقیقەت و واتاکانە بە واقیعێکی زیندووی ڕاستەوخۆ و بەرکار.

هەربۆیە؛ پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک بە هاوەڵانی فەرموو: «نزیکە زانست هەڵبگیرێت و نەمێنێت.» زیادی کوڕی لوبەید پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، جا چۆن زانست نامێنێت کە ئێمە قورئان دەخوێنینەوە و بە منداڵانیشمانی دەخوێنینەوە و فێردەکەین و ئەوانیش بە منداڵانیانی فێردەکەن و دەخوێننەوە هەتاڕۆژی دوایی؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:

«لەباری دایکت چی کوڕی لوبەید! خۆ من تۆم بە فامیدەترینی خەڵکی مەدینە دەزانی، مەگەر هێشتا تەوڕات و ئینجیل لە دەستی جوولەکە و گاورەکاندا نین، بەڵام سوودی بۆیان نەبوو وەختێک فەرمانی خوایان دەست لێبەردا.» لەپاشان ئەوەی خوێندەوە: ﴿وَلَو أَنَّهُم أَقامُوا التَّوراةَ وَالإِنجيلَ﴾ [المائدە: ٦٦] «خۆ ئەگەر ئەوان -ئەهلی کیتاب- تەوڕات و ئینجیلیان کار پێ بکردایە...»

---

(١) الشاطبی، الموافقات» تحقیق: محمد مرابي، موسسة الرسالة: (١/ ١٨٠)

جا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی ڕوونکردەوە بۆ هاوەڵی مەزن زیادی کوڕی لوبەید کە هەم لە کۆچکردووانە و هەم لە پشتیوانان، کە مەبەست تەنها بریتی نییە لە مانەوەی دەق و پاراستنی وشەکانی، بەڵکوو لە ڕاگیرکردن و بەرپاکردنی دایە بە واقیعێکی زیندووی بەرکار لە سەرزەویدا، ئەو بەرپاکردنەش تەنها بە بەرپاکردن و کارپێکردنی وردەکاری و جێبەجێکارییەکانی دەبێت.

مەبەستیش ئەوەیە کە: ڕەچاوکردنی بەشی ڕێگای هەستاندنەوە و ڕاگیرکردنی گشتییە، کاتێک «بەشی» لە پێگەی کەمدەبێتەوە کە دژواری لەگەڵ «گشتی»دا هەبێت، بەڵام کە پێکدادان و دژبەرییان نەبوو، ئەوا فەوتاندنی «بەشی» فەوتاندنی «گشتی»یە وەکڕوونکرایەوە.



# ٩- تیزی ئاشتی ڕەها

هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت بیرۆکەی ئاشتی ڕەها دەڵێنەوە و بانگەواز دەکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پڕۆژەکانی داگیرکاری سەربازیی ئاشکرا لە ڕێگای زمانی خۆشەویستی و سینەفراوانی و فرێدانی چەک و نموونەی ئەو بیرۆکە خەیاڵپڵاوە وەرگیراوانەوە لە نموونەی دانای هیندی ناسراو مەهاتما غاندی، هەندێکیشیان لە بەمەزن دانانی غاندی و نمایشکردنیدا وەک ڕزگارکەرێک زێدەڕۆی یدەکەن.

لەڕاستیشدا: شەریعەتەکەی خودا لە شەریعەتەکەی غاندی بەرز و داناترە، ئەم پێگەیەش پێگەیەکی مەترسیداری باوەڕە چونکە بەرهەڵستکاری کرداری بۆ چەسپاوەکانی وەحی لەخۆگرتووە کە پەروەردگار ئاشتی و چاکەکردنی نووسیوە لە بەرانبەر بێزیان و ئاشتیخوازان و کوشتاریش لەدژی دەستدرێژکاران، فەرمانی ئەوەی پێ کردووین لەوێدا کە دەفەرمووێت: ﴿فَإِذا لَقيتُمُ الَّذينَ كَفَروا فَضَربَ الرِّقابِ حَتّى إِذا أَثخَنتُموهُم فَشُدُّوا الوَثاقَ﴾ [محمد: ٤] «جا کە گەیشتن بە بێباوەڕان (لە وەختی جەنگدا) لە ئەستۆیان بدەن هەتا کاتێکیش کە ئیدی کوشتاری زۆرتان لێ کردن و بڕسکیانتان بڕی ئەوجا (دیلەکانیان) توند ببەستنەوە.»

لە دوو جێگای پەرتووکەکەی خوداش لە سوورەتەکانی تەوبە و تەحریمدا فەرمانی ڕاشکاوی بە توندبوون لەگەڵ بێباوەڕاندا پێ کردووین کە دەفەرمووێت: ﴿يا أَيُّهَا النَّبِيُّ جاهِدِ الكُفّارَ وَالمُنافِقينَ وَاغلُظ عَلَيهِم﴾ [التوبة: ٧٣] [التحريم: ٩]«ئەی پێغەمبەر جیهادی بێباوەڕان و دووڕووان بکە و لەسەریشیان توند و

ڕەق بە.»

فەرمانی کوشتاری زۆریشی کردووە کە دەفەرموویت: ﴿ما كانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكونَ لَهُ أَسرى حَتّى يُثخِنَ فِي الأَرضِ﴾ [الأنفال: ٦٧] «بۆ هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە دیل ڕابگرێت هەتا ئەوەی کوشتارێکی گەورە لە سەرزەویدا نەکات.»

فەرمانی بە فریشتەکان کردووە بەوەی کە دەفەرموویت: ﴿فَاضرِبوا فَوقَ الأَعناقِ وَاضرِبوا مِنهُم كُلَّ بَنانٍ﴾ [الأنفال: ١٢] «سا بدەن لە ئەستۆیان و لە هەرچی پەلوپۆیانە.»

فەرمانی بە ترساندن و شپرزەکردنی دەستدرێژکاران کردووە، کە دەفەرموویت: ﴿فَإِمّا تَثقَفَنَّهُم فِي الحَربِ فَشَرِّد بِهِم مَن خَلفَهُم﴾ [الأنفال: ٥٧] «جا کە لە جەنگدا پێیان گەشتی ئەوانەی پشتە خۆشیان پێ بتۆقێنە و شپرزە بکە.»

بەڵکوو پەروەردگار ڕێگری ئەوەی لێ کردووین کە ئەگەر جەنگ لەگەڵ دەستدرێژکاراندا دەستی پێکرد ئێمە لەبەردا داوای ئاشتی و ئاگربەست بکەین ئەگەر خۆمان لایەنی بەهێز بووین، دەفەرموویت: ﴿فَلا تَهِنوا وَتَدعوا إِلَى السَّلمِ وَأَنتُمُ الأَعلَونَ﴾ [محمد: ٣٥] «جا لاواز و شکاوە مەبن و داوای ئاشتی و وەستانی جەنگ مەکەن وەختێک کە ئێوە زاڵ و بەهێزن»، ئەمەش ئاڕاستەکردنێکی خودایی ڕاشکاوە کە هەرچی زۆرلەخۆکارییەکانی تیۆری ئاشتیخوازی هەن، ناتوانن لە ناوەڕۆکی خۆی لابدەن.

سا ئەگەر دەسەڵاتداری ئاسمانەکان و زەوی -وەک لە ئایەتەکاندا هاتووە- هانمان دەدات کە بە کوشتاری زۆر و توند و ڕەقی و لەملدان و شپرزە و ئاوارەکردن و دەستپێشخەری نەکردن بە ئاشتەوایی؛ ڕووبەڕووی داگیرکار و دەستدرێژکار بینەوە و ئەم کارە شەرەفمەندانانەمان لا خۆشەویست دەکات و و لەسەری پاداشت دەداتەوە، ئیدی چۆن ژیرێک بوێری ئەوەی دەبێت ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوە بۆ فەرمانی (اللّٰه) بکات و ڕای کابرایەکی هیندۆسی

بتپەرست بە گونجاو و داناتر دابنێت؟!

سوێند بە خوا خۆ ئەگەر دڵ پڕ بووایە لە مەزنراگری و ڕێزگیری شایان لە پەروەردگار ئەسڵەن وای بیرنەدەکردەوە حوکمی هیندۆسییەک بە حوکمی خوا بەراورد بکات، هیچ ژیرێکیش شکی لەوە نییە کە لەو جێگایەدا کە بڕیاری جگە لە پەروەردگار پێش دەخرێت؛ پشکێک لە پشکەکانی دووڕوویی ئامادەیی هەیە کە پەروەردگار موسڵمانی لە تێکەوتنی ئاگادارکردووەتەوە، وەک دەفەرمووێت: ﴿وإذًا فَلْيَحذَرِ الَّذينَ يُخالِفونَ عَن أَمرِهِ﴾ [النور: ٦٣] «با بترسن و ئاگادار بن ئەوانەی کە سەرپێچی فەرمانی ئەو دەکەن... »

بێگومان ئەمەش لە ڕووی پەیوەندی بیرۆکەی ئاشتی ڕەها بە دەقەکانی وەحییەوە، لە ڕووی پەیوەندیشی بە واقیعەوە تەنها بریتییە بیرۆکەیەکی ڕۆمانسی پێکەنیناوی کە زۆرینەی گەلانی هاوچەرخی ئەمڕۆ پاڵەوانە نەتەوەییە خاوەن دەستکەوتەکانی نێو جەنگە گەورەکان دیار و مەزندەکەنەوە، بەپێی لێزانینان لە لەناوبردن و فەوتاندنی دوژمن و بەدەستهێنانی سەرکەوتنە جەنگییە یەکلاکەرەوەکان بەرزیان دەکەنەوە و زیاتر دەیانەوێن و لە ناوەندی شارەکاندا پەیکەری یادەوەرییان بۆ دروست دەکەن، ئەمەش زانراو و بینراو و بەرجەستەیە.

پێکەنیناویتر لەوە ئەوەیە کە وێنای ئاشتیخوازی غاندی کە لە گوتاری ناتوندوتیژیدا ڕەواجی پێ دەدرێت و بەرانبەر بە ئایەتەکانی جیهادی ناو پەرتووکەکەی خودا قاڵ و ڕەخنەی پێ تاودەدرێت. ئەسڵەن لە ڕووی زانستییەوە وێنایەکی ورد نییە، بەڵکوو لێبڕاو و دەستکاریکراوە کە خودی غاندی لە دەستگرتن بە بیرۆکەی ئاشتی ڕەهاوە بە لەرز و گومان کەوتووە کە سەرجەم دروشمەکانی لەو ساتەدا بەهەڵمبوون کە بەریتانیای ئیستیعماری لەپێناو دەستەمۆکردنی بوەیرییەکان بۆ زەبری داگیرکاری خۆی شەڕی دژیان

دەست پێکرد (١٨٨٩ز)، غاندی لەوە ترسا کە ئەگەر بەشداریکردن لەگەڵ بەریتانییەکان لە جەنگی بوەیرییەکاندارەت بکاتەوە ئەوکات کەیسی خۆی لە هیندستان زیانی پێ بکەوێت! جا تووشی «توندوتیژی» هات لەپێناو بەرژەوەندیی نەتەوەیی خۆی! بەڵکوو هیندییەکانی پەمپدابوو بۆ پشتیوانیکردن لە توندوتیژی ئیستیعماری بەریتانیا، لە هەموو ئەوە سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە ئەسڵەن بڕوای بە دادپەروەری کەیسی بوەیرییەکانیش هەبوو، کەچی بەشداریکردنی لە توندوتیژیی چەکداری لەدژیان پەسەن دکرد لەپێناو بەرژەوەندیی نەتەوەکەیدا، غاندی بە هەندێک شەرمەوە ئەم هەڵوێستەی خۆی باس لێدەکات کە لە ژیاننامەکەیدا دەڵێت:

«کاتێک جەنگ ڕاگەیەنرا، تەواوی هاوسۆزی دڵم بۆ بوەیرییەکان بوو ...، دۆستایەتی و ئینتیمام بۆ دەسەڵاتی بەریتانی وای لێ کردم کە لەگەڵ بەریتانییەکاندا بەشداری ئەو جەنگە بکەم ...، ئەوکاتیش من باوەڕم وابوو کە هیندستان لەسایەی ئیمپڕاتۆرییەتی بەریتانیدا نەبێت، ئازادی تەواوی خۆی بەدیناهێنێت، لەوێشەوە ...، بەمشێوەیە زۆرترین ژمارەی کە توانیم لە هاوڕێکانم کۆمکردنەوە ...، لەڕاستیشدا ئەو پەیوەندییانەی کە لەنێوان ئێمە و سپیپێستەکاندا دروستبوو، لە سەروەختی ئەو جەنگەدا، لە جوانترین پەیوەندییەکان بوو کە تێکەڵاوی و مامەڵەمان لەگەڵ هەزاران سەربازی بەریتانی لە نێواندا سازا، زۆرڕووخۆش بوون لەگەڵمان، سوپاسیان دەکردین کە لەوێ بووین بۆ خزمەتکردنیان."[١]

باشە، با لێرەدا ئەم پێدراوانە تۆماربکەین: غاندی باوەڕی بە دادپەروەری کەیسی بوەیرییەکان هەبوو، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆی پشتیوانی جەنگی داگیرکاری چەکدارییانەی بەریتانی کرد لە دژی بوەیرییەکان،

---

(١) غاندي، "قصة تجاربي مع الحقيقة"، ترجمة: منير البعلبكي، دار العلم للملايين، الطبعة السادسة، (١٩٨١م): (٢٥٣-٢٥١).

هیندییەکانیشی کۆکردەوە بۆ پشتیوانیکردن لە توندوتیژیی ئیستیعماری بەریتانی، خەریکە یادەوەرییە جوانەکانی خۆشیمان بۆ دەگێڕێتەوە لەگەڵ سەربازانی بەریتانی لە میانەی جەنگە چەکدارییە توندوتیژەکەیاندا.

لەو بەڵگانەشی کە غاندی تێیدا بنچینەسازی بۆ ئەو ڕووبەرە کردووە کە توندوتیژی تێدا دروستە، ئەو بەراوردەیەتی کە دەڵێت: "من باوەڕم وایە کە ئەگەر بە کرداری کەوتینە نێوان دوو هەڵبژاردەی دەستەمۆیی داهێزراوی یان توندوتیژییەوە، ئەوکات من ڕام لەسەر توندوتیژییە." (١)

هەروەها غاندی بەرەبەرە نەرمی دەنواند بۆ بەرگری لەخۆکردن بە «چەک» وەختێک ململانێی ئیسلامی-هیندۆسی تەقییەوە، کە غاندی دەڵێت:

"پێشووتر خەڵک گوێیان بۆ دەگرتم وەختێک فێرم دەکردن چۆن بەبێ چەک ڕووبەڕووی بەریتانییە چەکدارەکان ببنەوە، بەڵام لەم ڕۆژانەدا بیستوومە کە بیرۆکەی من سەبارەت بە ناتوندوتیژی دەکرێت لە بەرانبەر ئەم شێتییە کۆمەڵایەتییەدا سوودی نەبێت. هەربۆیە؛ پێویستە خەڵک چەک هەڵبگرن بۆ بەرگریکردن لە خۆیان." (٢)

دیسان خودی غاندی دەربڕینێکی نیقاشی هاویشتووە کە توێژەران هەرچی کووچەیە بۆ لێکدانەوەی گرتوویانەتەبەر، کە دەڵێت: "ئەگەر بۆمبێکی ئەتۆمیمان هەبووایە، لەدژی ئینگلیز بەکارماندێنا." (٣)

دیسان سەیروسەمەرەیە کە غاندی دیدارێکی ئاشکرای لەگەڵ مۆسۆلینی هەبووە، هەروا نامەگۆڕینەوە و پێسەرسامبوونی خۆشی بۆ دەربڕیوە.

---

(1) Atack, Nonviolence in political Theory, Edinburgh University Press, p. 161.

(2) Pyarelal, Mahatma Gandhi: The last Phase, Navajivan Publishing House, 1956, Vol. II, p. 326.

(3) Ibid.

گشت ئەم هەڵوێستانە و هاوشێوەکانیشیان هەوادارانی غاندی دواتر هەوڵیانداوە بەهانەی بۆ بێننەوە و بە لاڕێیدا بەرن بۆ بەتاڵکردنەوەی لە واتای خۆی کە پەسەندکردنی هەر شێوەیەک لە شێوەکانی توندوتیژییە، کە ئەمانەش ئەو بەڵگانەن کە ڕەخنەگران لە غاندی نمایشی دەکەن بۆڕەتکردنەوەی بەسیمبولکردنی غاندی وەک نموونەیەک بۆ ئاشتی ڕەها.

چونکە دەوڵەتانی ڕۆژئاواییش جۆرە دەوڵەتانێکن کە ئەسڵەن ئاشتی ڕەها تێناگەن، بەڵکوو دەوڵەتانێکی هەتا سەرئێسقان لە توندوتیژیا نغرۆبوون و پێشبڕکێیانە لە بەدەستهێنانی مەترسیدارترین و لەناوبەرترین چەک و فەراهەمکردنی بۆ سوپا زەبەلاحەکانیان. ئیدی لە جەنگە جیهانییەکاندا بێت لەنێوان خودی ڕۆژئاواییەکان خۆیاندا، یاخود لە جەنگە ئیستیعماری-داگیرکارییەکانی نێوان ڕۆژئاواییەکان و ڕۆژهەڵاتی موسڵماندا بێت، هەربۆیەش؛ ڕۆژنامەگەری ڕۆژئاوایی وەختێک غاندی هەندێک گوتاری سەبارەت بە ناتوندوتیژی لە ئەورووپا پێشکەشکرد کردیانە مایەی گاڵتەجاڕی و نوکتەبارانیان کرد، بەتایبەت کاتێک ئامۆژگاری بەریتانییەکانی کرد کە ناتوندوتیژانە ڕووبەڕووی داگیرکاری نازی ببنەوە، ئیدی گوتاری ڕەخنەگری بەریتانی پێیدا تەقییەوە و وتەکانیان بە تیژترین و ناچیزەترین دەربڕینێک تاریف لێ دا، تەنانەت غاندی خۆشی بێزاری دەربڕی و گوتی کە ڕۆژنامەگەری ڕۆژئاوایی قسەکانیان بەلاڕێدا بردووم! لەوانەشی کە چەند نموونەیەکی خۆشی گواستووەتەوە لە گاڵتەکردنی ڕۆژنامەگەری ڕۆژئاوایی بە گوتارەکەی غاندی مامۆستای فەڕەنسی فەلسەفە «جان مۆلەر»[1] بوو کە پسپۆڕی ناتوندوتیژی و گرینگیدەرە بە کەسایەتی غاندی.

لە کەلێنە تاریکەکانی کەسایەتی غاندیش، هەڵوێستی پشتگیریکردنیەتی لە سیستمی چینایەتی (Caste system)، تەنانەت هەندێک لە توێژەران

---

(١) جان - ماري مولر، "غاندي المتمرد: ملحمة مسيرة الملح"، ترجمة: محمد عبد الجليل دار معابر، (٢٠١١م).

وتوویانە:

"بۆچی غاندی پشتگیری لە سیستمی چینایەتی کردووە سەرەڕای پێکهاتە دابەشکارییەکەی؟ ئەمبێدکار ئەوە دەخاتە سەر ئەژمارە تەنگەبەرە سیاسییەکانی غاندییەوە."[١]

هەندێکیش لە چەپەکان هەڵوێستی غاندی لە پشتیوانیکردنی توندوتیژی بەریتانی دژ بە بوەیرەکان و هەڵوێستی غاندی لە پشتگیریکردن لە سیستمی چینایەتی، هەموو ئەوە دەگەڕێننەوە بۆ پاڵپشتیکردنی ماددیی غاندی لەلایەن چینی بورژووازی هیندۆسییەوە و ئاوای لێک دەدەنەوە کە سەرچاوەی ماددی ئەوان بوون، هەربۆیە دەسەڵاتیان بەسەر بازنەی بڕاردە سیاسییەکانیدا هەبوو، بەهەرحاڵ ئەم لێکدانەوەیەش کە هەیە، پەیوەندی بە ئێمەوە نییە، ئەوەی مەبەستمانە خودی ڕووداوەکانە کە واقیعین.

یەک لە هەڵوێستە مێشکپووچانەکانی غاندیش ئەوە بوو کە بنیاد لەسەر بیروباوەڕە ڕووەکییە خورافییەکانی لە نەخواردنی گۆشتدا؛ خەریک بوو ژنەکەی لەناوبەرێت وەختێک ڕێگری لە پزیشکەکە کرد کە هیچ بەرهەمێکی گۆشتی بۆ ژنە نەخۆشەکەی غاندی بەکاربێت کە غاندی خۆی دەڵێت:

"لەگەڵ ئەو پزیشکەدا لەسەر ئەم هەواڵە کە پێی دام بە هێمنی کۆبوومەوە کە وتبووی: هەندێک ئاوگۆشتی مانگام بە غاندی خاتوونی خێزانت داوە کاتێک بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ دەکردی. منیش گوتم: نا، جەنابی پزیشک، من ئەمە بە ناپاکی دەزانم ..."

لەپاشان غاندی بە پزیشکەکە دەڵێت: "من ڕێگا بە خێزانم نادەم کە گۆشتی پێدرێت، یاخود گۆشتی مانگا، تەنانەت ئەگەر ئەم ڕێلێگرییەش بە واتای مردنی

---

(1) Chakrabarty, Social and Political Thought of Mahatma Gandhi, Routledge, 2006, p. 110.

ئەو بێت، مەگەر خۆی ئەوەی بوێت."

ژنەکەی غاندیش توانای قسەکردنی نەمابوو، لەگەڵ ئەوەشدا غاندی چوو ڕاوێژی بەم خێزانە نەخۆشەی کرد، ئەویش قایلبوو بە بۆچوونی غاندی کە گۆشت نەخوات، جا پزیشکەکە بە غاندی گوت:

"چەند پیاوێکی دڵڕەقی تۆ! دەبوو شەرم بکەیت لەوەی کە ئەم باسەی لەگەڵدا بکەیتەوە کە ئەو لەم حاڵەتە سەختەیدا بوو."[1]

لەڕاستیشدا: توێژینەوە و نووسراوە تازەکان زۆر ڕوخساری دیکەی غاندییان بەدەرخستووە کە زۆرێک لە بانگخوازانی مەدەنییەتی مادیی پێیان نەزانیوە، بەو پێیەی کە تەنها پشتیان بە پەرتووکە نازناوی و بەشان و پیاهەڵدانە ڕووکارییەکان بەستووە.

مەبەستیش ئەوەیە ئەو بیرۆکەیەی کە تیۆریانە دراوەتەپاڵ غاندی سەبارەت بە «ناتوندوتیژی» بیرۆکەیەکی خەیاڵپڵاوانەیە کە هیچ دەوڵەتێک ئەمڕۆ نە لە ڕۆژهەڵات و نە لە ڕۆژئاوا کاری پێ ناکات کە هەرچی دەوڵەتە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکان هەن پێشبڕکێی سوپا و چەکیانە، هەروەکوو غاندی خۆشی وازی لە ناتوندوتیژی هێنا لەو کاتانەدا کە بەرژەوەندیی خۆی لە گرتنەبەری ڕێگای توندوتیژیدا بینییەوە.

زۆر بە کورتی ئەمە بەشێکە لە وێنە تاریکە شاراوەکەی غاندی کە لە ڕووی ئایەتەکانی جیهادی ناو پەرتووکەکەی پەروەردگاردا بەرزدەکرێتەوە!

هیوام وایە کە لەم جێگایانەدا هۆشیاریدانمان سەبارەت بەوە لەیادنەچێت کە ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکار بە کوشتاری خەستوخۆڵ و شپرزە و دەربەدەرکردنی

---

(١) غاندي، "قصة تجاربي مع الحقيقة"، ترجمة: منير البعلبكي، دار العلم للملايين، الطبعة السادسة، (١٩٨١م): (٣٧٤-٣٧٥).

و ئەوانە مانای پێشێلکردنی ڕێسا ڕەوشتییەکانی جیهادی شەرعی نین، وەک بەئامانجگرتنی وڵاتانی ئیسلامی، یاخود دەستدرێژیکردنە سەر فەڕیزەی خودا لە پاراستنی موعاهەد-پەیمانپێدراوان و موستەئمەن-ئاسایشدراوان و ئەوانەشی کە نیمچە ئاسایشێکیان پێدراوە- شبهة أمان، ئەمە لادانە لە جیهادی شەرعی شەرەفمەندانە کە تاقێکیش لە فەقیهە دێرینی یاخود هاوچەرخەکان ڕاجیا نەبوون تێیدا سوپاس بۆ خوا، ڕێنومایيکراویش ئەو کەسەیە کە دەست بە سەرجەم قورئانەوە بگرێت و بەش بەشی نەکات، جا کار بە حوکمی کوشتار و دەربەدەرکردن و ڕاوەدوونان بکات و مافی خوێنپارێزراوانیش لە موسڵمانان و پەیمانپێدراوان و ئاسایشدراوان و چمکە ئاسایشدراوانیش بپارێزێت، چونکە خۆپارێزی لە خوێنەکاندا نیشانەی ڕاستاڵی و ئاییندارییە.

بگرە چەند نزیکە بوترێت -زانستی تەواویش لەلای خودایە- کە ئارەزووبازانی ئەمڕۆ ڕێگەیان نەبوو دەمدرێژی بەرانبەر بە بانگەواز بکەن مەگەر دوابەدوای شوومی سەرپێچیکردنی فەرمانی خودا لە پێشێلکردنی ڕەوشتبەرزییەکانی جیهادی شەرعیدا، جا لەپاش ئەوەی کە هاوەڵانی بانگخوازی لە هێز و پێگەی خۆیاندا بوون و گومانێکیش توخنیان نەدەکەوت، ئێستا بوونەتە جێی شکلێکردن و چاودێری و زۆرێکیش لە هاوەڵانی ناڕەوایی و خراپەکاران بوێری تانەلێدان و ناشرینکردنیان هەیە، وێنەی ئەوەش زۆرڕوودەدات کە بەهۆی تاوانێکی تاکەکەسی ئێرە و ئەوێوە تاقیکردنەوە و ئاشووبی گەورە باڵ بەسەر تەواوی خەڵکی چاک و پاکیشدا دەکێشێت، جا بۆیە کاتێک تیرهاوێژان فەرمانی خوایان لە جیهاددا شکاند پەروەردگار بێباوەڕانی بەسەردا زاڵ کردن کە گورزی سەختیان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گەورە هاوەڵانیشی وەشاند کە دانی پیرۆزی پێشەوەی شکێنرا و برینێکی سەختیش لە ڕوخساری درا، دوو ئەڵقەی کڵاوە ئاسنینەکەشی چووە ناو کوڵمییەوە، هەروەک پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَعَصَيتُم مِن بَعدِ ما أَراكُم ما تُحِبّونَ مِنكُم﴾ [آل عمران: ١٥٢] «سەرپێچیتان

کرد کاتێک ئەوەی نیشاندان کە حەزتان لێیەتی.»

لە ڕووداوی حونەینیشدا کاتێک تاوانی بەخۆسەرسامبوون دزەی کردە ناو دڵی هەندێک لە تاکەکانەوە، موسڵمانانی پێگەبەرز و خوار وانیش تاقیکرانەوە و زەوییان بەو فراوانییەی خۆی لێ تەنگبوویەوە، هەروەک دەفەرموویێت: ﴿وَيَومَ حُنَيۡنٍ إِذ أَعجَبَتكُم كَثرَتُكُم فَلَم تُغنِ عَنكُم شَيـًٔا وَضاقَت عَلَيكُمُ الأَرضُ بِما رَحُبَت﴾ [التوبە: ٢٥] «ڕۆژی حونەینیش کاتێک زۆری ژمارەتان سەرسامی کردن و فریویدان کەچی سوودی پێ نەگەیاندن و زەویتان بەو فراوانییەی خۆی لێ تەنگبوویەوە.»

سا ئەم کردە لادەرانە کە ئاسایشی وڵاتانی ئیسلامی کردە ئامانج و ڕێساکانی شەریعەتی لە پاراستنی خوێندا بەکەم گرت، بووە هۆکاری شێواندنی جیهادی پابەند بە ڕەوشتەکانی جیهادی شەرعی و بەها بەرزەکانییەوە، هەتا وای لێ هات کەسێک نەبینی ناوی جیهادی لە دەم بێتەدەرەوە لە ترسی ئەوەی بە تۆمەتی تیرۆر پەلکێشی ژوورە تاریکەکانی بکەن، بوێری بە زۆرێک خەڵکی نەفام و بێپێگەش دا کە گاڵتە بە هەندێک لە ناوەڕۆکەکانی وەحی بکەن کە هەرگیز پێشتر بوێری ئەوەیان نەبوو، ئیدی ئەو کردانە لەوە زیاتر شووم و زەرەر چی بێنن؟!

جا ئەمە ڕێسایەکی گەردوونی لێکەوتەوە و شوێنەوارەکانی تاوان و سەرپێچییەکانە لەسەر بانگەوازەکان کە عەقڵی ماددی پەی پێ نابات مەگەر دڵێک پڕبووبێت لە دڵنیایی و یەقین و یەکلایی بە دواهاتە پەنهانییەکان، داوا لە خوای باڵادەستی بەخشندە دەکەین کە بە لێخۆشبوونی فراوانی خۆی لە هەموومان خۆش بێت و بەوەی نەزانەکانمان دەیکەن، نەمانبات.

# ١٠- بیرۆکەی کوفری سیاسی

هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی لە میانەی هەوڵیاندا بۆ لادانی شێوازی پەیوەندی ئایینی بە شارستانییەتیەوە دەڵێن: ناکرێت ئێمە لەگەڵ ڕۆژئاوادا بە هەمان ئامڕاز و شێوازی ئایینی کە وەحی لەخۆی گرتووە بەرانبەر بە بێباوەڕان مامەڵە بکەین، چونکە واقیعی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ لە بنەڕەتەوە جیاوازە لە بێباوەڕانی پێش ئەم چەرخە، کە بێباوەڕانی چەرخانی ڕابردوو بەرهەڵستی پەیامبەریەتییەکان و بانگەوازەکانیان بە کۆمەڵێک پاڵنەری پەتی ئایینییەوە دەکرد، بەڵام دامەزراوەی سیاسی ڕۆژئاوایی لەم چەرخەدا بە پاڵنەری بەرژەوەندخوازانە دەجووڵێتەوە و پلان دادەنێت نەک پاڵنەری پەتی ئایینی، جا بە پاڵنەری ئیمپریالی فراوانخوازی هەژموونییەوە چاودێری بزاوتی ئیسلامی دەکات نەک پاڵنەری بیروباوەڕی، بە واتایەکی دیکە ئەوە کوفرێکی سیاسییە، نەک کوفرێکی بیروباوەڕی.

هەربۆیە؛ هەرکات ببینن کەسێک بە زمانێکی ئایینی بیروباوەڕیانەوە لە کۆمەڵکوژییەکانی ڕۆژئاوا دەدوێت، دەڵێن: ئەمانە ململانێی سیاسین، ئایینی تێکەڵ مەکەن.

بەوەش وادەزانن کە ئەم وێنایە لادانی خوێندنەوەی ئایینی و مامەڵەی ئایینی لەگەڵ کۆمەڵگای ڕۆژئاواییدا لەسەر بنیاددەنرێت، وە ئێمە دەبێت پاڵنەری بەرژەوەندخواز بە پاڵنەری بەرژەوەندخوازی وێنەی خۆی وەڵام بدەینەوە، نەک بە هەڵوێستی ئایینی یاخود بیروباوەڕی ڕووبەڕووی پاڵنەری بەرژەوەندیانە ببینەوە.

لە واقیعیشدا: سەرچاوەی گرفت و کەلێنی ئەم تێزە لەوێدا نییە کە چۆن وێنای پاڵنەرەکانی دامەزراوەی سیاسی هاوچەرخی ڕۆژئاوایی کردووە، بەڵکوو لەو دواهاتانەیدایە کە وایان وەهم کردووە لەسەر ئەم وێنایە بنیادبنرێت! هەروەها لە «حەقیقەتی کوفر» تێنەگەیشتوون لە ئیسلامدا، بگرە زۆرێکیان وادەزانێت کە خەریکە وتوویژ لەسەر بابەتێکی ناو بازاڕی گشتیی هزرەکان دەکات، پێی نەزانیوە کە بەبێ ئەوەی هەست بکات چووەتە دووکانی ئیرجائەوە.

جا دامەزراوەی سیاسی ڕۆژئاوایی دامەزراوەیەکی کۆلۆنیالی/داگیرکارییە هیچ گومانێک لەوەدا نییە، بەڵام ئایا کەسێک کە بەرهەڵستی ئایین بکات لەبەرئەوەی کە هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانی ئەو دەکات ئیتر نابێت ئێمە هەڵوێستی ئایینی لە هەمبەر وەربگرین؟

ئەم وێنا شێواوە هەر لە بنەڕەتەوە لە نەزانین بە واتاکانی قورئان سەبارەت بە پاڵنەرەکانی بێباوەڕان سەرچاوەی گرتووە کە زۆرینەی ئەو بێباوەڕانەی پەروەردگار باسی لێ فەرموون و هەواڵیانی بۆ گێڕاوینەتەوە و خەباتکردن دژیانی لەسەرمان تەشریع کردووە و ڕەشی چارەنووسیانی بۆ دەرخستووین؛ ئەسڵەن بە بیروباوەڕی ئایینی پەتی پاڵنراو نەبوون، بەڵکوو بەرهەڵستی پەیامبەریەتییەکان و بانگەوازەکان و شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانیان دەکرد؛ چونکە ئەوەیان لە ئایینەکەدا دەبینی کە هەڕەشە لە بەرژەوەندییە دونیاییەکانی ئەوان دەکات، وەک بەرژەوەندی هەژموون و سەرکردایەتی، یاخود هەڕەشەبوون لەسەر سەرچاوەکانی سامانداری، یاخود دەمارگیری بۆ باووباپیران، یاخود ئیرەیی ڕەگەزپەرستیانە، یاخود جگە لەوانە.

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا قورئان هەڵوێستی ئایینی لە هەمبەریان وەرگرتووە سەرەڕای ئەوەی ئەوان لە بێباوەڕیاندا پاڵنراوی پاڵنەری بەرژەوەندی ماددی بوون، بگرە هەر خودی ئەمەیە کرۆکی تاقیکردنەوەی ئایینی نێوان کوفر و

ئیمان، کە دەستهەڵگرتنە لە ئارەزووەکانی دونیا و بەرژەوەندییەکانی لەپێناو ئاییندا!

هەروەها تەماشای ڕەمزەکانی بێباوەڕان بکە لە قورئانی پیرۆزدا ئەمە زۆر بەڕوونی دەبینی، بڕوانە فیرعەون و قارووون و هاوەڵانی کیتاب و ئەبوو جەهل و جگە لەوانیش پاڵنەریان بۆ بێباوەڕی تەنها پاڵنەری ماددی بوون، نەک پاڵنەری بیروباوەڕی پەتی.

تەنانەت لەو بابەتانەی کە لەو کەشە کاریگەرانە بە عەلمانییەت دەورووژێنرێت ئەوەیە کە دەپرسن: ئایا جەنگانی ڕۆژئاواییەکان لە وڵاتانی موسڵماندا و وێرانکارییان تێیدا جەنگانێکی ئایینییە؟ یاخود جەنگێکی سیاسی/ئابووری؟

بنەمای ئەم پرسیارەش تێگەیشتنی هەڵەیانە لە «حەقیقەتی بێباوەڕی» لە شەریعەتدا، کە وادەزانن بێباوەڕی تەنها بریتییە لە بەدرۆخستنەوە و بڕواپێنەهێنانی بیروباوەڕی و بەس، ئیدی جەنگان دژ بە ئیسلام لەبەر پاڵنەری بەرژەوەندخوازی ئەمە خۆ ئایین نییە، بەڵکوو سیاسەت و ئابووری و بەرژەوەندی و ئەوانەیە، ئەمەش خودی بیدعەی ئیرجائە، هۆکارەکەشی وردنەبوونەوەیە لە چیرۆکەکانی بێباوەڕان لە قورئاندا، پێشەوا ئیبن تەیمییە ئەوەی پوختکردووەتەوە کە لە وەڵامدانەوەیدا بۆ بیدعەی ئیرجاء لە پەرتووکی (الإيمان)دا دەفەرمووێت:

"بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەی کە پێغەمبەرانیان بەدرۆخستووەتەوە زانیویانە کە حەق بەوانە و ئەوان ڕاستگۆن، بەڵام یان بەهۆی ئیرەییانەوە، یان لەبەر ویستنی بەرزوبڵندی و دەسەڵات و سەرگەورەیی، یاخود خۆشویستنیان بۆ ئەو ئایینەی کە پێشتر لەسەری بوون و ئەوەی کە دەستیان دەکەوت لە مەرامی وێنەی پارە و سامان و سەرکردایەتی و هاوپەیمانییەتی و هاوەڵییەتی خەڵکانێک و جگە لەمانەش؛ لە شوێنکەوتنی پێغەمبەراندا وازهێنانیان لە هەوا و ویستە خۆشویستراوەکانی خۆیان بەدی دەکرد، یاخود ڕوودانی ئەوەی کە

پێیان ناخۆشە و بەدڵیان نییە؛ بۆیە بەدرۆیان دەخستنەوە و دوژمنایەتییان دەکردن، ئیدی لە دواییدا دەبوونە بێباوەڕترینی خەڵک، لەوێنەی ئیبلیس و فیرعەون، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیانزانی لەسەر ناحەقن و پێغەمبەرانیان لەسەر حەقن. هەربۆیە بێباوەڕان بەڵگەیەکی ڕاست و دروستیان نەدەهێنایەوە کە تانە بێت بەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەرانەوە، بەڵکوو پشتیان بەوە دەبەست کە ئەوە دژ و پێچەوانەی حەز و سەلیقەیانە وەک ئەوەی بە نووحیان گوت: ﴿قالوا أَنُؤمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الأَرذَلونَ﴾ [الشعراء: ١١١] «گوتیان ئەرێ ئێمە باوەڕت پێ بێنین کە تۆ لات و هەژار و بێئەرزشان شوێنت کەوتوون؟» زانراویشە کە شوێنکەوتنی هەژار و پلەنزمان بۆی نابێتە بەڵگەی تانەدان لە ڕاستگۆیی ئەو، بەڵام پێیان ناخۆش بوو بەشداری ئەوان بکەن و تێکەڵیان بن، هەروەک موشریکانیش لە پێغەمبەریان (ﷺ) داواکرد کە لاوازەکان بگەڕێنێتەوە و ڕەتبکاتەوە پەروەردگاریش ئەو فەرمایشتەی دابەزاند: ﴿وَلا تَطرُدِ الَّذينَ يَدعونَ رَبَّهُم بِالغَداةِ وَالعَشِيِّ يُريدونَ وَجهَهُ﴾ [الأنعام: ٥٢] «ئەوانە مەڕەتێنە و وەدەرمەنێ کە بەیانان و ئێواران خەریکی پەرستشی پەروەردگاریانن و هەر ئەویان نیاز و مەبەستە.» هەروەها وێنەی قسەکەی فیرعەون: ﴿فَقالوا أَنُؤمِنُ لِبَشَرَينِ مِثلِنا وَقَومُهُما لَنا عابِدونَ﴾ [المؤمنون: ٤٧] «ئەرێ ئێمە باوەڕ بە دوو مرۆڤی وەک خۆمان بێنین کە گەلەکەشیان کۆیلە و فەرمانبەرداری ئێمەن؟»، هەروەها وێنەی قسەی موشریکانی عەرەب: ﴿وَقالوا إِن نَتَّبِعِ الهُدى مَعَكَ نُتَخَطَّف مِن أَرضِنا﴾[القصص: ٥٧] «خۆ ئەگەر ئێمە شوێن ئەو ڕێنومایی و حەقە بکەوین کە بە تۆیە، لەم زەوییەی خۆمان بەفەتار دەدرێین.» (اللّٰە)یش دەفەرمووێت: ﴿مِن أَرضِنا أَوَلَم نُمَكِّن لَهُم حَرَمًا آمِنًا يُجبى إِلَيهِ ثَمَراتُ كُلِّ شَيءٍ رِزقًا مِن لَدُنّا﴾ [القصص: ٥٧] «مەگەر ئێمە جێگیر و ئارام و بەدەسەڵاتمان نەکردوون لە زەوییەکی حەرەم و حەرامی هێمن و بەئاسایشدا، کە لە هەرچی بەروبوومە بە ڕۆزی ئێمە بۆیان دەبرێت و پێیان دەگات؟» پاشکۆی هەمان ئایەت، هەروەها وێنەی قسەکەی

گەلی شوعەیب کە بە شوعەیبیان گوت: «ئەرێ نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکات کە ئێمە دەست لەوە هەڵبگرین کە باوانمان پەرستوویانە یاخود لە ماڵ و سامانی خۆماندا چۆن و چیمان دەوێت وابکەین؟» هەروەها وێنەی قسەی گشتی هاوەڵدانەران: ﴿بَل قالوا إِنّا وَجَدنا آباءَنا عَلى أُمَّةٍ وَإِنّا عَلى آثارِهِم مُهتَدونَ﴾ [الزخرف: ٢٢] «بەڵکوو گوتیان ئێمە باوانمان لەسەر ئایین و ڕێبازێک دیوەتەوە و ئێمەش هەر لەسەر جێپێ و شوێنەواری وان ڕێنومایی وەردەگرین و دەچین.» ئەم شتانە و وێنەی ئەمانەش هیچیان نابنە بەڵگە بۆ تانەدان لە ڕاستی و ڕاستگۆیی پێغەمبەران، بەڵکوو تەنها ڕوونکردنەوە دانە بەوەی کە پێچەوانەی ویست و هەوا و دابونەریتی ئەوانە؛ هەربۆیەش؛ شوێنیان نەکەوتن، سەرجەم ئەوانەش کافر و بێباوەڕن.»[١]

جا ئەم نموونە قورئانیانە لە سەرانی بێباوەڕان لە قورئاندا، کە ئەبولعەبباس ئیبن تەیمییە هەندێکیانی نمایشکرد، ئەوە بۆ توێژەری بابەتی بەدەردەخات کە نزیکە بوترێت هیچ بێباوەڕێک نییە کە لەبەر بیروباوەڕێکی پوخت و پەتی و بەس دەست بۆ بێباوەڕی بەرێت، بگرە نزیکە بێباوەڕێک نەبینیتەوە کە پاڵنراوی ئارەزوو سوود و بەرژەوەندی سیاسی یاخود ئابووری یاخود جگە لەوانە نەبێت، هەروەکو قورئان حاڵ و پاڵنەرەکانیانی وێناکردووە، جا لە تاقە ئایەتێکدا کە زۆرینەی حاڵەتەکانی بێباوەڕانی لەخۆگرتووە قورئان پاڵنەرە دونیاییەکانی بێباوەڕان دەخاتەڕوو کە دەفەرمووێت: ﴿ذلِكَ بِأَنَّهُمُ استَحَبُّوا الحَياةَ الدُّنيا عَلَى الآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لا يَهدِي القَومَ الكافِرينَ﴾ [النحل: ١٠٧] «ئەوەش لەبەر ئەوەی کە ئەوان ژیانی دونیایان پێخۆشتر بوو و هەڵبژارد بەسەر دواڕۆژدا و لەبەر ئەوەی کە (اللّٰه) خەڵکانی بێباوەڕ ڕێنومایی ناکات.»

جا ئەم ئایەتە مەزنە ئەوە بەدەردەخات کە ئەسڵەن پاڵنەری بێباوەڕان

---

(١) ابن تيمية، "الإيمان"، تحقيق: الألباني، مكتبة أنس بن مالك، (١٤٠٠هـ)، (ص ١٨٠).

دونیاییە، مەرجیش نییە کە بیروباوەڕی پەتی بێت، جا لەم ئایەتە وردبەوە کە چۆن قورئان بەرژەوەندییە دونیاییەکان بە هۆکاری بێباوەڕییان دادەنێت، بەراووردیشی بکە بەم هاوچەرخانە کە جەنگی بێباوەڕان دژ بە ئیسلام لەپێناو بەرژەوەندیی دونیایی بە شتێکی بەدەر لە پۆلێنی ئایینی دادەنێن!

بنیاد لەسەر ئەم وەهمەش؛ تێبینی ئەوە دەدرێت کە بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی کەسێک کە بە مەبەست بێباوەڕی نەکات و نەیەوێت ببێت بە بێباوەڕ؛ بە بێباوەڕی دانانێن! جیاوازی ناکەن لە نێوان «بەمەبەست کردنی کارەکە» کە لە داخوازییەکانی چەسپانی تەکلیف-ڕاسپێرییە، «بەمەبەست کردنی کوفر-بێباوەڕییەکە» کە ئەسڵەن ئەمەیان دەگمەنە و پێچەوانەی واقیعی بێباوەڕانە لە قورئاندا، هەربۆیە ئیبن تەیمییە لە یەک لە لێکدانەوە چاوگ و نازدارەکانیدا دەفەرمووێت:

"بەگشتیش: هەرکەس شتێکی گوت یان کرد کە کوفر بوو، ئەوا بەوە کافر دەبێت، ئەگەر مەبەستیشی نەبێت کە ببێت بە کافر، چونکە هیچ کەس بە مەبەست کوفر ناکات مەگەر چۆنها و خودا خۆی بیهەوێت.» [١]

مەبەستیش ئەوەیە کە ئەو تێزەی دەڵێت: «جەنگی ڕۆژئاواییەکان دژ بە ئیسلام جەنگانێکی ئایینی نییە، بەڵکوو سیاسی و ئابوورییە» لە وێنایەکی هەڵەوە سەرچاوەی گرتووە ئەویش ئەوەیە کە بێباوەڕی بیروباوەڕێکی پوخت و پەتییە کە پاڵنەری سیاسی و ئابووری و ئەوانەی لەپشتەوە نەبێت، ئەمەش خودی بیدعەی ئیرجائە، لە هۆکارەکانی ئەم هەڵەیەش نەبوونی لێڕامانە لە چیرۆکەکانی بێباوەڕان لە قورئاندا، لە جێگا تایبەت و ناوازەکانی تۆمارکردنی پاڵنەرەکانی بێباوەڕان لە قورئاندا ئەوەیە کە ئیبن قەییم لە (مفتاح دار

---

(١) ابن تيمية، "الصارم المسلول"، تحقيق: الحلواني وزميله، رمادي للنشر، الطبعة الأولى، (١٤١٧هـ): (١/٣٣٩).

السعادة)دا هێناوێتی کە لەوانە دەفەرمووێت: ئیرەیی و لووتبەرزی، سەرداری و فەرمانڕەوایی، ئارەزوو پارە، خۆشویستنی خێزان و خزمان و خێڵ، خۆشویستنی لانە و نیشتیمان، خووگری و نەریت و شوێن و ژینگەی ژیان و پێگەیشتن، بۆ هەریەکێکیشیان چەندین بەڵگە و نموونە دەهێنێتەوە[١]، کە ڕامان و وردبوونەوە لە چیرۆکەکانی بێباوەڕان لە قورئاندا پاککەرەوەیە لە ئیرجاء.

---

(١) ابن القيم، "مفتاح دار السعادة"، طبعة المجتمع: (١/٢٦٥ - ٢٧١).

# ١١- هەژموونی ئاڵۆزی

زۆرێک لە لاوانی سەرسام بە تێزەکانی بانگخوازانی مەدەنییەتی ماددی کاتێک سەبارەت بە باوەڕە قووڵەکانی لەگەڵیدا دەچیتە وتوویژەوە، دەبینیت کە زیاتر شەیدای زمانی گوتار و ئاڵۆزییەکەیەتی هەتا حەقیقەت و بەڵگەکانی، هەژموونی ئاڵۆزی لەسەر توێژێکی خوێنەران لە ڕاستیدا دیاردەیەکی مەعریفی دێرینە کە نکۆڵی لێ ناکرێت.

هەربۆیە؛ دەبینیت هەندێک لە نووسەران لە نووسینیدا مەیلی بە لای زمانلوولکردن و قورسکارییەوەیە و خۆی لە گەیاندن و دەستبردنی سادە و ڕاستەوخۆ بۆ واتاکان لادەدات، چونکە وا هەست دەکات کە نمایشکردنی بیرۆکەکە لە قاڵبێکی ڕاستەوخۆدا ڕەونەقی دەبات، بەڵام هاوێشتنی لە ڕێگای پێچاوپێچەوە خوێنەر سەرسام دەکات و بە ئەنجامەکەی قایلی دەکات.

ئەم دەستەمۆبوون و ملنەوێتییە بۆ ئاڵۆزی لە چەند هۆکارێکەوە سەرچاوەی گرتووە، لەوانە ئەوەی کە هەندێک خوێنەرڕادەست بەو ئەنجامانە دەبن چونکە وادەزانن کە تێنەگەیشتن لێی بەهۆی ناوازەیی گوتارەکە و باڵابوونییەتی لە ئاست توانا و درکی ئەمان، یاخود هەندێکیان حەزی بەوەیە کە بە شتێک لە زۆرینەی خەڵک جیابکرێتەوە و دیاربێت. هەربۆیە؛ دەروونی بە گوتاری ئاڵۆز دەگەشێتەوە کە تاقانەیی کەسی بۆ دێنێتەدی.

پێشەوا ئیبن تەیمییە لە (درء التعارض)دا ئاماژەی بەم دیاردەیە کردووە کە دەفەرمووێت:

"بە هەمان شێوە ئەو بەڵگانەشی کە وردی و ئاڵۆزی و شاراوەییان تێدایە،

لەوانەیە بەکەڵکی کەسێک بێت کە دەروونی لەسەر تێفکران لە شتە وردەکان ڕاهاتووە، هەروەها کەسێک کە وەرگرتنی زانست لەو ڕێگە شاراوانەوە کە زۆرینەی خەڵک لێی تێناگەن زیاتر حەز پێدەکات هەتا وەرگرتنی لەو ڕێگە ڕوونانەوە کە جەماوەر بەشداری دەبن لەگەڵیدا، وێنەی ئەمەش هەیە لە خواردن و خواردنەوەکان و جلوبەرگ و نەریتەکاندا بەهۆی ئەو حەزی سەرداریتییەوە کە لە دەروونەکاندا هەیە، جا ئەم ڕێگا درێژە ئاڵۆزانە کە چەند دابەشکاری و لێکەوتەکاری و بردنی بەشییەکان بۆ ژێر گشتییەکانی تێدایە، لەوانەیە لەم ڕووەوە کۆمەڵێک لە توێژەران و وتووێژکاران کەڵکی لێ ببینن، هەرچەندە جگە لەوان لە هاوەڵانی فیترەتی پاک و پارێزراو و زەینی دروست پێویستیان پێی نەبێت، بگرە ئەگەر بۆی باس بکرێت لەوانەیە بەبیستن لێی وەڕەز بێت و بەدڵ لێی ڕابکات، ئامانج بە نزیکتر و ئاسانتر لەوە دەبینێت کە پێویستی بەوە بێت."[١]

جا هەندێک لە خوێنەران بە ئاڵۆزکاری ڕاهاتوون ئیدی لە شێوازی ڕاستەوخۆ زیاتر کارلێک لەگەڵ ئەودا دەکەن، هەندێکیش لە خوێنەران ئاڵۆزکاری لەبەرئەوە پێخۆشە کە گەشانەوەیەکی نێو دەروونی پێ دەبەخشێت، هەروەک پێشەوا ئیبن تەیمییە لە (الرد علی المنطقیین)دا دەفەرمووێت:

"هەندێک کەس هەن کە ئەگەر ئەوە بزانن کە زۆرینە و بە گشتی خەڵک دەیزانن، یاخود ئەوەی کە نازیرەکانیش دەتوانن بیزانن؛ ئیدی لە دڵی خۆیاندا وانازانن بە زانستێک لەوان جیا و تایبەتبوونەتەوە، جا حەزدەکەن کە شتە شاراوە و ورد و فرە پێشەکییەکان بزانن." [٢]

لەڕاستیشدا: بەرانبەر بە هەژمعوونی ئاڵۆزی و ئاڵۆزکاری تەنها خوێنەری

---

(١) ابن تيمية، "درء تعارض العقل والنقل"، تحقيق: محمد رشاد سالم: (٨/٨٦).

(٢) ابن تيمية، "الرد على المنطقيين"، تحقيق: الكتبي، مؤسسة الريان، (ص٢٩٩)

خاوەن کەسایەتی لاواز ملکەچ دەکات، بەڵام خوێنەری متمانە بەخۆبوو؛ پێی وایە کە ئاڵۆزی و ئاڵۆزکاری گرفت و کەلێنێکە لە نووسینەکەدا، نەک لاوازی بێت لە خوێنەردا، زۆر بەداخیشەوە کە هەژموونی ئاڵۆزی لە خاڵە زۆر کاریگەری توندەکانە بەسەر هەندێک لە خوێنەرانەوە، بەتایبەت ئەوانەی کە خۆیان لەوە دەپارێزن کە پێیان بوترێت تێناگەن، جا هاوڕایی نیشان دەدات و دەردەبڕێت لەترسی عەیبدارکردن و لێکەمبوونەوە، ئەوەش بەتایبەت لە دەستەواژە بەعەرەبیکراوەکاندا دەردەکەوێت، یاخود ئەو دەستەواژانەی بە دەربڕینی سەخت و نەگەیاندنی واتاکان دەگوازرێنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەچێتەسەر ئەو لە زلکردنەوەی ئەو کەسانەی نمایش و هاوردەی دەکەن.

لە حاڵەتێکی هاوشێوەدا پێشەوا ئیبن تەیمییە حاڵەتی دەروونی کەسانێک شیدەکاتەوە کە لە هەمبەر هەژموونی ئاڵۆزیدا دەشکێنەوە و ئەوەش چۆن ڕوودەدات کە دەفەرمووێت:

"بەڵام ئەمانە بەئەنقەست دەستیان بە وشەگەلێکی ناڕوونی لێکچووەوە گرتووە کە لە زمانی گەلاندا فرەواتایە، ئەوجا واتای وەهاشی دەبەنە ژێر کە لە زمانی گەلاندا ئەو واتایانەی لێ نافامرێتەوە، لەپاشان لەیەکیانداوە و پەیکەرکارییەکی دوورودرێژیان بۆ داڕشتتووە کە هەندێکی لەسەر هەندێکی وەستاوە و بنیادنراوە، قسەی خۆشیان گەورە و زلکردووەتەوە لە دڵی ئەوانەدا کە لێی تێنەگەیشتوون و تێناگەن، بێشک وردی و ئاڵۆزییەکیشی تێدایە بەهۆی وشە هاوبەش و واتا لێکچووەکانیەوە، جا وەختێک قوتابی لەگەڵیاندا چووە وتووێژەوە و شتانێکیان گوت کە فیترەتی ئەو ڕەتیبکاتەوە و ئەویش ڕەخنەیان لێ بگرێت، ئەوکات پێی دەڵێن تۆ لەم شتانە تێناگەیت، ئەمە بۆ تۆ نابێت، جا ئەو دەمارگیری و خۆپارێزییەی لە دەروونەکاندا هەیە وادەکات کە خۆیڕادەستی ئەو شتانە بکات بەر لەوەی لەلاشی بچەسپێت و ڕوونبێتەوە، هەروەها دەست لە ڕەخنەلێگرتنی هەڵبگرێت لەترسی ئەوەی کە ناژیری و بێ زانستی و دەبەنگی

بدەنەپاڵ.»[١]

ئەم تۆمار و دەستنیشانکارییەی ئیبن تەیمییە سەبارەت بەوەی کە فەیلەسووفەکان هەژموونی ئاڵۆزی لەسەر دەروونەکان بەکاردێنن بەشێوەیەک کە هانی دەستەمۆبوونیان بدات؛ لەوپەڕی مەترسیداریدایە لێرەدا و لەم بابەتەی ئێمەدا، جائەم دەقە تەیمییە وەدەرخستنێکی سەرسوڕهێنەری تەکنیکەکانی فەیلەسووفانە لە باڵپێکێشانی هەژموونی هزری خۆیان، وەکوو ڕۆژی نیوەڕۆش ئەم حاڵەتە دەروونییەمان دیوە. چەند لاوی شەیدای ڕۆشنبیری خوێندنەوەی ناو پەرتووکە فەلسەفییە بەعەرەبیکراوەکان هەبوون و و لووتیان تەقیوە بە لووتی دەستەواژەگەلێکی ئاڵۆسکاو و هەزار واتا و ئەگەریی یاخود خود پێناسەیی، واتە: نووسەر خۆی لەسکەی داوە بەر لەوەی لەپێشدا پێناسەی بکات، یاخود خڕخاڵ و بازنەی خواجەکانی[٢] پێدا هەڵواسیوە؛ جا شەرمی کردووە لەوەی کە لەم دەقە سەرسووڕێنانە تێناگات، ئیدی هاوڕایەتی لەسەر ئەنجام و لێکەوتەکانی دەربڕیوە، بەڵکوو شێوەی خۆشی دەگۆڕێت بە شێوە و ڕەفتاری خوێنەرانی ئەم پەرتووکانە، تاکوو نافامی نەدەنەپاڵی!

بگرە بڕوا دەکەیت کە هەندێک لەو لاوانە لەوانەیە باوەڕ بە زەندەقەش بێنێت تەنها بۆ خۆڕازاندنەوە و هاوشێوەچوون و هاوئاوازی لەگەڵ ئەم توێژەدا بەهۆی شکانەوەی لە هەمبەر گیڤەی نارِوونی و ناچیزەیی دەستەواژەیی و ناوی کەسایەتییە بێگانە ڕۆژئاواییەکانیاندا، ڕێک ئەمەیە کە ئەبوو حامیدی غەزالی باسی لێ دەکات، کە وەختێک ئەبوو حامید مامەڵەی دەکرد لەگەڵ

---

(١) ابن تیمیة، "درء تعارض العقل والنقل"، تحقیق: محمد رشاد سالم: (١/٢٩٥).

(٢) خواجە دەستەواژەیێکی یەک دوو سەدەی ڕابردووە بە کەسانی ناعەرەب و ناڕۆژهەڵاتی وتراوە وەک ڕۆژهەڵاتناسان کە هاتوونەتە ئەم ناوچانە کە عەرەب و ڕۆژهەڵاتی بە گەورەیان سەیرکردوون و پێیان سەرسام بوون.

توێژێکی چاخی خۆی لە سەرسامبووان بە فەلسەفە بەجۆرێک کە گەیاندبوونیە دژبەریکردنی شەریعەت، تێبینی ئەوەی کرد کە درکیان بە حەقیقەتی ئەو بیرۆکە فەلسەفییانە نەکردووە، بەڵکوو ئەوپەڕی ئەوە بوو کە سەرسامی ئەو ناوە زەرق و بەرقە فەلسەفییانە بووبوون، جا ئەو هزرانە هەڵدەگرن تاکوو شووناسێک لەوانەوە وەربگرن کە ئەبوو حامید دەفەرمووێت:

"چونکە من خەڵکانێکم دیوە کە خۆیان بە گرنگ و تایبەتتر زانیوە لە هاوتەمەنانی خۆیان، فرمانە پەرستشییەکانی ئیسلامیان ڕەتکردووەتەوە و دەست لێبەرداوە، سەرچاوەی ئەو کوفرەشیان ئەوەبووە کە چەند ناوێکی زلەیان بیستووە، لە چەشنی سوقڕات و بوقڕات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆتاڵیس، هەروەها درێژدووانی کۆمەڵانێک لە شوێنکەوتووانی ئەوانە لە تاریفدانی ژیری و بیرتیژی و زانستدروستییان، هەروا وتوویانە کە ئەوانە لەگەڵ سەنگینی عەقڵ و ئاوەزیشیان هێشتا باوەڕیان بە شەریعەتەکان نەبووە، جا کاتێک ئەمانیش ئەوەیان بیست، خۆیان بە باوەڕهێنان بە کوفر ڕازاندەوە، جا چ پلەیەک لە جیهانەکەی خوادا سووک و ڕسواترە لە پلەی کەسانێک کە تەنها وەک لاساییکاری خۆیان بە دەستبەردان لە حەق دەڕازێننەوە، تەنانەت عەوامێکی دەبەنگ و گێژیش بەدوورە لە ئابڕووچوونی ئەم فەتارەیەی ئەمان، چونکە ئەوە لە سرووشت و ڕەوشتیدا نییە کە بە خۆچوواندن بە گومڕایانەوە خۆی بەزیرەک نیشانبدات."[١]

جا ئەم دەربڕینەی ئەبوو حامید: "جا بە باوەڕهێنان بە کوفر خۆیان ڕازاندەوە" یەک لە سەرچاوەی ناوازەی گوفتارەکانیەتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە ئەویش ئاماژە بە چەمکێکی دەروونی دەدات کە بریتییە لە "خۆڕازاندنەوە بە بوونە زەندیق" یاخود "خۆڕازاندنەوە بە گومڕایی" لەلای هەندێک لە بەزیو و

---

(١) الغزالي، "تهافت الفلاسفة"، تحقيق: أحمد شمس الدين، دار الكتب العلمية، الطبعة الثانية، (١٤٢٤هـ)، (ص٤١- ص٤٢) مختصراً.

سەرکزان، بە گومانی ئەوەی کە ئەگەر خۆیان بە فەیلەسووفێکی بێباوەڕ بچوێنن لە ڕەفتاریدا، وەک ئەوە وایە لە پێگەی زیرەکی و توانا تیۆریسازییەکانیدا بەشداری بووبن! یاخود ئەگەر خۆیان بە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان بچوێنن لە ڕەوشتی نزم و لادەریاندا، وەک ئەوە وایە کە لە پێگەی زانستە مەدەنییە ماددییە پێشکەوتووەکانیاندا بەشداریان بووبن!

وادیارە ئەم حاڵەتە دەروونییەش لە کرۆکی ناوەکیدا جۆرێکە لە بەندایەتی شاراوە؛ چونکە دەبینین کە شوێنکەوتووانی پادشا و سەرۆک و دەوڵەمەندەکان خۆیانیان پێ دەچوێنن بە گومانی ئەوەی کە بەرگ و ڕوواڵەتیان بەشێکە لە هێز و هەژموونیان.

ئەم شکانەوەیەش کە بۆ شەیدای ڕۆشنبیری ڕوودەدات لە هەمبەر هەژموونی ئاڵۆزیدا، هۆکارەکەی وەهمکردنی ئەوەیە کە ئاڵۆزی لێکەوتەی قووڵییە، ئەمەش زۆرجار ڕاست نییە، گرنگیشە شەیدای ڕۆشنبیری و هزر بزانێت کە ئاڵۆزی زۆرجار «ستراتیژییەتێکی نووسینییە» لە هونەری پێکهێناندا، کە قورسکردنی دەق لەسەر خوێنەر و سازاندنی لە شێوەیەکی داخراودا، مەبەست لێی ترساندنی خوێنەر و وروژاندنی ترس و سامە لە دڵیدا.

زۆرێک لە بیریارە ڕۆژئاواییەکان قسەیان سەبارەت بەم حاڵەتی ئاڵۆزییە لە نووسینی فەلسەفی و هزریدا کردووە، هەندێکیش نموونە نمایش دەکەین.

لە تێبینییەکی بەناوبانگیدا فەیلەسووفی ئەمریکی هاوچەرخ «جۆن سێرل» تانە دەدات لە «ئاڵۆزیی بەئەنقەست»ی فەیلەسووفی فەڕەنسی جاک دریدا، کە «سێرل» دەڵێت:

"یەک لە جارەکان «میشێل فۆکۆ» شێوازی دریدا لە نووسیندا بەوە لەقەڵەم دەدات کە خەریکی «تیرۆری ئاڵۆزییە»، چونکە دەقی «دریدا» بەشێوەیەکی زۆر ئاڵۆز نووسراوە هەتا ئاستێک کە ناتوانیت ڕاست و ڕێک بزانیت بیرۆکەکەی

چییە؟ بەهۆی ئەوەوە ئاڵۆزە، لەپاش ئەوەش ئەگەر کەسێک بیەوێت ڕەخنە لە دەقەکە بگرێت، «درێدا» پێی دەڵێت: "تۆ هەڵە لە من تێگەیشتوویت، تۆ گەمژە و بێئاگایت." بەو هۆیەوە ئەوە تیرۆرە."[١]

دەتوانین لێرەدا چەند ئەنجامێک هەڵێنجین: یەکەم ئەوەی کە خوێنەرانێکی پسپۆڕ لە هزری ڕۆژئاواییدا، لەوێنەی «فۆکۆ و سێرل»، دەقی «درێدا» بە ئاڵۆز دادەنێن، نەک خوێنەرێکی عەرەبی ناشارەزا، دووەمیش ئەوەی کە ئەوان پێشیان وایە کە ئەم ئاڵۆزییە بەئەنقەستە، نەک ئاڵۆزییەک بێت کە پێدراوە بابەتییەکانی بیرۆکەکە لە تەختی نمایشدا سەپاندبێتیان، هەروەها ئەوەش کە ئەم ئاڵۆزییە ئامانج لێی بەزۆر دەستەمۆکردنی خوێنەرە، هەربۆیە ئەم دەستەواژە زیرەکانەیان بۆ داناوە «تیرۆری ئاڵۆزی».

لەو کەسایەتییانەش کە لە کەیسی ئاڵۆزی و ناڕوونیدا زۆر ڕەخنەی لە فەیلەسووفەکان گرتووە فەیلەسووفی ئینگلیزی «برتراند ڕاسڵ»ە (ک: ١٩٧٠ز) لەوانە بەنموونە ئەوەی کە لەبارەی «هیگڵ»ەوە دەڵێت: "ئەگەر بەدوای پێناسەیەکدا بگەڕێین بۆ بیرۆکەی ڕەها لەلای هیگڵ، بە جۆرێکی وەها ئاڵۆز بەرچاومان دەکەوێت کە ئیدی هیچ کەڵکی لێنەبینرێت."[٢]

بەڵکوو ڕاسڵ وای دەبینێت کە بڵاونەبوونەوەی فەلسەفەی هیگڵ لە فەڕەنسادا بەهۆی ئاڵۆزی نووسینیەتی بە بنەڕەتە ئەڵمانییەکەی بە شێوازێک کە ڕێگری لە وەرگێڕانی بەئاسانی دەکات بۆ فەڕەنسی، هەروەک ڕاسڵ دەڵێت:

"وەکوو فەڕەنساش بەگشتی هەر بە ناسازی مایەوە لەوەی کە کاریگەربێت بە فەلسەفەی هیگڵ، لەوانەشە هۆکاری ئەوە ئاڵۆزی توندی دەقە بنەڕەتەکە

---

(1) Searl, The word turned upside down, NYRB, October 1983 ,27.

(٢) برتراند راسل، "حكمة الغرب"، ترجمة: فؤاد زكريا، دار عالم المعرفة، (١٩٨٣م): (٢/١٣٢).

بێت، کەڕێگری دەکات لە دەربڕینی بە زمانێکی فەڕەنسی ڕۆشن و فامکراو". [١]

دیسان ڕاسڵ لەبارەی «هوایتهید»ەوە دەڵێت:

"زۆرجاریش دەبینین نووسینەکانی «هوایتهید» سەر بە ساڵانی دوایی ژیانیەتی کە زۆر ئاڵۆز و سەخت تێگەیشتنن." [٢]

هەرکەسێکیش کەمترین ئاگایەکی لە فەلسەفەی ڕۆژئاوایی هەبێت، دەزانێت کە «هایدگەر» لەناو ئەو چینەدا پۆلێن دەکرێت کە دەکرێت ناوی لێ بنرێت، چینی تەماوی تەواو کە توندترین دەقە فەلسەفییەکانن لە ئاڵۆزی بەئەنقەست و زۆرلەخۆکاریدا، ئەسڵەن هەتا ئاستی دەرچوون لەڕێساکانی زمانیش، تەنانەت برتراند ڕاسڵ دەڵێت:

"لە واقیعدا فەلسەفەی «هێدگەر» کە دەستەواژەگەلێکی ئەوپەڕ نامۆی بەکارهێناوە، کە بە ئاڵۆزی زۆر توند دەناسرێنەوە، بگرە مرۆڤ دەتوانێت بڵێت کە زمان لەوێدا بەبێ ڕێسا دەڕوات." [٣]

ئەم وەهمە مەترسیدارە بەربڵاوەش کە پەیوەندییەکی نائاگایانە لەنێوان «ئاڵۆزی» و «قووڵی»دا دەبەستێت تەنها خوێنەری عەرەب درکی پێ نەکردووە، بەڵکوو مێژوونووسە شارەزاکانی هزری ڕۆژئاواییش تێبینیان داوە، بە جۆرێک کە جۆن ماکۆری لە مێژوونووسینیدا بۆ وجوودییەت دەڵێت:

"بیرکردنەوەی کەسی وجوودی مەترسییەکی هەمیشەیی لەسەرە کە بگۆڕێت بۆ هزرێکی ناڕێکخراو کە کاردانەوە و قابلییێتی تایبەت و کەسی جێگەی

---

(١) رسل، "حكمة الغرب"، مصدر سابق: (٢/١٣٠).

(٢) رسل، "حكمة الغرب"، مصدر سابق: (٢/٢١٠).

(٣) رسل، "حكمة الغرب"، مصدر سابق: (٢/٢٢٠).

بەڵگەی تێدا بگرنەوە و ئاڵۆزی بەو چاوەوە تەماشا بکرێت کە قووڵییتییە." [١]

ماکۆریش قسەی لەبارەی ئەم وەهمەوە نەکردووە، مەبەستم وەهمکردنی ئەوەی کە ئاڵۆزی قووڵیێتییە، هەتا ئەوەی کە خۆی لە نووسینەکانی فەیلەسووفانی وجوودییەتدا هەستی پێ کردووە کە ئەو مێژوونووسی وجوودییەتە و شارەزایەتی، ئاماژەشی بە مەترسیداری ئەم وەهمە کردووە.

دیسان «ڕاسڵیش» ئاماژەی بەم پەیوەندییە وەهمییەی نێوان قووڵی و ئاڵۆزی کردووە، کە دەڵێت:

"بڕێکی قورس و وشک و ناوبۆش لە نووسینە فەلسەفییەکان! بگرە لە حاڵەتانێکی دیاریکراودا شتێکی وەک لاساییکاری چەسپاو دەبینین کە وادادەنێت نووسینە فەلسەفییەکان دەبێت ئاڵۆز و ئاڵۆزکراو بن لە شێوازیاندا، تاکوو قووڵ بن، ئەمەش زۆر جێی داخە." [٢]

ئەم گەواهیدانە لەلایەن فەیلەسووفێکەوە بەقەبارەی بێرتراند ڕاسڵ لەوپەڕی گرنگیدایە کە ڕەخنە لە کەسێکی دیاریکراو ناگرێت، ڕەخنە لە قوتابخانەیەکی دیاریکراو ناگرێت، بەڵکوو بڕیارەکە بەرزدەکاتەوە بۆ ئاستی تەواویی بازنەی فەلسەفی، هەروەها ئاماژە بە بوونی «لاساییکارییەکی چەسپاو» لە فەلسەفەدا دەدات کە ئاڵۆزی شێواز لەگەڵ قووڵی واتادا پێک دەبەستێتەوە!

لەڕاستیشدا: ئەم پێکبەستنەوەیە لەوپەڕی ساویلکەیەتیدایە، ئەویش بەرپرسە لە تێکئاڵۆسکاوی زمانەوانی لە دەقی فەلسەفی ڕۆژئاوایی و مڵێتی[٣] بەئەنقەست لە زۆرێک لە نووسینە هزرییەکاندا.

---

(١) ماكوري، "الوجودية"، ترجمة: إمام عبد الفتاح إمام، دار عالم المعرفة، (١٩٨٢م)، (ص١٦١).

(٢) رسل، "حكمة الغرب"، مصدر سابق: (١/٨٩).

(٣) مڵێتی: وەک لاستیکێتی[مەتاتێتی]

لەوانەشە خوێنەر پرسیارێکی بۆ دروست بێت کە ناوەڕۆکەکەی ئەمە بێت کە: لەوانەیە ئەم فەیلەسووفە یاخود ئەو فەیلەسووفە بەئەنقەست ئاڵۆزی نەکات، بەڵکوو ئەوە هەر شێوازی نووسینی خۆی بێت؟ لەڕاستیدا: ئەوەی کە دەست ئەنقەستی لێرەدا ئاشکرا دەکات ئەوەیە کە ئەو فەیلەسووفانە لە وتووێژەکانی ناو ڕاگەیاندندا جاربەجار ئەو تەماویکردن و مڵێتیانەیان بیردەچێتەوە بەهۆی کەشی ڕاستەوخۆیەتی لە وتووێژی ناو ڕاگەیاندنەکاندا، «جۆن ستڕۆک»ی ڕەخنەگر درکی بەوە کردووە کە دەڵێت:

"«فۆکۆ و درێدا» پلەی سەختییەتیان لەسەروو پلەی سەختییەتی «بارت»ەوەیە، لەگەڵ ئەوەدا کە هەردووکیشیان توانای گفتوگۆی ڕاستەوخۆیان هەیە کە لایەنێکی ڕۆژنامەیی لە نووسینەکانی فۆکۆدا هەیە کە لە ساتگەلێکی دەگمەندا دەتوانیت زۆر تەواو لێی تێبگەیت.»"[١]

هەندێک لە نووسەرانیش پێیان وایە ئاڵۆزی لە نووسینە هزری و فەلسەفییەکاندا فرمانێکی دیکەی هەیە، ئەویش شاردنەوەی کەلێنەکانە ئەگەر هاتوو نووسەر کەوتە تەنگانەی لاوازی بەڵگەوە، جا لە ناوچە فشۆڵەکانی پەرتووکەکەدا فەیلەسووف پەنا دەباتە بەر وشەی گشتی ناڕوون و ئاڵۆز تاکوو چاوی ڕەخنەگرانەی خوێنەر ڕاوی نەکات، ڕەخنەگریش ناتوانێت ئەوە بچەسپێنێت کە نووسەر مەبەستیەتی تاکوو لەسەر بنەمای ئەوە دادگایی بکات، لەوانەشی کە ئەم لێکدانەوەیان بۆ ئاڵۆزی هەیە، مامۆستای ئەمریکی فەلسەفە «سترۆمبێرگ»ە (ک: ٢٠٠٤ز)، کە پسپۆڕە لە مێژووی هزری ئەورووپیدا، بەنموونە کە دەڵێت:

"ڕوونە کە زانیاری مارکس لەسەر مێژووی هزر و کرداری مرۆیی زۆر لەوە

---

(١) ستروك(محرر)، "البنيوية وما بعدها"، ترجمة: محمد عصفور، دار عالم المعرفة، (١٩٩٦م)، (ص٢١)

کەمترە کە پاڵپشتی گشتگیرییە بوێرانەکانی بکات، هەربۆیە پێچی کردووەتەوە بۆ بەکارهێنانی زمانێکی ئاڵۆز، بە مەرامی شاردنەوەی هەندێک گرفت یاخود کەیسی قورس."[١]

لە نموونەی ئەم شوێنانەشدا خوێنەری عەرەبی نەگبەت دێت و وا وەهم دەکات کە ئاڵۆزی لووتکەی قووڵییە، لە کاتێکدا کە ئەوپەڕی تەنکی و ڕووکارییەکە کە پەردەپۆشکراوە بە ئاڵۆزی!

لەڕاستیشدا: ئەم تۆمەتبارکردنە بەربڵاوە لە ڕۆشنبیری ڕۆژئاواییدا، بیریاری ئوستراڵی «پیتەر سینگەر» هەندێک لەم هەڵوێستانەی پوخت کردووەتەوە کە پسپۆڕی فەلسەفەی ڕەوشتەکانە، لەوێدا کە دەڵێت: "هەندێک هیگڵ بەوە تۆمەتباردەکەن کە قۆڵبڕ (دەجال)ێکە کە بیرۆکە بۆشەکان بە دەربڕینی بەئەنقەست ئاڵۆز پەردەپۆش دەکات بە ئامانجی هەندێک قووڵ نیشاندانیان."[٢]

هەرچەندە سینگەر هاوڕایی لەسەر ئەم هەڵسەنگاندنە دەرنابڕێت، بەڵام ئەو دەقە هەندێک لە هەڵوێستە بەربڵاوەکانی ناو ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی لە هەمبەر دیاردەی ئاڵۆزی فەلسەفی بەدەردەخات، ئەم بڕەش بەسە کە پەیوەندی بە ئێمەوە هەبێت، ئیدی تۆمەتبارکردنی هیگڵ بەوەی کە قۆڵبڕ و درۆزنە (دجّال-Charlatan)، بێگومان دیارە کە سینگەر ئاماژە بە شۆپنهاوەر دەکات، ئەوە کە هیگڵ بە دەجالییەتی تۆمەتبار دەکات، هەرچەندە سینگەر بەڕاشکاوی نایڵێت، بەڵام بەهەرحاڵ تۆمەتێکی بەناوبانگە، ئیدی بە ناوبانگییەتی خۆی بێپێویستە لە ڕاشکاوانە ئاماژەدان بە سەرچاوەکەی.

بابەتیبوون و ویژدانپەروەریش ئەوەمان لێ دەخوازن کە دان بە جیاوازییەتی

---

(١) سترومبرج، "تاريخ الفكر الأوروبي"، ترجمة: الشيباني، دار القارئ العربي، الطبعة الثالثة، (١٩٩٤م)، (ص ٤٤٦).

(2) Singer, ´Hegel´ in: The Philosophers: Introducing Great Western Thhinkers, Honderich (ed,) Oxford University Press, 2001, p. 132.

ئاڵۆزی و ناڕوونی و ملێتی لەنێوان دەقە فەلسەفییەکاندا بنێین، بەڵکوو لەنێوان هەرێمەکانی فەلسەفە و شارەکانی هزریشدا، بە نموونە، مێژوونووسانی هزری ئەورووپی ناکۆکیان لەوەدا نییە کە کەشی فەلسەفی ئەڵمانی زیاتر لە گەمەی ئاڵۆزی و ناڕوونی و تەماویکردن و وێڵکاریدا تێوەگلاوە، تەنانەت «دیۆرانتی» مێژوونووس دەڵێت: "ناڕوونی و ئاڵۆسکاوی بوونەتە مۆدەی باو لە نووسینی ئەڵمانیدا."[١]

بێرتراند ڕاسڵیش هاوشێوەیەکی ئەم تێبینییە دەهاوێت کە دەڵێت: "توێژینەوەکەی سارتەر بەناوی «وجوود و عەدەم-هەبوون و نەبوون» کە پەرتووکێکە تەواو لەسەر شێوازی ئەڵمانی ڕۆشتووە لە نووسیندا، لەلایەنی ئاڵۆزی شیعری و نامۆیی واژەیییەوە."[٢]

مێژوونووسی ئەمریکی هزرەکانیش «کرین برینتۆن» کە خاوەنی تێزە بەناوبانگەکەیە لەسەر توێکاری شۆڕش؛ لە پەرتووکێکی دیکەیدا لەسەر مێژووی هزری ڕۆژئاوایی دەڵێت: «ئەو سیفەتانەی کە کانت هەیەتی لە ئاڵۆزی و درێژەپێدانێکی بێتام کە سیفەتانێکی ئەڵمانین ...»[٣]

لە سەرەتای نەوەدەکانیشدا مامۆستای بەریتانی فەلسەفە «باری سمێث» کە توێژەرێکی فرەپسپۆڕییە، کارتێکی سەرنجڕاکێشی لەم بوارەدا پێشکەشکرد کە تێیدا ڕایەکی بەربڵاوی -وەک ئەو بانگەشەیدەکات- ناو فەیلەسووفە ئەنگلۆسەکسۆنییەکانی تێدا خستووەتەڕوو کە فەلسەفەی ئەڵمانی ئەسڵەن «وەرگێڕانی مومکین نییە -ڕێی تێناچێت-» (Untranstable)، هەروەک «باری سمێث» دەڵێت: "دەقەکانی فەلسەفەی ئەڵمانی، ئیدی کلاسیکی یاخود

---

(١) دیورانت، "قصة الحضارة"، ترجمة: فؤاد أندراوس، دار الجيل: (٤١/٢٣٧).

(٢) رسل، "حكمة الغرب"، مصدر سابق: (٢/٢٢٢).

(٣) برينتون، "تشكيل العقل الحديث"، دار العين، الطبعة الأولى، (٢٠٠١م)، (١٦٨).

هاوچەرخەکانیان، وادیارە کە توانای وەرگێڕانی نییە بە واتای ورد، بەهۆی ئاڵۆزی شێوازەکەیەوە."[١]

دیسان توێژەر ئەم بڕیارەی بەسەر فەیلەسووفە فەڕەنسییە کاریگەرەکانیش بە شێوازەکانی فەلسەفەی ئەڵمانیدا داوە، لەوانیش ناوی «ئالتۆسێر و درێدا و لیۆتارد» دێنێت، توێژەر سکاڵای زۆرێک لە فەیلەسووفە ئینگلیززمانەکان باس لێوەدەکات سەبارەت بە لاوازی کوالێتی وەرگێڕانە بەردەستەکان لە ئەڵمانییەوە، هەروەها توێژەر ئاماژە بەوە دەدات کە فەیلەسووفە ئەڵمانییەکان بیرۆکە ئاڵۆزەکان لەیەک ڕستەی زۆر دووردرێژدا چڕدەکەنەوە، جا کاتێک بۆ ئینگلیزی وەردەگێڕدرێت توانای خوێندنەوەی لە خوێنەردا نییە بە زمانی ئینگلیزی بەهۆی جیاوازی پێوەرەکانی پێکهێنانی ڕستەوە لە دوو زمانەکەدا! هەروەک لە گرنگترین بەربەستەکانی سەرڕێگای ئیمکانی وەرگێڕانی پەرتووکە فەلسەفییە ئەڵمانییەکان -بەپێی ڕای توێژەر- بریتییە لە: بەکارهێنانی زمانی شیعری(poetic language) لەلایەن هەندێک لە فەیلەسووفە ئەڵمانییەکانەوە کە زمانێکی دەرگا لەسەرپشت و کراوەیە بۆ ئەگەرە واتاییەکان، جا ئەگەر شاعیر خۆشی لەسەری قورسبێت هۆنراوەکەی بکات بە پەخشان هەر لەناو زمانەکەی خۆیدا؛ ئیدی ئەسڵەن گۆڕینی زمانێکی شیعری بۆ زمانێکی دیکەی جیاواز چۆن دەکرێت؟!

گرنگیشە جەخت لەوە بکرێتەوە کە توێژەر مەبەستی لە ئەستەمی وەرگێڕان نییە بەهۆی دیاردەی (بۆشایی فەرهەنگی-الفجوة المعجمية) و لەنێوان زمانەکاندا کە دیاردەیەکی ناسراو و جێ توێژینەوەی زمانەوانییە، بەڵکوو بەهۆی ئاڵۆزیی شێوازی و زمانی شیعری ناو فەلسەفەی ئەڵمانییەوە وەک پێشتر باسکرا.

«باری سمێث» ئەوەش دەگوازێتەوە کە فەیلەسووفە ئەڵمانییەکان

---

(1) Smith, German Philosophy: Language and style, Topic 1991) 10), p. 161-155.

بە حاڵێک گەیشتوون کە نەک تەنها بەزۆر ئاڵۆزکاری بکەن، بەڵکوو گوتاری فەلسەفی ڕوونیش بە کەم و سووک دەگرن، هەروەک باری سمێث دەڵێت: "هیۆم پێداگرانە هەوڵی داوە کە بە شێوازێکی میللی سادە بنووسێت، بەو هۆیەشەوە فەیلەسووفە ئەڵمانییەکان پشتگوێیان خستووە، چونکە وەک گوتارێکی ڕووکاری و تەنک و ڕۆژنامەگەریانە لێیان ڕوانیوە.»[١]

لە کۆتایی کارتەکەشیدا باری سمێثی توێژەر لێکدانەوەیەکی سیاسی بۆ ئەم دیاردەیە پێشکەش دەکات، ئەویش ئەوەیە کە فەلسەفەی ئەڵمانی بەرهەمێکی ئەکادیمی یاخود بەرهەمی زانکۆکانە، لەکاتێکدا فەلسەفە لە ئینگلتەرا و فەڕەنسا بەرهەمی بەرهەڵستکاریکردنی خۆنیشاندانی زانکۆیی بوو.

بەهەرحاڵ ئەمەش لێکدانەوەی توێژەر خۆیەتی، ئێمە ناتوانین جەخت لەم لێکدانەوەیە بکەینەوە یاخود ڕەتی بکەینەوە؛ چونکە پێویستی بە پشکنینێکی بابەتی بۆ پێدراوە مێژووییەکان هەیە، هەروەها ئەم تێزە ئەگەریش خزمەت بەو بانگەشەیە بکات کە ئێمە لەم بەشەدا نمایشی دەکەین، بەڵام بابەتیبوون ئەوە دەخوازێت ئاماژە بە پەڕاوێزەکانی هەڵاوساندن لە تێزەکەدا بکەین. هەربۆیە؛ ئەگەر لە پەڕاوێزەکانی زێدەڕەوی ناو ئەم تێزە دەربازبین، ئەوکات وەک گەواهییەک بۆ کەیسی جێگەباسی ئێرەمان هەر دەمێنێتەوە، کە ئەویش قەیرانی ئاڵۆزییە لە گوتاری فەلسەفی ڕۆژئاواییدا کە کاریگەرە بە ڕۆحی شێوازی فەلسەفەی ملّی ئەڵمانی بەتایبەت، هەتا ئاستی سەرگەردانبوون لە دیاریکردنی مەبەستی و گواستنەوەیدا بۆ زمانە ئەوروپییەکانی دیکە، چ جای زمانی عەرەبی.

بەهۆی ئەم ئاڵۆزییەشەوە لە دەقە فەلسەفییەکاندا گرفت و گرێی «پەرشبوونی واتا» تێیدا سەری هەڵدا کە ناتوانرێت مەبەستی لێ دەستنیشان بکرێت، ئەوەی کە دەکرێت ناوی لێبنرێت قەیرانی «بەگەردیلەبوونی واتابەخشی»، زانای

---

(1) Smith, German Philosophy: Language and style, Topic 1991) 10), p. 161-155.

فیزیایی و گەردووناسی ئینگلیزی بەناوبانگ «جێمس جێنز» (ك١٩٤٦م) لەبارەی نموونەیەکی زۆر نازک و پێکەنیناوی ئەم گرێیەوە دواوە، بەو بۆنەیەشەوە بڵێین کە «جێمس جێنز» کەسایەتییەکی پەراوێزی نییە لە مەعریفەی ڕۆژئاواییدا، بەڵکوو ئەو زانایەیە کە یاسای فیزیایی «یاسایرایلی - جێنز» (Jeans law -Rayleigh) پێ ناونراوە کە تیۆرێکە پەیوەندی بە سەرهەڵدانی ئەستێرەکانەوە هەیە، هەروەها «بارستەی جێنز» (Jeans mass)ی بە ناوی ئەوەوە نراوە کە کەمترین ئاستی بارستەیەکی هەوری گازی دەنوێنێت کە لە دەرئەنجامی چوونەوەیەکی ئەستێرەیەکی نوێ بێتەبوونەوە، هەروەها چاڵێکی مانگی (lunar crater) کە لەسەر ڕووی مانگ دۆزرایەوە بە ناوی ئەوەوە ناونرا (چاڵی جێنز)، هەروەها چاڵێکی مەریخیش (Martin crater) کە لەسەر ڕووی هەسارەی مەریخ دۆزرایەوە دیسان بە ناوی ئەوەوە ناونرا. داهێنانی تایبەتی زۆریشی لە بازنەی فیزیا و گەردووناسیدا هەیە، گرنگ ئەوەیە جێمس جێنز نموونەیەکی سەرنجڕاکێش بۆ گرێی بەرەڵڵابوونی واتا لە دەقە فەلسەفییەکاندا دێنێتەوە کە دەڵێت:

"لەوانەیە بەهانەیەک بۆ ئاڕاستەکردنی ئەم پرسیارە هەبێت کە ئایا کانت خۆی لە خۆی تێگەیشتووە؟! کە لە پاش شانزە ساڵ لە بڵاوکردنەوەی «ڕەخنە لە عەقڵی پەتی» پرەنسیپەکانی کانت پەشێوییەکی توندی لە ئەڵمانیادا هەڵایساندبوو...، لەو وادەیەشدا پرسیار لە کانت کرا کە کامێک لە لێکدەرەوەکانی شایستە و شارەزاترن بە واتای مەبەست، لە وەڵامدا ئاماژەی بە پیاوێکی دیاریکراو کرد کە ناوی «شۆلتز» بوو کە لێکدانەوەیەکی پرەنسیپی دانابوو کە تەنانەت بەشە ئاسانەکانی فەلسەفەی کانتی ئاڵۆزکردبوو، لە فراوانگیری و درێژەپێدانێکی ماندووکەردا، لەکاتێکدا بەشە سەختەکانی سڕیبۆوە، لەگەڵ دانانی هەندێک لەو دەربڕینانەی کە دیار بوو هەڵەن، بەم شێوەیە کێشەی دۆزینەوەی واتای نووسینەکانی کانت هەتا ئەمڕۆ بەبێ چارەسەر مایەوە، «جێمس وارد»یش

پێمان دەڵێت کە لە ماوەی نێوان (١٨٦٥ز) بۆ (١٨٧٨ز) بەلایەنی کەمەوەشەش شێوازی جیاوازی فەلسەفەی کانت هەبووە."[١]

بەم شێوەیە شرۆڤەکارانی کانت لە بێنەوبەردەدا مانەوە بەهۆی تەماویبوونی زمانەوانی و ئاڵۆزی بەئەنقەستی شێوازەکەی، تەنها لە هەژدەساڵیشدا شەش شێوازی جیاواز بۆ فەلسەفەکەی دەرکەوتن!

ئەم ئاڵۆزییە کانت خۆشی نایشارێتەوە، بەڵکوو ئاشکرا نواندوویەتی، چەندەها ئاماژەی پەرش و بڵاویشی هاویشتووە سەبارەت بە گرنگی نەدانی بە ڕوونی و سادەیی، وەک ئەوەی کە لە کتێبە هەرە بەناوبانگەکەیدا «ڕەخنە لە عەقڵی پەتی» دەڵێت: "وام بینی کە باش نەبێت کتێبەکە بە نموونە و ڕوونکردنەوە ئەستوور و درێژ بکەمەوە کە پێویست نییە مەگەر لە گۆشە نیگایەکی میللییەوە."[٢]

هەروەک «باری سمێث» باسی لەوە کرد کە فەیلەسووفە ئەنگلۆساکسۆنییەکان سکاڵایانە لەدەست لاوازی کوالێتی وەرگێڕانی پەرتووکە فەلسەفییە ئەڵمانییەکان بۆ ئینگلیزی، دیسان ئەمە لەلای ئێمەش لە عەرەبیدا هەیە، لە واقیعدا: زۆرێک لە لاوانی چاولەدووی ڕۆشنبیری ئەگەر کتێبە فەلسەفییە وەرگێڕدراوەکان بخوێننەوە و لێی تێنەگەن، وادەزانن کە ئەوە واتاگەلێکی ورد و تیژە کە لە سەروو ئاستی تێگەیشتنی ئەوانەوەیە، ئەوەیان بە مێشکدا نایەت کە لەوانەیە بەهۆی خۆهەڵکێشانی نووسەری دەقە فەلسەفییەکەوە و دەستەوەستانبوونی وەرگێڕیش لە ئاست تێگەیشتنی، هەربۆیە وەرگێڕانەکە بەم شێوە ناڕوونە دەرهاتووە! بەشوێنیشیدا؛ دەکەونە بەزین و شکانەوەوە لە هەمبەر ئەم ستراتیژییەتی ئاڵۆزییەوە، دەبێت هەڵەبوونی ئەم ڕەفتارە و

---

(١) جيمس جينز، "الفيزياء والفلسفة"، ترجمة: جعفر رجب، دار المعارف، (١٩٨١م)، (ص ٧٦).

(٢) كانط، "نقد العقل المحض"، ترجمة: موسى وهبة، مركز الإنماء القومي، (ص ٢٨).

پێویستییەتی متمانەبەخۆبوون بۆ خوێنەری عەرەب بسەلمێنێن.

چونکە لە واقیعدا: وەک چۆن مامۆستایانی ئەنگلۆساکسۆنی فەلسەفە سکاڵایان لە دەست وەرگێڕانی فەلسەفەی ئەڵمانی بۆ ئینگلیزی هەبووە، بە هەمان شێوە مامۆستایانی عەرەبی فەلسەفەش سکاڵای تێنەگەیشتنیان لە کتێبە وەرگێڕدراوەکان هەبووە! هەندێک نموونەش باس دەکەین:

مامۆستای فەلسەفە لە کۆلێژی ئاداب لە ریباط، موحەممەد عابید جابری دەڵێت: "من وەکو خۆم کاتێک کتێبێک دەخوێنمەوە کە لەم چاخەدا بۆ عەرەبی وەرگێڕدراوە لە بابەتێکی فەلسەفیدا؛ لێی تێناگەم."[١]

نووسەر و وەرگێڕی پسپۆڕ لە فەلسەفەدا، هاشم صالح دەڵێت: "بەبیرم دێت کە هەستم بە ئازار و سەرگەردانی دەکرد کاتێک کتێبێکی وەرگێڕدراو دەکەوتە بەردەستم، چونکە زۆربەی جارەکان تێنەدەگەیشتم بەووردی چی دەڵێت." [٢]

بەڵکوو لە سەیرترین گاڵتەجاڕییەکانی ناو وەرگێڕانی پەرتووکە فەلسەفی و هزرییەکان، ئەوە بوو کە بیریاری مەغریبی عەبدوڵڵای عوڕەوی ساڵی (١٩٦٧ز) ئەو کتێبەی خۆی (الآيديولوجيا العربية المعاصرة) بە زمانی فەڕەنسی نووسی، لەپاشان موحەممەد عیتانی ساڵی (١٩٧٠ز) وەریگێڕا بۆ عەرەبی، «ماکسیمرۆدنسۆن»یش پێشەکی بۆ ئەم وەرگێڕانە عەرەبییە نووسی، بێگومان هەمووو ئەوەش بە ڕێککەوتن لەگەڵ نووسەر خۆی، سەیر لە هیچ لەمانەدا نییە، سەیری سەرتەزێن لەوەدابوو کە عوڕەوی خۆی -کە خودی نووسەرە- دانی بەوەدا نا کە لە وەرگێڕانی عەرەبی کتێبەکەی خۆی تێنەگەیشتووە! وەک گورزە

---

(١) محمد عابد الجابري، "التراث والحداثة: دراسات ومناقشات"، مركز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الثانية، (١٩٩٩م)، (ص ٢٥٣).

(٢) هاشم صالح (مُترجِم ومُقدِّم)، "أين هو الفكر الإسلامي، من فيصل التفرقة إلى فصل المقال"، مُقدِّمة هاشم صالح، (ص ١).

نووشته و تەلیسمی نەشکاو واقی لێی وڕماوە، کە عوڕەوی لە دواتردا چەند بڕگەیەک لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی پەرتووکەکە دێنێتەوە و ئەوجا دەڵێت: "ئەمانە کۆمەڵێک مەتەڵن کە ڕێگای هەڵهێنان و دۆزینەوەیم پێ شک نایە، لە گەڵ ئەوەشدا کە بنەڕەتەکەی خۆم نووسیومە، ئیتر جگە لە خۆم چۆن توانیویە لێی تێبگات."[١]

ئیتر خۆ ئەمانە مامۆستایانی فەلسەفەن لە جیهانی عەرەبیدا جابری و عوڕەوی و هاشم صالح بە ئاشکرا دەڵێن کە لە پەرتووکە فەلسەفییە وەرگێڕدراوەکان بۆ عەرەبی تێناگەن، بەڵکوو عوڕەوی لە کتێبەکەی خۆشی تێنەگەیشتووە!

ئیدی چ شاهیدێک لەسەر ئەم دەردەسەری و قەیرانی ئاڵۆزییەی ناو کتێبە فەلسەفی و هزرییە بەعەرەبیکراوەکاندا هەبێت لەمە زیاتر؟!

لەوانەشە کەسانێک ببینیتەوە کە وای نیشانبدەن لە دەقێک تێگەیشتوون کە نووسەرەکەشی لێی تێنەگەیشتووە لەترسی ئەوەی پێیان بوترێت تێگەیشتنی فەلسەفییان نییە و توانای هزرییان لە خوارەوەیە!

ئەگەریش بمانەوێت بچینە ناو شیکاری کرۆکی گرفتی ماناگەیێنی لە ئاڵۆزی فەلسەفیدا، بە واتای ئەوەی ئەگەر بمانەوێت وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەست بکەوێت: لەکوێوە ئاڵۆزی لەم جۆرە دەقانەوە هەڵدەقووڵێت؟

دەتوانین بڵێین: کە ڕستەی زمانەوانی سادە لە نیهاد و گوزارەیەک، یاخود وێنا و بەڕاستگەڕاندێک، یاخود بابەت و بەسەردابڕاوێک، یاخود بابەت و بڕیارێک، یاخود بڕیارلەسەردراوێک و بڕیارپێدراوێک و ئەم وێنانە پێکدێت کە دەستەواژەگەلێکی لێک نزیکن، جا مەبەست ئەوەیە کە لە ڕستەی سادەدا وشەیەک دەبینیت کە وێنایەکت لەسەر بابەتێک پێ دەبەخشێت، وشەیەکی

---

(١) العروي، "الأيديولوجيا العربية المعاصرة"، المركز الثقافي العربي، الطبعة الثانية، (١٩٩٩م)، (ص ٩).

دیکەش کە بڕیارێک دێنێتە پێش و دەیداتەپاڵ ئەو بابەتە.

جا ئەگەر ئەو وشەیەی کە وێناکە پێشکەش دەکات ئەگەری چەند واتایەکی هەبێت و ئەو وشەیەش کە بڕیارەکە پێشکەش دەکات ئەگەری چەند واتایەکی هەبێت، ئەوکات ژمارەیەک ئەگەری ئەنجامیمان بۆ ئەم ڕستەیە دەبێت، جا ئەگەر کەمترین ژمارەی ئەگەری ماناگەیێنی بۆ هەر وشەیەک وەربگرین، وایدانێین کە ئەو وشەیەی بابەتەکە وێنادەکات ئەگەری دوو مانای هەبێت و ئەو وشەیەش کە بڕیار پێدراوەکە وێنادەکات ئەگەری دوو مانای هەبێت، لە هەژماری ئەگەرەکاندا (٤) ئەنجام یاخود بڕیاری کۆتاییمان دەبێت، ئەوسا و ئاوا خوێنەر سەرگەردانی ئەوە دەبێت کە ئاخۆ نووسەر مەبەستی کامەیانە.

با نموونەیەکی کرداریش لەسەرڕستەیەکی سادە وەربگرین کە بابەت و بڕیارێکی تێدایە و ئەگەرەکانی ماناگەیێنیشی تێدا ڕەت دەکرێتەوە، هیگڵ دەڵێت: "هۆشیاری نەگۆڕاو لە پێکهاتنی خۆیدا پارێزگاری لە ئەو سروشت و بنچینەیە دەکات کە گەردوونی جیابووەوە هەیەتی."[١]

ئەم ڕستەیە بابەتێک پێشکەش دەکات کە «هۆشیاری نەگۆڕاو»ە، بڕیارێکیش کە ئەویش بریتییە لەوەی کە پارێزگاری لە ئەو سروشتە دەکات کە هی «گەردوونی جیابووەوە»ن، لێرەشدا لە زەینی خوێنەردا چەند ئەگەرێک بۆ مانای هۆشیاری نەگۆڕاو دێنەپێش، کە ئایا نووسەر بە دەستەواژەی «هۆشیاری نەگۆڕاو» مەبەستی شتانێکە کە مرۆڤ تێیان دەگات و ئیتر گۆڕان و جووڵانی بەسەردا نایەت؟ یاخود نووسەر مەبەستی چەند توخمێکی فیترەتی ناو هۆشیاری مرۆڤە کە ناگۆڕێن و ناجووڵێن، یاخود شتێکی دیکەی دەوێت؟ ئەمە وەک بابەت.

---

(١) هيغل، "فينومينولوجيا الروح"، ترجمة: ناجي العونلي، مركز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الأولى، (٢٠٠٦م)، (ص ٢٩١).

هەمان پێشبینیش بۆ «گەردوونی جیابووەوە» دێتەوە پێش کە ئایا نووسەر مەبەستی ئەو جیهانەیە کە لێمان جیابووەتەوە و ئێمە نایبینین؟ یاخود نووسەر مەبەستی جیهانی پەتی ناو زەینە کە لێبووەوە و جیایە؟ یاخود شتێکی دیکە؟

جا ئەگەر زەین لە واتای بابەتەکەدا ڕاڕا بێت و لە واتای بەسەردا بڕاویشدا ڕاڕا بێت، ئەگەرەکان لە بڕیارە کۆتاییە ئەگەرییەکاندا چەند هێندە دەبنەوە، لەناکاو خوێنەر دەچێتە ناو یەک جەنگەڵ لە هەوری ماناگەیێنییەوە.

مەبەستیش لەم دەقەی کە لە هیگڵمان گواستەوە ئەوە نییە کە تێگەیشتنی بۆ هەر کەسێک ئەستەمە، بەڵکوو مەبەستمان تەنها «نموونەهێنانەوە» بوو بۆ وروژانی ئەگەرە ماناگەیێنییەکان لە بابەت و بەسەردابڕاو-بڕیار لەناو ڕستەی سادەی فەلسەفیدا، زانراوە کە هەندێک لە ئوسوولییەکان جیاوازی لەنێوان (مثال-نموونە) و (شاهد-گەواهی)دا دەکەن کە نموونە مەبەست پێی تەنها ڕوونکردنەوەی یاساکەیە ئیدی تەنها دانان و ئەگەری هاتنەدی بەسە، هەربۆیە ڕەخنەی نایەتە ڕێ، بەڵام گەواهی ڕەخنەی دێتە ڕێ ئەگەر دروست و تەواو نەبێت، چونکە بۆ ڕاستکردنەوەی یاساکە و پشتڕاستکردنەوەیەتی، هەروەک لە هۆنراوەی ئوسوولی بەناوبانگدا (مراقي السعود) فەرموویانە:

"والشأنُ: لا يُعترض المثالُ

إذ قد كفى الفرض والاحتمالُ"[(١)]

دابە کە: نموونە ڕەخنەی نایەتەسەر

چونکە گریمانە و دانان بەسن لەوەدا

---

(١) انظر: سيدي العلوي الشنقيطي، "نشر البنود على مراقي السعود"، المكتبة العصرية: (٢/٢١٨)، والولاتي، "فتح الودود على مراقي السعود"، دار عالم الكتب، (١٤١٢هـ)، (ص ١٨٠)، ومحمد الأمين الشنقيطي، "شرح مراقي السعود"، تحقيق: علي العمران، دار عالم الفوائد، الطبعة الأولى، (١٤٢٦هـ): (٢/٥٥٥).

هەربۆیە؛ دەبینیت ئوسوولییەکان تەنها بە (شواهد-گەواهیگەل)ێک بەڵگە بۆ یاساکانیان دێننەوە کە زۆرجار لەلایان بەهێز و دروستە، چونکە گەواهییەکان بۆ بەڵگەهێنانەوەن و نموونەکانیش تەنها بۆ وێناکردنن، هەر بەهۆی بێئاگابوونیشەوە لەم پرەنسیپە ئاراستەکارەی ناو بیرکردنەوەی ئوسوولی، گرفت و هەڵە هاتووەتە رێی ئەوانەوە کە هەوڵیان داوە لە رێگای کتێبەکانی ئوسوولەوە وێنای بابەتە لقی و بەشییەکان بکەن کە ئەسڵەن لەوێدا بابەتە لقییەکان خواستراون و بە میوانی هاتوون، یاخود ئەوانەی کە دەیانەوێت هەڵبژاردە و بڕیاردان و یەکلاکردنەوەی بابەتە لقییەکانی زانایەکی دیاریکراو لەناو قسەکانیدا لەتوێی پەرتووکەکانی زانستی ئوسوولدا دەربێنن کە لەوێدا بەڵگەهێنانەوە و نموونەهێنانەوە تێکەڵ بەیەک دەبن، ئێرەش شوێنی درێژەدان بەو باسە نییە.

مەبەستیش ئەوەیە کە ئەوەی باسی لێوە کرا سەبارەت بە ڕستەیەک بوو کە سادەش بێت و ئەگەرەکانی ماناگەیێنی بۆ هەر وشەیەک لە کەمترین ئاستیدا بوو کە (٢)ە، چ جای ئەوەی کە ئەگەرەکانی واتاگەیێنی بۆ هەر وشەیەک لە دوو مانا زیاتر بێت، هەروەها ڕستەکەش لێکنراو بێت چەندەها وێنا و ڕاستاندنی لێکئاڵۆسکاوی تێدا بێت، ئەوکات خوێنەر لە هەر دێڕێکدا بەرانبەر بە جیهانێکی تەواو لە ئەنجام و بڕیاری کۆتایی ئەگەریدا ڕادەوەستێت، ناشزانێت نووسەر مەبەستی کامەیانە، بەدرێژایی کتێبەکەش لە زەریایەکی زریاناویدا لە پێشبینی واتا و بڕیار مەلە دەکات! کە لە هەژماری ئەگەرەکاندا لە زانستی بیرکاری و ئامارەکاندا دەخوێندرێت.

جا هەتا ئەگەرە ماناییەکانی هەر وشەیەک زیادبکات و لە هەر بڕگەیەکیشدا وشە ئەگەرییەکان زیاد بکەن؛ چڕی ئەو تەمەی کە ڕێگری لە بینایی خوێنەر دەکات زیاددەبێت، بەڕاڕایی و نادڵنیاییشەوە ڕێ دەبڕێت کە ئەمە واتا مەبەستەکە بێت، ئەوکاتیش ملکەچ و شکاوە دەبێت بۆ هەر دەستێک کە بۆڕزگارکردنی بۆی درێژ بکرێت؟ لێرەشدا ئیدی نووسەر سەرکەوتووبوو لە

سازاندنی نەرمی و ڕادەستبوونی خوازراو لە خوێنەردا.

بەپێی زانیاری خۆشم ئەو نووسەرە عەرەبەی کە زۆرترین ئاڵۆزی بەزۆر و سازێنراوی هەبێت بیریاری سوری موطاع صەفەدییە، کە بۆیاخی تێزی فەیلەسووفەکانی ساڵانی شەستی فەڕەنسای پێوەیە، لە نموونەکانی ئاڵۆزی بەئەنقەست و سازێنراوی لەوێدایە کە موطاع صەفەدی دەڵێت:

"لەوانەیە پێهەڵکەوتنی تەقینی تاک، تەنانەت لە تایبەتترین شارستانییەتەکانیشدا لە ڕووی هەستکردن بە ڕەمزاندنی، لە خودی سەختی ئەو ڕەمزاندنەوە نەیەتە بوون، هێندی لە دەزگای تێگەیشتنی تاکەوە وەک ڕاستەوخۆیەتی و یەکسەری دێت."[١]

کتێبەکانی صەفەدی پڕن لەم ڕستە لوولپێچیانە، ئەمەش هەرگیز واتای ئەوە نییە کە قووڵییەکی هزری لەپشتەوە بێت، بەڵکوو چەند بیرۆکەیەکی زۆر بەکارهاتوو و ڕوواڵەتیش هەر بە هەمان زمان نمایش دەکات، بە نموونە لەگەڵمدا تێبینی ئەم بیرۆکە ساویلکەیە بکە کە توێنراوەتەوە ناو قاڵبێکی لوولخواردوو، صەفەدی دەڵێت: "خانوو هەر لە سەرەتاوە داهێنانێکی مرۆڤێنراوە، چونکە تا ئاستێک دیوی ناوەوەی بە کەسی دەکات." [٢]

بڵێی کەسێکی قۆشمە و نوکتەبازیش نەتوانێت هەر لەسەر ئاوازی ئەم زمانە بچرێت و بڵێت:

"ئۆتۆمبێل داهێنانێکی هەر لە سەرەتاوە پاش نوێگەریانەیە؛ چونکە جێگۆڕکێ بەسەر شوێنکاتدا دەسەپێنێت؟!" ئەمە بیرۆکەی قووڵە یاخود بەکارهاتوویەکی

---

(١) مطاع صفدي، "نقد الشر المحض: بحثاً عن الشخصية المفهومة للعالم"، مركز الإنماء القومي، الطبعة الأولى، (٢٠٠١م)، (ص ١٤٥).

(٢) مطاع صفدي، "ماذا يعني أن نفكر اليوم؟"، مركز الإنماء القومي، الطبعة الأولى، (٢٠٠٢م)، (ص ١٢).

لەقوتوونراو بە زمانێکی دورەیدی؟!

لە پرسی قەیرانی ئەگەرە ماناگەیەنییەکانی تاکە وشەیەک لە بابەتی وەرگێڕانیشدا، لە نازک و نایاب و سەرنجڕاکێشترینێک دیبێتم ئەوەیە کە مامۆستا موحەممەد عەبدولهادی ئەبوو ریدە (ک: ١٩٩١ز) کردوویەتی کە لە بلیمەتترین وەرگێڕانی عەرەبە، هەروەها شارەزاترینی ئەوانەی من دەیانناسم بە وردەکاری کەلەپووری ڕۆژهەڵاتناسی، جا ئەگەر لە وەرگێڕاندا دووچاری وشەیەک بووایەتەوە کە چەند واتایەک هەڵبگرێت؛ دەهات وەرگێڕانە عەرەبییەکەشی بە هەمان شێوە بە هەڵگری هەمان واتاگەل دادەنا، هەروەک لە وەرگێڕانی پەرتووکەکەی «فلهاوزن»دا لەسەر مێژووی ئیمپڕاتۆرییەتی عەرەبی کە لە ساڵی (١٩٥٨ز)دا وەریگێڕاوە، ئەبوو ریدە دەڵێت:

«ئەگەر خوێنەر لە چەند شوێنێکی کەمدا ناتوانێت بە ئاسانی ئاڕاستەی قسەکانی بۆ یەکلابێتەوە؛ ئەوە بەمەبەست لەلای منەوە وای لێکراوە، لەو پێناوەدا کە دەربڕینە عەرەبییەکە بواری هەمان ئەو ئەگەرە واتاییانەی هەبێت کە دەربڕینە ئەڵمانییەکە بواری بۆ هەیە؛ چونکە نووسەر تازە مردووە و گەیشتووەتە لای خوای خۆی، تەنها خۆشی دەتوانێت واتای وردی قسەکانی خۆی دیاریبکات."[١]

جا ئەبوو ریدە دان بەوەدا دەنێت کە بە ئەنقەست دەربڕینی ئەگەری بەکارهێناوە کە مەبەست دیاری ناکات، چونکە دەربڕینە ئەڵمانییەکەش هەر وا بووە، ئیدی ئەبوو ریدە خۆی بە خێر و سەلامەت لێی دەرچووە و گرفتەکەی لەنێوان نووسەر و خوێنەردا هێشتووەتەوە! جا ئەگەر نموونەی ئەمە لە کتێبەکەی «فلهاوزن»دا هەبێت کە ئاڵۆزی بەئەنقەستیشی تێدا نییە، بگرە

---

(١) انظر مقدمة المترجم في: فلهاوزن، "تاريخ الدولة العربية"، ترجمة: محمد عبد الهادي أبو ريدة، لجنة التأليف والترجمة والنشر، (١٩٥٨م)، ص(ل).

بەگشتی کتێبی ڕۆژهەڵاتناسان ئاڵۆزی بەئەنقەستی تێدا نییە، ئیدی چی لەگەڵ کتێبی فەیلەسووفان بکرێت کە پڕیەتی لە ئاڵۆزی بەئەنقەست وەک لەپێشدا ڕوونکرایەوە؟!

ئەوەندەش لە من دیاربێت لام وانییە کە ئاڵۆزی نە «دیاردەیەکی تازە» بێت، هەروەها نە «تەوژمێکی پێکبەستراو و بەردەوام»یش بووبێت لە ڕووی مێژووییەوە، هێندی شەپۆلێکی شێوازییە کە بە ڕێگای سووڕی هزرەکان دەردەکەوێت و دادەمرکێتەوە، چونکە ئێمە بە نموونە لە هزری عەرەبیدا جەنگی ڕەخنەگری تەها حوسێن و چاخی ئەو لە لاوانی قوتابخانەی ڕیالیزمی دەبینین کە نووکی ڕمەکەیان لەو دەمەدا عەبدولعەزیز ئەنیس و مەحمود ئەمین عالم بوون کە تەها حوسێن گاڵتەی ئەوەیان پێدەکات کە مەیلیان بەلای ئاڵۆزیدایە، ئەوانیش بۆ بەرگریکردن لە خۆیان ڕابوون و چەند گوتارێکیان نووسی کە دواتر لە کتێبێکدا کۆیانکردەوە کە حوسێن مەڕوە پێشەکی بۆ نووسیبوو، جا لەیەکێک لە قۆناغەکانی ململانێکەدا تەها حوسێن گوتارێکی بە ناونیشانی «یۆنانییە ناخوێنرێتەوە» نووسی کە تێیدا گاڵتەی ئەوەی پێ دەکردن کە گرفتی ئاڵۆزییان هەیە، کە تەها حوسێن دەڵێت:

"ئەوەشی کە زۆر بەئازارە ئەوەیە کە ئەوان وادەزانن قسەیەک دەکەن فامکراوە، هەندێکیان لەگەڵ هەندەکی تر بەو جۆرە قسەدەکەن و وادەزانن کە خۆیان لەیەکتری تێدەگەن، جا ئەگەر خەڵک لێیان تێنەگات بە مێشک وشکی تۆمەتباری دەکەن، من ناتوانم بڵێم وایەیان وانییە هەتا تێنەگەم، بەڵام کە بێن و تەلیسم و مەتەڵم نیشانبدەن من هیچی لەسەر ناڵێم، بەڕاستی بەزەییشم پێیاندا دێتەوە لەم خۆماندووکردنەدا کە هیچ سوودێکی نییە بۆ ئەوانەی کە ئەم تەلیسمانە دەخوێننەوە کە من خودی خۆم سەر و کلکی لێکناکەمەوە." [١]

---

(١) طه حسين، يوناني فلا يُقرأ، مقالة منشورة في: المجموعة الكاملة لمؤلفات الدكتور طه حسين، دار الكتاب اللبناني، الطبعة الأولى، ١٩٧٤م، ص (٥٨٩/١١-٥٩٠) مختصراً.

ڕاستیش ئەوەیە کە کرۆکی ئەو دیدەی کە ئەنیس و عالم بەناوی ڕیالیزم و واقیعییەتەوە لە وێژەدا نمایشیان کرد؛ تەنها «مارکساندن»ی وێژە بوو، هەربۆیە گونجاوبوو کە پێشەکی نووسی ئەو کتێبەی گوتارەکانیانی تێدا کۆکرابوویەوە حوسێن مەڕوە بوو!

باشە، دیارە کە ئێستا پێویستمان بە خەستکردنەوەی وێنە گشتییەکەی ئەم بەشە هەیە هەتا نموونە و بەڵگەکان لەو دەزووە سەرقاڵمان نەکەن کە شتەکانمان لەیەک پرەنسیپدا بۆ ڕیز دەکات:

شیکارییەکەی ئیبن تەیمییەمان دیت سەبارەت بەوانەی کە پێیان خۆشە بە شتێک لە خەڵک جیاببنەوە جا حەزیان بەڕێگای لوولخواردووە کە زۆرینەی خەڵک تێیدا بەشداریان نەکەن، وە هەندێکیش خودپەروەری بەرەو ڕازیبوون و ڕەخنەنەگرتن پاڵیان دەنێت لەترسی ئەوەی پێیان بوترێت تێگەیشتنیان کورت و لاوازە، بینیشمان چۆن ئەبوو حامیدی غەزالی لە چاخی خۆیدا خەڵکانێکی تێبینی کردبوو کە لەبەر سەرسامیان بە زلکردنەوەی ناوی فەیلەسووفان بە کوفر و بێباوەڕی خۆیان دەڕازاندەوە.

بەلای دەستەواژەکەی فۆکۆش «تیرۆری ئاڵۆزی»دا تێپەڕین، لێدوانی ڕاشکاوانەی فەیلەسووف و فیزیایی و مێژوونووس و پسپۆڕ و ئەکادیمییە ڕۆژئاواییەکانمان بینی، سەبارەت بە ئاڵۆزی بەئەنقەستی دەقە فەلسەفییەکان، لە چەشنی گەواهیدانەکانی: برتراند ڕاسڵ، فیۆرباخ، سترۆک، سترۆمبێرگ، برینتۆن، سینگەر، و باری سمێث.

ئەوەشی کە ئەو فەیلەسووفانەی کە بەئەنقەست ئاڵۆزی دەسازێنن یاخود مەبەستیان وانیشاندانە کە قووڵ و تۆکمەن، یاخود شاردنەوەی ئەو کەلێنانەی دەقەکە کە باش بەبەڵگە نەسەلمێنراوە.

دیشمان چۆن مامۆستایانی فەلسەفە لە جیهانی عەرەبیدا سکاڵای

تێنەگەیشتنیان لە کتێبە فەلسەفییە وەرگێڕدراوەکان بۆ عەرەبی هەبوو، لە وێنەی سکاڵاکەی جابری و هاشم صالح و تەنانەت عوروەوی لە کتێبەکەی خۆی تێنەگەیشت کاتێک بۆ عەرەبی وەرگێڕدرابوو!

زۆر سەرنجڕاکێشیش ئەوەیە کە ستوونەکانی فەلسەفە و هزری جیهانی ڕۆژاوایی و عەرەبی هیچ گرفت و کەمییەکیان لەوەدا نەدیوە کە گلەیی ئاڵۆزی و ناڕوونی لە دەقی فەلسەفی بکەن! کەچی زۆرێک لە خوێنەرانی عەرەب وادەزانن کە ئەگەر هەر قسەیەک سەبارەت بە ئاڵۆزی هەر دەقێکی فەلسەفی بکەن ئەوە کەمی و لاوازی و نەخوێندەواری خۆیان دەنوێنێت! وادەزانن پێویستە لەسەریان وای نیشانبدەن کە لە کتێبە فەلسەفییەکان تێدەگەن تا بە تانە و تەشەری دەبەنگی و نازیرەکی نەکەونە شوێنیان!

ئەگەریش «هێزی کێشکردنی ئاڵۆزی» و «جادووی ناڕوونی» بخەینە ژێر هاوێنەی شیکاری زیاترەوە و لە گەڕان و دۆزینەوە بەردەوام بین کە: بۆچی هەندێک لە خوێنەران بۆی ملکەچ دەبن؟ دەکرێت بڵێین: دەروونی مرۆیی پاڵنەری زۆری بۆ ملکەچکردن و ڕادەستبوون هەیە، لەوانە پاڵنەری عەقڵی کە بەڵگەی ڕوون و فامکراو ڕایدەکێشێت، لەوانەش پاڵنەری جوانی کە چێژی دەروونی ڕایدەکێشێت هەرچەندیش لە ڕاستی واتاکەشی تێنەگات، ئەم کەمەندکێشبوونەش بۆ بۆیاخی زمانەوانی شێوەیی؛ ڕوواڵەتێکی تەرە و تاک نییە، بەڵکوو لە هەمان بواردا وێنەی زۆرە، لەوانە -بەنموونە- ئەوەی کە لە میانەی تێبینیکردنێکی کەسییەوە بۆ پێچکردنەوەی هزرییە ناوخۆییەکان ئەوەم بۆ درکاوەکە لاوانێکی چاو لەدووی ڕۆشنبیری هەن کە کتێبخانەکانیان بە کتێبە نوێگەرییەکان دەڕازێننەوە و زۆریشی لێ دەخوێننەوە و چاویان لەسەریەتی، هەست بە ملکەچییەکی ناوەکیش دەکەن لە وەختی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانیدا، لەبەر بەهێزی بەڵگە نا، بەڵکوو لەبەر کاردانەوە بۆ جوانی دەرهێنانی هونەری کتێبەکە، بەتایبەت لەو کاتەوە کە دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی کتێب شۆڕشیان

لە دیزاین و نەخشاندنی کتێبدا دەستپێکرد، بەڵکوو خودی خۆم چەند بەراوردکارییەکم لەنێوان شێوازی دەرهێنانی هونەری کتێبە نوێگەرییەکان و کتێبە کەلەپوورییەکاندا بیستووە، لەوانەیە ئێستا خوێنەریش شتێکی لەو جۆرەی بیستبێت کە لە ئەدەبیات و شێوازە بەکارهێنراوەکانی عەلمانییەت بۆ بچووککردنەوەی کتێبە شەرعییەکان؛ وەسفکردنیەتی بەڕەنگی کاغەزەکەی کە پێیدەڵێن «کتێبە زەردەکان»، ئەمەش بەناوبانگە، پێشتر وامدەزانی کە ئەم دیاردەیە لە کاردانەوە و کاریگەربوون بە دەرهێنانی هونەری کتێبە نوێگەرییەکان و کارکردنی ئەم شێوە چاپییانە لەسەر عەقڵی خوێنەر؛ دیاردەیەکی ساویلکانەی سەردەمییە، بەڵام چەند سەرم سوڕما کاتێک یەک لە زانایانی دێرینی سەدەی سێیەمی کۆچیم دی کە باسی لە هەمان دیاردە دەکرد:

«ئیبراهیمی سەنەدی جارێک گوتی: چەند پێم خۆشدەبوو ئەگەر زەندیقەکان پێداگر نەبوونایە لەسەر بەکارهێنانی کاغەزی پاکی سپی گرانبەها و هەڵبژاردنی حیبری ڕەشی گەشی قەترانی و لەبەرگرتنەوەی بە دەستوخەتی جوان و پارەدانێکی زۆر بە خەتخۆشان، بەڕاستی نە کاغەزی جوان و چاکی وەک کتێبەکانی وانم دیوە، نە خەتی وەک خەتی سەر ئەو کتێبانە جوان و چاک."[١]

ڕەواجی هزری عەلمانیش لە قاڵبی چاپەمەنی درەوشاوەدا، لەڕەواجی بەتاڵ و ناڕەواییەکان دەچێت لە قاڵبی وشەیی پاراودا، هەروەک -بەنموونە- چەمکە ڕۆحانییە لادەرەکان لە شیعری زوڵاڵی سۆفیگەریدا ڕەواجی پەیداکرد، پێشەوا ئیبن تەیمییە زۆر ئەوەی لەلا بە ئازار بووە هەروەک دەربڕینەکەی دەینوێنێت کە دەفەرمووێت (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

"ئیبن فاریض، لە کەسایەتییە دواییەکانی ئیتتیحادییەتە[٢]، خاوەن

---

(١) الجاحظ، "الحيوان"، تحقيق: عبد السلام هارون، الطبعة الثانية، (١٣٨٤هـ)، وعَنوَن المحقق رحمه الله لهذه الفقرة ب "حرص الزنادقة على تحسين كتبهم".

(٢) ئیتتیحادی یان حولوولی یان وەحدەتولوجوودی: ئەوانەی کە باوەڕیان بە تێکەڵبوونی

قەسیدەی تائی ناسراو بە (نظم السلوك) کە تێیدا ئیتتیحادی کردووە بە هۆنراوە، هۆنراوەیەکی شیرین و ڕاقی و بەرز، پیستر لە گۆشتی بەراز لەناو سینییەکی ئاڵتووندا."[١]

بەهەرحاڵیش، ئامانجی کرۆکی لە سەرجەم ئەم بەشە «ئازادکردن»ی خوێنەری عەرەب بوو لە شکانەوە و بەزین لە هەمبەر «دیکتاتۆرییەتی ئاڵۆزی»دا و پرچەککردنی بوو بە متمانە دژ بە ستراتیژییەتە ناپاکەکان لە قورسکردنی دەقی فەلسەفی و تەلیسماندنی نووسینە هزرییەکاندا، بۆ بەزۆر ملپێکەچکردنی خوێنەر لە ترسی تانەدان لە تێگەیشتن و تواناکانی، خۆ ئەگەر قوربانیانێکی زۆری فێڵ و پیلانەکانی تەماویکردن و سەرگەردانیهێنان و ناڕوونکاری ناو نووسینە هزری و فەلسەفییەکانم نەدیبا، ئەم بەشەم ئاوا تایبەت و دوورودرێژ بە بەڵگە و نموونەی زۆرەوە دانەدەمەزراند.

---

پەروەردگار لەگەڵ دروستکراوەکانیدا هەیە، پاکوبێگەردی بۆ الله.

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٤/٧٣).

# ١٢- ئایا موسڵمانان ئایینەکەیان ونکردووە؟

هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت وادەزانن کە هەرچی لاوازی و خوارییەک ئێمە ئەمڕۆ تێیداین تەنها بە هۆکاری بێئاگایی کۆمەڵگای موسڵمانەوە لە بنیادنانی دونیا هاتووەتە کایەوە، بەڵکوو یەک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت بەڕاشکاوی دەڵێت: "موسڵمانان ئەمڕۆ دواڕۆژیان ئاوەدانکردووەتەوە و دونیاکەیان ونکردووە" هەندێکیشیان دەڵێن: "گرفتێک کە بەرۆکی موسڵمانانی گرتووە لە لایەنی لاوازی دونیایانەوە هاتووە نەک لە لایەنی لاوازی ئایینیانەوە!" هەندێکیشیان دەڵێن: "موسڵمانان ئەمڕۆ هێندە لە بارەی دواڕۆژەوە زێدەڕەویان کرد، هەتا دواکەوتن." هەروەها وێنەی ئەم دەربڕینانە، ئەم وێنایەش لە تەوەرێتی مەدەنییەت و تێیدا زێدەڕەویکردنەوە سەری هەڵداوە.

ئەگەریش بێین و ئەم وێنایە بە بنچینەکانی وەحی بپێژین، ئەوکات دەردەکەوێت چەندێک فەرامۆشکردنی حەقیقەتەکانی قورئانی تێدایە کە ئەسڵەن خۆشویستنی دونیا و گرنگیپێدانی غەریزەیەکی قووڵی چەقێنراوە لە دەروونی مرۆییدا، بەپێی ڕێساکانی مێژووش ئەستەمە گەلانی ژمارە زۆر هەنگاوبنێن بەرەو دونیانەویستییەکی گشتی سەرتاسەری، هەروەک زێدەڕەوانی مەدەنییەت لەبارەی واقیعی کۆمەڵگای موسڵمانەوە وێنای دەکەن، قورئانیش ئەم غەریزە مرۆییەی باس لێفەرمووە: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ﴾ [آل عمران: ١٤] «ڕازێنراوەتەوە بۆ خەڵک خۆشویستنی ئارەزووەکان لە ئافرەت و کوڕوکاڵ و باروبنەی زۆروزەبەن لە زێڕ و زیو و هەروا ئەسپی نایاب و ماڵات و زەویوزار و کشتوکاڵ."

هەروەها دەفەرموویت: ﴿كَلَّا بَل تُحِبّونَ العاجِلَةَ﴾ [القيامة: ٢٠] «نەخێر، بەڵکوو ئێوە دونیای بەدەستوبردی ئێستاتان پێخۆشە.»

هەروەها دەفەرموویت: ﴿بَل تُؤثِرونَ الحَياةَ الدُّنيا﴾ [الأعلى: ١٦] «بەڵکوو ئێوە ژیانی دونیا هەڵدەبژێرن.»

بەڵکوو پاکترینی دەروونە مرۆییەکان کە بژار و پاکژکرنەوەی پەیامبەرییەتیشیان وەرگرتووە هەردەم سەرقاڵی تێکۆشان بوون لەگەڵ خۆیاندا لەدژی «هەڵبژاردنی ژیانی دونیا»، قورئانیش لە زۆر شوێندا ئاگاداری کردوونەتەوە لە ئاوڕدانەوە بەلای دونیادا کە ئەوان لەوپەڕی سەرقاڵی نایاب و ناوازەدا بوون بە پەرستش و جیهادەوە! کە بە هاوەڵانی موجاهید دەفەرموویت کاتێک کە تاویاندا بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوت: ﴿مِنكُم مَن يُريدُ الدُّنيا وَمِنكُم مَن يُريدُ الآخِرَةَ﴾ [آل عمران: ١٥٢] «تێتاندایە کە دونیای دەوێت وە تێشتاندایە کە دواڕۆژی دەوێت.»

توخوا وردبەوە چۆن ئاوا ئەوەیان پێدەڵێت و ئاگاداریان دەکاتەوە لە لاکردنەوەیان بەلای دونیادا، لە کاتێکدا ئەوان لە حاڵێکدا بوون کە دیمەنی «قوربانیدان بە گیان لە پێناو خوادا» و پێگەی «هاوەڵییەتی پێغەمبەری خوا»یان کۆکردبووەوە.

کاتێکیش دڵیان مەیلی بەلای ئاشتەوایی و فیدیەوەرگرتنەوە بوو، پێی فەرموون: ﴿ما كانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكونَ لَهُ أَسرى حَتّى يُثخِنَ فِي الأَرضِ تُريدونَ عَرَضَ الدُّنيا وَاللَّهُ يُريدُ الآخِرَةَ﴾ [الأنفال: ٦٧] «بۆ هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە دیل ڕابگرێت هەتا کوشتارێکی گەورە لە بێباوەڕان نەکات لە سەرزەویدا ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێت و خوداش دواڕۆژی دەوێت.»

کاتێکیش هەندێکیان جیهادیان لەسەر سەخت بوو پێی فەرموون: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا ما لَكُم إِذا قيلَ لَكُمُ انفِروا في سَبيلِ اللَّهِ اثّاقَلتُم إِلَى الأَرضِ أَرَضيتُم بِالحَياةِ الدُّنيا مِنَ الآخِرَةِ فَما مَتاعُ الحَياةِ الدُّنيا فِي الآخِرَةِ إِلّا قَليلٌ﴾ [التوبه: ٣٨] «ئەی

ئەوانەی باوەڕیانهێناوە چیتانە کە وەختێک پێتان دەوترێت دەرچن بۆ جیهاد لەپێناو خوادا گیانتان قورس دەبێت و دەنووسێن بە زەوییەوە ئەرێ ڕازیبوون بە ژیانی دونیا لەبری دواڕۆژ سا (بزانن) ژیانی دونیا لە چاو دواڕۆژدا تەنها شتێکی کەمی بێبەهایە.»

وەختێکیش لە دروشمەکانی حەج بوونەوە و دەستیانکردە پاڕانەوە لە پەروەردگار پێی فەرموون:

﴿فَإِذا قَضَيتُم مَناسِكَكُم فَاذكُرُوا اللَّهَ كَذِكرِكُم آباءَكُم أَو أَشَدَّ ذِكرًا فَمِنَ النّاسِ مَن يَقولُ رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنيا وَما لَهُ فِي الآخِرَةِ مِن خَلاقٍ﴾ [البقرة: ٢٠٠] «جا کاتێک کە پێگەکانی حەجتان بردەسەر و هێنایەجێ ئەوسا یادی پەروەردگار بکەنەوە بەوێنەی یادکردنەوەتان بۆ بابوباپیرانتان یاخود یادێکی بەهێزتر جا لە خەڵک هەیە کە دەڵێت پەروەردگارمان لە دونیا پێمان ببەخشە و لە دواڕۆژدا بەشێکی بۆ نییە."

جا ئەگەر «گەورە تەماشاکردنی دونیا» غەریزەیەکی داکوتراو بێت لە دەروونی مرۆییدا و پاکترین دەروونە مرۆییەکانیش کە پەروەردەی پێغەمبەرییان وەرگرتبێت سەلامەت نەبووبن لە لاکردنەوەی دڵ بەلای دونیادا و بێبەشبوون لە هەندێک بەشی دواڕۆژ لە هەندێک جێگادا، بەڵکوو لە مەزنترین پێگەکاندا کە جیهاد و حەجە، ئیدی چۆن زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی دەڵێن: "موسڵمانان ئەمڕۆ دواڕۆژیان ئاوەدانکردووەتەوە و دەستیان لە دونیا هەڵگرتووە بۆیە ئاوا دواکەوتوون؟!" ئەسڵەن ئایا ڕوودانی ئەمە مومکینە؟!

لەپاشان ئەگەر ڕاستیش بێت کە موسڵمانانی ئەمڕۆ دواڕۆژیان ئاوەدانکردووەتەوە وەک هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی دەڵێن، ئەوا ئەنجامی ئەوە لەدەستدانی دونیا نەدەبوو، بەڵکوو ئەنجامەکەی: سەرکەوتن و دەسەڵاتسەندن و دابارینی خێروبێری سامان و سەرچاوە سروشتییەکان دەبوو،

ئەم واتا پەنهانەش عەقڵی ماددی نایبڕێت، بەڵکوو تەنها دڵی باوەڕدار پەی پێ دەبات کە پڕبووبێت لە یەکلایی و دڵنیایی بەڕاستییەتی بەڵێنە خوداییەکان، هەرکەسیش پێچەوانەی ئەوە بڵێت؛ ئەوا ڕووبەڕووی چەسپاوەکانی وەحی بووەتەوە کە لە بەشی داهاتووشدا ئاماژە بە بەڵگەکانی دەکرێت.

# ١٣- دواخستنی ئەنجام و بەرهەمەکانی دامەزراویێتی

زۆرێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت هەوڵی ئەوە دەدەن کە فەرمانپێکراو و ڕێلێگیراوە شەرعییەکان تەنها بە بەهەشت و سەلامەتبوون لە دۆزەخ ببەستنەوە و پەیوەندی نەبێت بە بەختەوەری و بردنەوە و سەلامەتی دونیاییمانەوە، جا ئایین بۆ بنیادنانی دوارۆژە و مەدەنییەتیش بۆ بنیادنانی دونیا، یاخود وەک یەکێکیان دەڵێت: "ئایین مەرجە بۆ ڕزگاربوونی دوارۆژی نەک سەرکەوتنی دونیایی"، هەربۆیە هەندێکیان واهەست دەکات کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی کردارییانە پێویستی بە ئیسلام نییە بۆ چاکسازیکردن لە دونیایدا، بەڵکوو تەنها بۆ ڕزگاربوون لە دۆزەخ پێویستی پێیەتی، بەشوێنیشیدا هەندێکیان کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی بەو دەربڕینە عەبدەوییە ساویلکانەیە تاریف دەکات کە ئەوێ «ئیسلامێکە بەبێ موسڵمانان».

لە واقیعیشدا: ئەمە نەزانین و نەگەیشتنێکی بەئازارە لە ناوەڕۆک و واتاکانی وەحی کە ئاماژە بە لێکەوتە دونیاییەکانی پابەندبوونی ئایینی دەکەن کە هەرکەس لە دەقەکانی قورئان و کتێبەکەی پەروەردگار وردبێتەوە پێنج لێکەوتی دونیایی بۆ پابەندی و پێچەسپانی ئایینی دەبینێت: کە ئەوانیش: «گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی لە سەرزەویدا، جێگیربوونی ئاسایش لە وڵاتدا، خۆشگوزەرانی ئابووری، ئارامی دەروونی و سەلامەتبوون لە کارەساتەکانی خەشمی خودایی».

ئیدی چۆن لەپاش ئەمە بوترێت: ئایین تەنها بۆ بنیادنانی دوارۆژ و مەدەنییەت بۆ بنیادنانی دونیایە، یاخود بوترێت کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی پێویستی بە ئیسلام نییە بۆ چاکسازیکردن لە دونیایدا؟!

کە پەروەردگار بە شێوەیەکی یەکلای براوە کەرێژەیەتی و ڕێگاکانی لادانی واتا قەبووڵ ناکات هەواڵی ئەوەی پێداوین کە پێچەسپان؛ دەسەڵاتوەرگرتن و ئاسایشی بەشوێنەوەیە، هەروەک دەفەرموویت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنوا مِنكُم وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ لَيَستَخلِفَنَّهُم فِي الأَرضِ كَما استَخلَفَ الَّذينَ مِن قَبلِهِم وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُم دينَهُمُ الَّذِي ارتَضى لَهُم وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِن بَعدِ خَوفِهِم أَمنًا﴾ [النور: ٥٥] «پەروەردگار بەڵێنی داوە بەوانەی کە باوەڕیانهێناوە لە ئێوە و کاری چاکەیان کردووەکە، دەیانکاتە جانشین لە سەرزەویدا وەک چۆن ئەوانەی پێش وانی کردووەتە جانشین و ئەو ئایینەی کە خۆی پێی ڕازی بووە بۆیان دەگەیەنێتە دەسەڵات و هێز و لەپاش ترسیان دەیانگەیەنێت بە ئاسایش و ئارامی.»

ئەم وادە خودابیەشی لە ئایەتگەلێکی چەسپاوی زۆردا جەخت لێ کردووەتەوە، وەک ئەوەی کە دەفەرموویت: ﴿وَنُريدُ أَن نَمُنَّ عَلَى الَّذينَ استُضعِفوا فِي الأَرضِ وَنَجعَلَهُم أَئِمَّةً وَنَجعَلَهُمُ الوارِثينَ﴾ [القصص: ٥] "دەمانەوێت کە منەت بکەین بەسەر ئەوانەدا کە لە سەرزەویدا چەوساوە و لاوازکراون و بیانکەینە پێشەوا و بیانکەینە میراتبەر و جێگرەوە."

لە زۆر گرنگیدانی پەروەردگاریش بەم وادە خودابیەی خۆی هەواڵی ئەوەی پێداوین کە پەرتووکەکان و پێغەمبەران بەشوێنیەکدا جەختیان لێ کردووەتەوە، هەروەک دەفەرموویت: ﴿وَلَقَد كَتَبنا فِي الزَّبورِ مِن بَعدِ الذِّكرِ أَنَّ الأَرضَ يَرِثُها عِبادِيَ الصّالِحونَ﴾ [الأنبياء: ١٠٥] "بەڕاستی لە زەبووریشدا لەپاش لەوحی مەحفوز-پەڕاوی پارێزراو نووسیومانە کە زەوی؛ بەندە چاکەکانم دەیگرنەوە دەست.»

سەبارەت بە بەڵێنیدانیشی بە پێغەمبەرانی پێشووی دەفەرموویت: ﴿إِنَّهُم لَهُمُ المَنصورونَ(١٧٢) وَإِنَّ جُندَنا لَهُمُ الغالِبونَ﴾ [الصافات: ١٧٢ - ١٧٣] «بەڕاستی بەڵێنی ئێمە لەپێشدا بە بەندە نێردراوەکانمان دراوە کە هەر ئەوانن سەرخراوان.» .

هەروەها پەروەردگار سەرکەوتنی سەربازی بەسەر دوژمناندا بەستووەتەوە

بە ئاوەدانکردنەوەی دوارۆژەوە، نەک ئاوەدانکردنەوەی دوارۆژ هۆکاری شکان و بەزین بێت، هەروەک دەفەرموێت: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُركُم﴾ [محمد: ٧] «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ئەگەر (اللّٰە) سەربخەن ئەویش ئێوە سەردەخات.»

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ﴾ [الحج: ٤٠] «سوێندبێت کە پەروەردگار ئەوانە سەردەخات کە سەری دەخەن.»

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنّا لَنَنصُرُ رُسُلَنا وَالَّذينَ آمَنوا فِي الحَياةِ الدُّنيا﴾[غافر: ٥١] «بەڕاستی ئێمە پەیامبەرانمان و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە لە ژیانی دونیادا سەردەخەین ...»

هەروا دەفەرموێت: ﴿وَكانَ حَقًّا عَلَينا نَصرُ المُؤمِنينَ﴾ [الروم: ٤٧] «بەڕاستی کە ئەرک و حەق بوو لەسەر ئێمە سەرخستنی باوەڕداران.»

وتراوی ڕاشکاوی ناو وێنەی ئەم ئایەتانە ئەوەیە کە هەرکەس خودا سەربخات خودا سەری دەخات، فامراوی درکاویشی ئەوەیە کە ئەوەی خودا سەرنەخات، خودا دەستی لێ بەردەدات، ئەم تێگەیشتنەش تەنها بۆچوون و دیدێک نییە، بەڵکوو دەقی ئایەتانێکی چەسپاوی دیکەیە، لە وێنەی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار:

﴿وَما أَصابَكُم مِن مُصيبَةٍ فَبِما كَسَبَت أَيديكُم وَيَعفو عَن كَثيرٍ﴾ [الشورى: ٣٠] «هەرچییەکیشتان لە بەڵا و نەهامەتی تووش بێت بە بەرهەمی دەستی خۆتان تووشتان بووە و هێشتا پەروەردگار لە زۆریشی خۆش بووە.»

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمّا أَصابَتكُم مُصيبَةٌ قَد أَصَبتُم مِثلَيها قُلتُم أَنّى هذا قُل هُوَ مِن عِندِ أَنفُسِكُم﴾ [آل عمران: ١٦٥] «ئەرێ وەختێک نەهامەتییەکتان تووش هات کە دوو هێندەی ئەوە قازانج و خۆشیتان دیبێت پێشتر؛ دەڵێن ئەمە

لە کوێوە هاتووە؟ بڵێ ئەوە لەلای خۆتانەوە هاتووە (بە کاروکردەوەی خۆتان).»

ئەوەشی کە دەفەرموویت: ﴿وَما أَصابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَفسِكَ﴾ [النساء: ٧٩] «هەرچی ناخۆشییەکیشت تووش بێت لە خۆتەوەیە.»

جا کاتێک باوەڕدار ئەم چەسپاوە قورئانیانە و جار لەدوای جار دووپاتکردنەوەی پەروەردگار بۆی دەخوێنێتەوە؛ ئەوکات هەست بە ئازار دەکات کە دەبیستێت هەندێک لە لاوانی موسڵمان ئەوە دووبارە دەکەنەوە کە موسڵمانان دوارۆژیان ئاوەدانکردووەتەوە و دونیایان فەرامۆش کردووە.

هەروەها بەڵگەی زۆر لە وەحی ئەوەیان نیشانداوە کە دامەزران لەسەر ئایین خۆشگوزەرانی ئابووری و بووژانەوەی سەرچاوە سروشتییەکان دێنێت، وەک دەفەرموویت: ﴿وَلَو أَنَّ أَهلَ القُرى آمَنوا وَاتَّقَوا لَفَتَحنا عَلَيهِم بَرَكاتٍ مِنَ السَّماءِ وَالأَرضِ﴾ [الأعراف: ٩٦] «خۆ ئەگەر خەڵکی شارودێکان باوەڕیان بێنایە و لە خوا بترسانایە خێروبێری ئاسمان و زەویمان بەسەردا دەکردنەوە.»

قورئان عەقڵی ماددەگەری بەئاگاهێناوەتەوە و لەوەی ئاگادارکردووەتەوە کە دامەزراوێتی بە ڕێگایەک ڕۆزی دێنێت کە ئەسڵەن مرۆڤ هۆشی لای نییە و بە پێوانە و هەڵسەنگاندنە ماددییە پەتییەکان ناپێورێت کە لە ئاماژەیەکی ورددا دەفەرموویت: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجعَل لَهُ مَخرَجًا(۝) وَيَرزُقهُ مِن حَيثُ لا يَحتَسِبُ﴾ [الطلاق: ٢ - ٣] «هەرکەس لە (اللّٰه) بترسێت دەروویەکی لێ دەکاتەوە و ڕۆزی دەدات بە جۆرێک کە خۆشی هۆشی لا نەبێت و ئەژماری نەکات."

ئەمەش دۆخێکی گشتییە لە ئوممەتانی پێشووشدا کە پەروەردگار بە هاوەڵانی دوو پەرتووکەکەش دەفەرموویت: ﴿وَلَو أَنَّهُم أَقامُوا التَّوراةَ وَالإِنجيلَ وَما أُنزِلَ إِلَيهِم مِن رَبِّهِم لَأَكَلوا مِن فَوقِهِم وَمِن تَحتِ أَرجُلِهِم﴾ [المائدە: ٦٦] «خۆ ئەگەر ئەوان تەوڕات و ئینجیل و ئەوەی دابەزێنرابووە سەریان کار پێ بکردایە و ڕابگرتایە؛ ئەوسا لە سەرەوە و لە ژێر قاچەکانیشیانەوە خێروبێریان دەدی و

دەخوارد.»

نووحیش (سەلامی خوای لێ بێت) بە گەلەکەی فەرموو: ﴿فَقُلتُ استَغفِروا رَبَّكُم إِنَّهُ كانَ غَفّارًا(۝) يُرسِلِ السَّماءَ عَلَيكُم مِدرارًا(۝) وَيُمدِدكُم بِأَموالٍ وَبَنينَ وَيَجعَل لَكُم جَنّاتٍ وَيَجعَل لَكُم أَنهارًا﴾ [نوح: ١٠ - ١٢] «جا وتم داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن کە بەڕاستی ئەو زۆر لێبوردەیە، ئەوسا ئاسمانتان بە بارانی بەخوڕ و بەردەوامەوە بۆ دەجمێنێت، و ماڵ و سامان و کوڕوکاڵتان پێ دەبەخشێت و باخ و بێستان و ڕووبار و ئاوتان بۆ دادەمەرزێنێت.»

هود (سەلامی خوای لێ بێت) بە گەلەکەی فەرموو: ﴿وَيا قَومِ استَغفِروا رَبَّكُم ثُمَّ توبوا إِلَيهِ يُرسِلِ السَّماءَ عَلَيكُم مِدرارًا وَيَزِدكُم قُوَّةً إِلى قُوَّتِكُم﴾ [هود: ٥٢] «ئەی گەلی خۆم لە پەروەردگارتان داوای لێخۆشبوون بکەن و لەپاشان بۆ لای بگەڕێنەوە ئەوسا ئاسمانتان بە بارانی بەخوڕ و بەردەوام بۆ دەجمێنێت و هێزی دیکەتان لەسەر هێزی خۆتان بۆ زیاد دەکات.»

جا ئەمە چەسپاوە ڕاشکاوەکانی وەحین کە لەسەر زمانی پێغەمبەران هاتووە کە جەخت لەوە دەکاتەوە کە پێچەسپانی ئایینی لە مەزنترین هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی ئابووری و دەوڵەمەندی سەرچاوەکانە، منیش کە خەریکم ئەم ئایەتانە دەهێنمەوە و ڕیز دەکەم، تەواو درک بەوە دەکەم کە ئەو عەقڵە ماددییەی بە ڕۆشنبیری تازەی ڕۆژئاوایی گۆشبووە توانا و بەرگەی تێگەیشتنی ئەم وادە خوداییانە نییە، تەنهاش بیر لە میکانیزمە بەرجەستەکان دەکاتەوە، ئەوەشی لەسەر ئێمەیە ئەوەیە کە نەکەوینە شوێن ئەم عەقڵانە و پێکهاتەی پێکدادەریان لەگەڵ شوێنەوارەکانی ئیمان، لەسەرمانە چەندی دەتوانین بە وەحی ڕۆشنیان بکەینەوە و ڕێگای بژار و پاکژبوونەوەی دەروونیان نیشان بدەین، تاکوو عەقڵیان بتوانێت لە کونجی ماددیگەرایی ڕووکارییەوە بەرەو لوتکەکانی وادە خوداییەکان هەنگاو بنێت، ئەوسا لە بەڵێنەکانی (اللّٰه) دڵنیا بێت کە کێ

ڕاستگۆتر و بەڵێن قایمترە لە (اللّٰه)ی بەرز و مەزن و بەدەسەڵات، هەربۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن أَوفى بِعَهدِهِ مِنَ اللَّهِ﴾ [التوبه: ١١١] «ئەوجا کێ لە (اللّٰه) باشتر بەڵێنی خۆ دەباتەسەر.»

دیسان بەڵگەکانی وەحی ئەوەیان خستووەتەڕوو کە بوونی کەلێن و گرفت لە ئاییندارێدا لە مەترسیدارترین هۆکارەکانی کارەساتە مەزنە پەیدابووەکانی خەشمی خودابییەوە، ئەم ڕاستییەش زۆرێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت خۆیانی لێ دەدزنەوە و هەوڵی لادانی واتاکەی دەدەن و بۆڵەیان دێ لەوەی کە کارەساتەکان بە سزای خوایی لێکبدرێنەوە، هەمیشەش هەوڵدەدەن سزای کەمتەرخەمی ئایینی تەنها بە سزایەکی دواڕۆژی نیشان بدەن، بەڵام دونیا بە ڕێساگەلێکی سروشتی بەستراوەتەوە کە هیچ پەیوەندی بە ئەم لێکدانەوە پەنهانانەوە نییە، هەندێکیشیان گەیشتووەتە ئاستێکی توندڕەو لەوەدا و تەنانەت ئەوە بە لێکدانەوەیەکی میتۆلۆجی ناو لێ دەنێت، واتە ئەفسانەیی و خوڕافی.

واقیعیش ئەوەیە کە: ئەم وێناکردنە فەرامۆشکردن و بزرکردنی یەک لە تەوەرە قورئانییەکانی لەخۆگرتووە لە وێناکردنی مێژوودا کە قورئان لە ئایەتانێکی چەسپاوی ڕاشکاودا ئەوەی باس لێفەرمووە کە کەمتەرخەمی ئایینی دوو سزای هەیە دونیایی و دواڕۆژیش، هەردوو جۆر سزاشی خستووەتەڕوو، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿فَأَمَّا الَّذينَ كَفَروا فَأُعَذِّبُهُم عَذابًا شَديدًا فِي الدُّنيا وَالآخِرَةِ﴾ [آل عمران: ٥٦] «جا ئەوانەی کە بێباوەڕبوون سزایەکی توندیان دەدەم لە دونیا و لە دواڕۆژدا.»

لە شوێنێکی دیکەشدا ئاماژە بە دوو جۆرەکەی سزا دەکات کە دەفەرمووێت: ﴿لَهُم عَذابٌ فِي الحَياةِ الدُّنيا وَلَعَذابُ الآخِرَةِ أَشَقُّ﴾[الرعد: ٣٤] «سزایەکیان هەیە لە ژیانی دونیادا سوێندبێت سزای دواڕۆژیش سەختترە.»

لەم سزا دونیاییانەش کارەساتە سروشتییەکان و گرانی و وشکبوونی سەرچاوەکان و تێکچوونی ئارامی و ئاسایش و زۆری دیکەش جگە لەمانەن، هەروەک دەفەرموویت: ﴿ظَهَرَ الفَسادُ فِي البَرِّ وَالبَحرِ بِما كَسَبَت أَيدِي النّاسِ لِيُذيقَهُم بَعضَ الَّذي عَمِلوا لَعَلَّهُم يَرجِعونَ﴾[الروم: ٤١] «خراپە و نەهامەتی لە وشکانی و دەریادا سەری هەڵداوە بە بەری دەستی ئەو خەڵکە تاکوو هەندێک لەوەی کردوویانە پێیان بچێژێت، تاکوو هۆیەک بێت بگەڕێنەوە.»

پەروەردگار نموونەمان بۆ دێنێتەوە لە ڕۆڵی لادان و ڕێونکردنی ئایینی لە هەڵگرتنی خۆشگوزەرانی و ئاسایشدا، هەروەک دەفەرموویت: ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَريَةً كانَت آمِنَةً مُطمَئِنَّةً يَأتيها رِزقُها رَغَدًا مِن كُلِّ مَكانٍ فَكَفَرَت بِأَنعُمِ اللَّهِ فَأَذاقَهَا اللَّهُ لِباسَ الجوعِ وَالخَوفِ بِما كانوا يَصنَعونَ﴾ [النحل: ١١٢] «پەروەردگار دێیەکی بەنموونە هێنایەوە کە ئارام و دڵنیابوو ڕۆزی خۆی بە خۆشی و فراوانی بۆ دەهات لە هەموو جێیەکەوە، جا بێباوەڕ و پێنەزان بوون بە نیعمەتەکانی خودا سا خوداش بەرگی برسیێتی و ترسی بەبەرداکردن بە کردەوە و خووی خۆیان.»

ئەوەتا دەبینین سزا دونیاییەکان بەرانبەر بە لادانی ئایینی لێکدانەوەیەکی میتۆلۆژی یاخود خورافی نین، بەڵکوو یەک لە پێکهاتە سەرەکییەکانی بزاڤی مێژووە لە وێنا و دیدی قورئانیدا.

هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتیش بانگەشەیەک دەڵێنەوە کە بە پوختی دەڵێت: "زوو سزادانی خودایی لە دونیادا حاڵەتێکی جیاواز و هەڵاوێرتەیە، نەک دیاردەیەکی هەمیشەیی مێژوویی." لەڕاستیشدا: فەوتاندنی گەلانی ملهوڕی پشتکردوو لە وەحی و گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرانی و زوو سزادانیان حاڵەتێکی هەڵاوێرتە و جیاواز نییە لە ڕەشنووسی مێژوودا، یاخود ڕووداوێکی نەشاز و نانەریتی، بەڵکوو پێدراوە مێژووییەکان کە قورئان پێشکەشیان دەکات وا دەنوێنن کە ئەوە هەر بەڕاست دیاردەیەکی مێژووییە! وەک دەفەرموویت:

﴿وَكَم أَهلَكنا مِنَ القُرونِ مِن بَعدِ نوحٍ﴾ [الإسراء: ١٧] «چەندمان نەوە و چاخ لەناوبرد لەپاشی نووح.»

پەروەردگار باس لە ئوممەتانی پێشوو دەکات کە چۆن بە هەردوو جۆری سزای دونیایی و دوارۆژی سزای داون، دەفەرموویت: ﴿كَذَّبَ الَّذينَ مِن قَبلِهِم فَأَتاهُمُ العَذابُ مِن حَيثُ لا يَشعُرونَ(٢٥) فَأَذاقَهُمُ اللَّهُ الخِزيَ فِي الحَياةِ الدُّنيا وَلَعَذابُ الآخِرَةِ أَكبَرُ﴾ [الزمر: ٢٥ - ٢٦] «ئەوانەی پێش ئەوانیش هەر بەدرۆیان خستەوە جا سزا بە جۆرێک بۆیان هات کە هەستیشیان پێ نەدەکرد، سا خوا لە ژیانی دونیادا ڕسوایی پێ چەشتن سوێند بێت سزای دوارۆژیش ڕسواکەرترە.

لەپاشان ئەم گەلانەی پێشوو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا توانای مەدەنی و هێزی ئابووری و سەرچاوەی بێشوماریان هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا وەختێک پەروەردگار لێیان تووڕەبوو، زووبەزوو سزای دونیایی بە تاوانی خۆیان نارده سەریان، وەک دەفەرموویت: ﴿أَلَم يَرَوا كَم أَهلَكنا مِن قَبلِهِم مِن قَرنٍ مَكَّنّاهُم فِي الأَرضِ ما لَم نُمَكِّن لَكُم وَأَرسَلنَا السَّماءَ عَلَيهِم مِدرارًا وَجَعَلنَا الأَنهارَ تَجري مِن تَحتِهِم فَأَهلَكناهُم بِذُنوبِهِم﴾[الأنعام: ٦] «ئەرێ نەیاندیوە چەندمان نەوە بەر لەوان لەناوبردووە کە لە سەرزەویدا دەسەڵات و پێقایمییەکمان پێدابوون کە بە ئەمانمان نەداوە و ئاسمانمان بە بارانی بەخوڕ و بەردەوام بۆ جماندوون و ڕووبارمان لە ژێر پێیانەوە خستووەتەڕێ، ئەوجا بە تاوانی خۆشیان لەناومان بردن.»

قورئان هەندێکیش لە سزای ئوممەتانی پێشوو نمایش دەکات، دەفەرموویت: ﴿فَكُلًّا أَخَذنا بِذَنبِهِ فَمِنهُم مَن أَرسَلنا عَلَيهِ حاصِبًا وَمِنهُم مَن أَخَذَتهُ الصَّيحَةُ وَمِنهُم مَن خَسَفنا بِهِ الأَرضَ وَمِنهُم مَن أَغرَقنا﴾[العنكبوت: ٤٠] «سا هەموویمان بە تاوانی خۆی برد و گرت، جا هەیانبوو کە بەردەبارانمان کردن و هەیانبوو ناڵە بردنی و هەیانبوو بەزەویدا نغرۆمان کردن و هەشیانبوو (لە ئاودا) خنکاندنمان.»

بنوارە لەو دیمەنی وێرانییە سامناکەش کە قورئان وێنای دەکات کە

دەفەرمووێت: ﴿فَكَأَيِّن مِن قَريَةٍ أَهلَكناها وَهِيَ ظالِمَةٌ فَهِيَ خاوِيَةٌ عَلى عُروشِها وَبِئرٍ مُعَطَّلَةٍ وَقَصرٍ مَشيدٍ﴾ [الحج: ٤٥] «زۆرن ئەو دێیانەی لەناومان بردن کە ستەمکار بوون سا بەسەر سەقفی خۆیاندا خاپوور و وێرانەن بیرەکانیان لەکارکەوتوو و ئاولێنەبراو و کۆشکە بەرز و تۆکمەکانیشیان سزای (الله)ی لێ لانەدان.»

جا ئەم دیدەی کە وابەستەبووانی مەدەنییەتی ماددی وێنای دەکەن کە ئەوە لە خۆدەگرێت کە باوەڕ و کاری چاکە و بەندایەتی شوێنەواری کۆمەڵایەتی دەرەکی «بەرجەستە و جیا»ی نییە، بەڵکوو شوینەوارەکانی تەنها خودی «تایبەت»ن کە ئەمەش وێنایەکی دژبەرە لەگەڵ چەسپاوە قورئانییەکاندا کە خرانەڕوو، پێشەوا ئیبن تەیمییەش ئاماژەی بە هەندێک لەوە کردووە کە لە سەفەدییەدا دەفەرمووێت:

«سا بەیەکلایی زانراوە لە گواستنەوەی دەماودەمی موتەواتیر و ئەزموونی بەناوبانگەوە کە کردەوە چاکەکان شتانێکی بەرجەستە لە خێر و خۆشی دێنن لە دونیادا، کردەوە خراپەکانیش پێچەوانەکەی دێنن، پەروەردگاریش موشریکان و تاوانکاران و ستەمکارانی ئەشکەنجەداوە، چەشنی گەلی عاد و سەموود و لوط و خەڵکی مەدیەن و فیرعەون، بە سزای بەرجەستە و بینراو لە دەرەوەی خودی خۆیاندا، هاوەڵانی دادپەروەری و چاکەکاریشی بە ڕێزلێنانی جۆراوجۆری بینراو ڕێز لێناوە، ئەمەش شتێکە کە سەرجەم گەلان دانی پێدا دەنێن، ئیدی چۆن دەوترێت پەرستشەکان و گوێڕایەڵییەکان مەبەست لێی تەنها ئەو ڕەوشتچاکییەیە کە لە دەروونددا دێتەبوون."[١]

جا ئەم بانگەشەیەی کە ئیبن تەیمیە وتووێژی لەسەر دەکات؛ ئەوە جەخت لێ دەکاتەوە کە ئەم تێزە ساختەیە تێزێکی کۆن و دێرینە.

---

(١) ابن تيمية، "الصفدية"، تحقيق: محمد رساد سالم، دار الهدي النبوي، الطبعة الأولى، (١٤٢١هـ): (٢/٢٣٨).

بەڵکوو لە ئاگاداریدانە ناوازەکانی پێشەوا ئیبن تەیمییە ئەوەیە کە پەیوەندی نێوان «حوکمکردن بە شەریعەت» و «ئارامیی سیاسی» باس لێ دەکات کە دەفەرموویت (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

"وەختێکیش کاربەدەستان لەمە دەرچوون، ئەوا حوکمیان بە جگە لەوە کردووە کە پەروەردگار دایبەزاندووە، شەڕ و ململانێشیان دەکەوێتە نێوان خۆیانەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: «خەڵکێک حوکم ناکەن بە جگە لەوەی کە خوا دایبەزاندووە، مەگەر ئاژاوە و شەڕیان دەکەوێتە ناوخۆیانەوە.» ئەمەش لە گەورەترین هۆکارەکانی گۆڕان و لەبنهاتنی دەوڵەتانە کە وێنەی ئەوە جار لەدوای جار، لە سەردەمی خۆمان و جگە لە سەردەمی خۆشماندا ڕوویداوە."[1]

جا ئەگەر دامەزراوییەتی ئایینی هەموو ئەم بەرهەمە دونیاییە زیندووانەی پێوە وابەستە بێت دروستە موسڵمان لە پاش ئەوە بڵێت: موسڵمانان دواڕۆژیان ئاوەدانکردووەتەوە و دونیایان فەرامۆش کردووە، یاخود ئایین مەرجی ڕزگاربوونە نەک ڕابوون؟

لەوەشی کە زۆر پەیوەندی توندی بەم دیدەوە هەیە ئەوەیە کە هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت خۆیان لەوە لادەدەن کە وەها لە هێزی بێباوەڕان بنوارن کە جۆرێکە لە داونانەوە و پەت شلکردنی خودا بۆیان، وایان پێخۆشە وای لێ بڕوانن کە ئەنجامێکی سروشتی هەوڵ و ماندووبوونیانە کە شایانی بەرهەمەکەین، نەک گلدانەوەی هۆکارێکی زیاتر بێت لە هۆکارەکانی سزای خوایی!

لەواقیعیشدا: لە دیارترین ڕێساکانی مێژوو کە وەحی بۆی نەخشاندووین ڕێسای پەت بۆ شلکردن و ڕاکێشانی خوداییە کە هێزی ماددی و زەبەلاحبوونەوەی تواناکانی نێودەستی بێباوەڕان جۆرێکە لەوە، هەروەک پەروەردگار دەفەرموویت:

---

(١) ابن تيمية، "مجموع الفتاوى": (٣٥/٣٨٨)

﴿وَالَّذينَ كَذَّبوا بِآياتِنا سَنَستَدرِجُهُم مِن حَيثُ لا يَعلَمونَ(١٨٢) وَأُملي لَهُم إِنَّ كَيدي مَتينٌ﴾ [الأعراف: ١٨٢ - ١٨٣] «ئەوانەشی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆخستەوە بە جۆرێکیان ڕادەکێشین بۆخۆشیان نەزانن، پەتیشیان بۆ شل دەکەم بەڕاستی کە پیلانی من تۆکمە و قایمە.»

سەبارەت بەوانەشی کە ئەم وەحیەیان بەدرۆخستووەتەوە دەفەرمووێت: ﴿فَذَرني وَمَن يُكَذِّبُ بِهذَا الحَديثِ سَنَستَدرِجُهُم مِن حَيثُ لا يَعلَمونَ﴾ [القلم: ٤٤] «لێمگەڕێ من و ئەوانەی کە ئەم باسە (وەحییە) بەدرۆدەخەنەوە بە جۆرێک ڕایاندەکێشین بۆخۆشیان نەزانن.»

پەروەردگار چمکێک لە جۆرەکانی ئەم مۆڵەتدان و داونانەوانەی بۆ باسفەرمووین کە دڵی باوەڕدار لێی دەلەرزێت، دەفەرمووێت: ﴿فَلا تُعجِبكَ أَموالُهُم وَلا أَولادُهُم إِنَّما يُريدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِها فِي الحَياةِ الدُّنيا﴾[التوبه: ٥٥] «سا نە ماڵ و سامان و نە منداڵی زۆریان سەرسامت نەکات، خودا تەنها دەیەوێت بەوە لە ژیانی دونیادا ئەشکەنجەیان بدات.»

بەڵکوو لەم دیمەنە ترسناکە ڕابمێنە کە پەروەردگار هەواڵ لەوە دەدات کە هەموو خۆشییەک بە پشتکردووان دەدات لەپاشان لەناکاوێکیش بە سزا دەیانبڕسکێنێت، وەک دەفەرمووێت: ﴿فَلَمّا نَسوا ما ذُكِّروا بِهِ فَتَحنا عَلَيهِم أَبوابَ كُلِّ شَيءٍ حَتّى إِذا فَرِحوا بِما أوتوا أَخَذناهُم بَغتَةً﴾ [الأنعام: ٤٤] «جا کاتێک ئەوەیان لەیادکرد کە بیریانخرابووەوە، دەرگای هەموو بەخششێکمان لێ کردنەوە هەتا ئەوەی کە دڵیان خۆش بوو بەوەی پێیان دراوە ئەوسا لە ناکاو گرتمانن.»

دەشفەرمووێت: ﴿وَلَقَدِ استُهزِئَ بِرُسُلٍ مِن قَبلِكَ فَأَملَيتُ لِلَّذينَ كَفَروا ثُمَّ أَخَذتُهُم فَكَيفَ كانَ عِقابِ﴾ [الرعد: ٣٢] «جا مۆڵەتم دا بەوانەی بێباوەڕ بوون و پەتم بۆ شلکردن، ئەوجا گرتمن و لەناومبردن سا چۆن سزایەک بوو سزای من.»

جارێکیش گوێم لەیەک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی بوو دەیگوت:

ئەم وتاربێژانەی سەر مینبەرەکان دەمێکی درێژە بەڵێنی ئەوەمان دەدەنێ کە خودا بێباوەڕان لەناودەبات و ئیسلام سەردەخات، هیچیشمان نەدی! بەڵکوو بەردەوام دەبینین بێباوەڕان لە پێشکەوتن و موسڵمانان لە پاشەکشێدان، هەروەها ئیسلامییەکان دەڵێن کڕین و مامەڵە بە خێروبێرە و ڕیبا بێفەڕە، کەچی نەمانبینی ئابووری ڕیبایی ڕۆژاوایی جگە لە گەشەسەندن بەخۆوە ببینێت، ئابووری ئێمەش هەر دادەڕووخێت، ئیدی چەند نموونەیەکی لەم وێنەیە باسکرد.

ڕاستی بەئازاریش ئەوەیە کە: ئەم بەڵێنیدانە بە سەرکەوتنی ئیسلام و ئەم هەڕەشەکردنە بە کەوتنی کوفر؛ کەیسێکی هزری نییە کە ئیسلامییەکان هێنابێتیان، بەڵکوو ئەوە بەڵێن و هەڕەشەیەکی «خوداییە»، پەروەردگار پێغەمبەرانی ئاگادارکردووەتەوە کە دووچاری وێنەی ئەم ڕەخنەگیرییانە دەبنەوە کە ئاخنراوە بە گاڵتەهاتن بە بەڵێن و هەڕەشەی (اللّٰه)، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَلَئِن أَخَّرنا عَنهُمُ العَذابَ إِلى أُمَّةٍ مَعدودَةٍ لَيَقولُنَّ ما يَحبِسُهُ أَلا يَومَ يَأتيهِم لَيسَ مَصروفًا عَنهُم﴾ [هود: ٨] «خۆ ئەگەر سزایان لێ دوابخەین هەتا کاتێکی دیاریکراو، ئەو وەخت دەڵێن ئەرێ چی سزای لێ ڕاگرتووین؛ بەڕاستی ڕۆژێک کە دێتە سەریان لاچوونی بۆ نییە.»

گاڵتەکردن بە وادەی خوداش یەک لە پشکە ترسناکەکانی دووڕووییە، هەروەک دەفەرمووێت: ﴿وَإِذ يَقولُ المُنافِقونَ وَالَّذينَ في قُلوبِهِم مَرَضٌ ما وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسولُهُ إِلّا غُرورًا﴾ [الأحزاب: ١٢] «وەختێکیش دووڕووان و ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە، دەیانگوت: وادەدانی خودا و پێغەمبەرەکەی جگە لە فریو هیچی دی نەبوو.»

لەبەر توندی کاریگەری ئەم قسانەش لەسەر شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، پەروەردگار جەختی لە بەڵێنەکەی کردووەتەوە، دەفەرمووێت: ﴿فَلا تَحسَبَنَّ اللَّهَ

مُخلِفَ وَعدِهِ رُسُلَهُ﴾ [إبراهيم: ٤٧] «جا وامەزانە (اللّٰە) بەڵێنێک کە بە پێغەمبەرانی داوە نایباتەسەر.»

بەتایبەت بەڵێن و هەڕەشەی پەروەردگار زۆرجار لە ساتە ناهەموارەکاندا دێت، یاخود لە دیمەنی کۆتاییدا کاتێک ڕێسای تاقیکردنەوە و پاڵفتەبوون هاتەجێ و باوەڕدار بە ساتی ئەوپەڕی سەختی گەیشت، وەک دەفەرمووێت: ﴿حَتّى إِذَا استَيأَسَ الرُّسُلُ وَظَنّوا أَنَّهُم قَد كُذِبوا جاءَهُم نَصرُنا﴾ [يوسف: ١١٠] «هەتا کاتێک کە پێغەمبەران بێئومێد بوون و دڵنیا بوون لەوەی ئیدی گەلەکانیان بەیەکجاری و کۆتایی بەدرۆیان خستوونەتەوە ئەو وەخت سەرخستنی ئێمەیان بۆ هات.»

پەروەردگار ئاگاداری لەوە داوە کە باوەڕدار دەکرێت خودا تەمەنی بدات هەتا تەواوی سەرەنجامەکە بە چاوی خۆی دەبینێت، لەوانەشە بەر لەوە گیانی بکێشێت، بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا وادەی خودا هەر دێتە جێ، هەروەک لە سێ شوێن لە پەرتووکەکەیدا باسی لەوە فەرمووە، دەفەرمووێت: ﴿فَاصبِر إِنَّ وَعدَ اللَّهِ حَقٌّ فَإِمّا نُرِيَنَّكَ بَعضَ الَّذى نَعِدُهُم أَو نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَينا يُرجَعونَ﴾ [غافر: ٧٧] «سا ئارام بگرە کە بەڕاستی وادەی خودا حەق و ڕاستە کە ئەگەر هەندێک لەوەی بەڵێنیمان بەوانە داوە نیشانت بدەین، یاخود گیانت بکێشین، خۆ هەر بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەیان.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَإِن ما نُرِيَنَّكَ بَعضَ الَّذى نَعِدُهُم أَو نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّما عَلَيكَ البَلاغُ وَعَلَينَا الحِسابُ﴾ [الرعد: ٤٠] «خۆ ئەگەر هەندێک لەوەی بەڵێنیمان بەوانە داوە نیشانتی بدەین، یان گیانت بکێشین تۆ تەنها گەیاندت لەسەرە و ئەژمار و پاداشیش لەسەر ئێمەیە.»

دەشفەرمووێت: ﴿وَإِمّا نُرِيَنَّكَ بَعضَ الَّذى نَعِدُهُم أَو نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَينا مَرجِعُهُم ثُمَّ اللَّهُ شَهيدٌ عَلى ما يَفعَلونَ﴾ [يونس: ٤٦] «خۆ ئەگەر هەندێک لەوەی بەڵێنیمان بەوانە

داوە نیشانتی بدەین، یان گیانت بکێشین، گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمەیە و ئەوجا (اللّٰه) بۆخۆی شاهێدە لەسەر ئەوەی کە دەیکەن.»

هەروەها بەندە باوەڕدارەکانی هۆشیاری پێداوە کە ئەم مۆڵەتدانە خودایییە دانایییگەلێکی مەزنی لەپشتەوەیە، نەک دەستەوەستانی بێت لە پەروەردگارەوە -پاکوبێگەردی بۆ (اللّٰه) لەوە- وەک دەفەرموویێت: ﴿لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [النور: ٥٧] «وا مەزانە ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون لەسەر زەویدا ئێمەیان دەستەوەستان کردبێت.»

لەبەر سەختیی ئاشووب و تاقیکرانەوەش بە بەردەوامی بێباوەڕان لە هاتن و چوون و کەشوفشکردن لەوپەڕی هێزی خۆیاندا، قورئان ئاماژەی بە نەخەڵەتان بەم حاڵە کردووە کە دەفەرموویێت: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ [آل عمران: ١٩٦] «هاتووچۆ و هێزی بێباوەڕان لە وڵاتاندا فریوت نەدات.»

لەبەر هەموو ئەمەش؛ پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین کە نموونەی ئەم پرسیارە ئاخنراوانە بە خاووخلیچک ڕووانین لە بەڵێن و هەڕەشەی خودا؛ بەوە وەڵام بدەینەوە کە پرسەکە تەنها «پرسی کاتە»، دەفەرموویێت: ﴿قُلۡ كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ فَتَرَبَّصُوا فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾[طه: ١٣٥] «بڵێ هەموو لە بۆسەدان، ئێوەش لەبۆسە و چاوەڕوانیدا بن، جا دەزانن کێیە لەسەر ڕێگەی ڕاستە و کێیە ڕێنومایی ڕەوای وەرگرتووە.»

# ١٤- هەژموونی جەماوەر

لەڕاستیدا: هەرکەس لە تەواوی ئەم کەیسانە ڕابمێنێت کە لە بەشەکانی ڕابردوودا وتووێژمان لەسەر کردوون، تێبینی ئەوە دەدات کە هەندێک لەوانەی خۆیان دەدەنەپاڵ بانگەواز؛ نیازپاکانە تووشی هەندێکی هاتوون، لەژێر پەستانی تامەزرۆییبیەکی بێپایان بۆ: ڕێنومابیکردنی خەڵک، ڕاکێشانی دڵیان، خۆشەویستکردنی چاکە لەلایان، نزیکبوونەوە لێیان و لە دەلاقەیەکی دۆستانە و گونجاوەوە چوونە ناو دڵیان کە ئومێدمان وایە کە نموونەی ئەم بانگخوازانە لەژێر چەتری عوزر و لێخۆشبوونی خواییدا بن و پەروەردگار گوزەر لەو هەڵانەیان بکات کە بە نیازی پاکەوە کردوویانە.

بەڵام ئومێد و ئامانج هەمیشە لەسەر ئامۆژگاریکردن بە حەق و بە ئارامگری هەڵدەچنرێت، تاوەکو بانگخواز نەکەوێتە داوی شەرمکردن و خۆدزینەوە لەڕاستییەکانی وەحی بۆ خاترگرتنی دەزگاکانیراگەیاندن، یاخود دەستدان لە پشتی سەلیقەی تازەی جەماوەری.

چەندێک سەرسام دەبووم هەمیشە کە لە ئایەتەکانی قورئان ڕادەمام کە زۆر ئاگادارکردنەوەی پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەکەی تێدابوو لە مەترسییەکانی کەوتنەژێر «هەژموونی جەماوەر»ەوە. ڕاستیش: زۆرێک وا دەزانن کە ململانێ لەگەڵ ئارەزوودا تەنها بریتییە لە ململانێکردن لەگەڵ ئارەزووی کەسیدا و بەس، بەڵام ململانێی گەورەتر لەوەش لە ڕێگای کادیرانی ئیسلامدا هەیە، ململانێ لەگەڵ «ئارەزووی بانگهێشتکراوان»دا و تامەزرۆبوون بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و هاوسۆزییان بۆ ئیسلام، بگرە هەندێکجار کاریگەریی ئارەزووی جەماوەر توندترە لە کاریگەریی ئارەزووی سیاسییەکانیش بەهۆی شاراوەیەتییەکەیەوە،

دەستگیرۆییکراویش ئەو کەسەیە کە دوژمنی نەفسی خۆی بێت و چاودێری بکات، وەک پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرموویت: "جا پێویستە لەسەر مرۆڤ کە خۆی ڕابهێنێت لەسەر تێگەیشتنی ناوەکی لە دڵی خۆی "[1]

هیچ ئاشووبێک لەوە گەورەتر نییە کە پەروەردگار پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لێ ئاگادارکردووەتەوە کە ئاشووبیراکێشانی بانگکراوان و ملدان بۆ هەوەسی ڕاسپێردراوان-موکەلەفان و توانەوە لەژێر پەستانی نەریت و دابیاندا و ئاراستەکردنی ڕێنماییە خوداییەکانە بەو شێوەیەی ئەوان مەیلیان بەلایدا هەیە و حەزیان پێیەتی.

کە لاوازی مرۆیی لە گۆڕینی دەقەکان بە ئاراستەی ڕەزامەندی خەڵکدا ڕاستییەکە نزیکە هیچ بانگخوازێکی ڕێگای خودا لێی دەرباز نەبێت، خۆ ئەگەر ئەو تاقیکردنەوەیە بەم شێوەیە مەترسیدار نەبووایە، ئەوکات زۆر ئاگادارکردنەوەی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) عەبەسیەت و لەخۆوەکارییەک دەبوو کە قورئان لەوە بەرز و بەدووره کە زۆر ئاگادارکردنەوە واتای توند مەترسیداربوونە، دووپاتکردنەوەی هۆشیاریدانەکەش جار لەدوای جار ڕەنگدانەوەی خزیی ڕێگا و خلیسکانی پێیە تێیدا.

بەتایبەت ئەگەر ئاگادارکردنەوە و هۆشیاریدانەکە ئاراستەی تەواوترین زات کرابێت کە ڕاسپاردەی پەیامبەرییەتی گەیاندبێت وەکوو خۆی، چ جای کەسانێکی جگە لەو کە ناگەنە تۆسقاڵێکیش لە پێگە و پاڵفتەبوون و هەڵبژاردەیێتی ئەو؟!

بەنموونە، بڕوانە چۆن پەروەردگار جەماوەری وەرگری وەحی وێناکردووە کاتێک کە هەوڵی لادانی پێغەمبەریان (ﷺ) دەدا لە چەسپاوەکانی وەحی و بەڵێنیان پێ دەدا کە ئەوکات شوێنی بکەون و سەری بخەن، جا لە سوورەتی ئیسرادا دەفەرموویت: ﴿وَإِن كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ

---

(١) ابن تيمية، «مجموع الفتاوى»: (٩/ ٢٠).

وَإِذًا لَاتَّخَذوكَ خَليلًا﴾[الإسراء: ٧٣] «خۆ خەریک بوو بە ئاشووبت بەرن و لات بدەن لەوەی وەحیمان کردووە بۆت، لەپێناو ئەوەدا کە جگە لەوەمان بەناوەوە هەڵببەستیت، سا ئەوکاتیش دەبوویتە دۆستی نازدار و خۆشەویستیان.»

ئەوان لە ئامادەگییەکی تەواودا بوون بۆ شوێنکەوتن و هاتنەناو ڕیزی کۆمەڵی موسڵمانانەوە بەڵام بەیەک مەرج، تەنها یەک مەرج، ئەویش گۆڕینی «هەندێک» لەو وەحییەی کە ناوەڕۆکەکەیان بەدڵ نەبوو، تەنها هەندێکی!

قورئان لە ئایەتی دواتریدا ئەوەی خستووەتەڕوو کە ئەم ڕادەستبوونە بۆ هەژموونی بۆدواوان مەترسییەکی ڕاستەقینە بوو لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر پاراستنی خودایی نەبووایە، هەربۆیە دەفەرموویت: ﴿وَلَولا أَن ثَبَّتناكَ لَقَد كِدتَ تَركَنُ إِلَيهِم شَيئًا قَليلًا﴾[الإسراء: ٧٤] «خۆ ئەگەر ئێمە پێچەسپاومان نەکردیتایە، نزیکبوو شتێکی کەم لاربیتەوە بە لایاندا.»

جا ئەگەر هەژموونی بانگهێشتکراوان نزیکبووبێت کاریگەری بکاتە سەر سەرداری پێغەمبەران ئەگەر پاراستنی خودایی نەبووایە، ئیدی چۆن کەسانی خوار ئەو لەوە بێترس بن؟ چۆن هەندێک لە زانایان و بانگخوازان بەساردی لەگەڵ ئاشووبی ڕاکێشانی بانگکراواندا مامەڵە دەکەن کە پەروەردگار پێغەمبەرەکەی ئاگادار دەکاتەوە و هەواڵ دەدات کە خۆی چەسپاوی کردووە؟!

قورئان ئاماژەشی بەم زۆرلێکردن و لەسەرچوونەی بێباوەڕان کردووە بۆ گۆڕینی وەحی، هەروەک لە سوورەتی یوونسدا دەفەرموویت: ﴿وَإِذا تُتلى عَلَيهِم آياتُنا بَيِّناتٍ قالَ الَّذينَ لا يَرجونَ لِقاءَنَا ائتِ بِقُرآنٍ غَيرِ هذا أَو بَدِّلهُ قُل ما يَكونُ لى أَن أُبَدِّلَهُ مِن تِلقاءِ نَفسى إِن أَتَّبِعُ إِلّا ما يوحى إِلَىَّ﴾[یونس: ١٥] «کاتێکیش ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە؛ ئەوانەی کە ئومێدی دیداری ئێمەیان نییە و بەتەمای نین دەڵێن قورئانێکی جگە لەمە بێنە یاخود ئەمە بگۆڕە، بڵێ: من بۆم نییە لەلای خۆمەوە بیگۆڕم، من تەنها شوێن ئەوە دەکەوم کە وەحی کراوە بۆم.»

پەروەردگار هەمان ئاگادارکردنەوە لە مەترسیی هەژموونی بۆدواوان دووپات دەکاتەوە، کە لە سوورەتی مائیدەدا دەفەرموویّت: ﴿وَاحذَرهُم أَن يَفتِنوكَ عَن بَعضِ ما أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيكَ﴾[المائده: ٤٩] «ئاگاداریان بە لەوەی کە بە ئاشووبت بەرن و لات بدەن لە هەندێک لەوەی (اللّٰه) بۆی دابەزاندوویت.»

جارێکی دیکەش زنجیرەی داشکاندنەکان بۆ گۆڕینی وەحی تەماشا بکە، مامەڵەکردن لەسەر «هەندێک» لە وەحی، نەک هەموو وەحیش، تەنها لارکردنەوەی هەندێک لە حوکم و وێناکان کە لەگەڵ واقیعی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی قوڕەیشدا نەدەگونجان، بەڵام پەروەردگار لەگەڵ هەموو ئەوەشدا پێغەمبەرەکەی ئاگادارکردەوە و ترساندی و ئەوەی بە «فتنة-ئاشووب» ناونا، زانا و هاوەڵانی ڕێگای بەرەو خوداش کۆڕان لەسەر ئەوەی کە فیتنە پێگەی تاقیکردنەوە و لەبێژینگدان و پاڵفتەکردنە.

داخوازیش تەنها ئەوە نییە کە توخنی ئەم داشکاندنەی هەندێک لە ناوەڕۆکەکانی وەحی و ئەم ملدانە نەکەوینەوە، بەڵکوو شتێکی زیاد لەوەشمان لێ داواکراوە کە شانازیکردنە بەم ناوەڕۆکانەوە و شکۆمەندبوونە پێیان و خۆنەدزینەوە وشەرمنەکردنە لە ئاستی، وەک لە سەرەتای سوورەتی ئەعرافدا دەفەرموویّت: ﴿كِتابٌ أُنزِلَ إِلَيكَ فَلا يَكُن في صَدرِكَ حَرَجٌ مِنهُ لِتُنذِرَ بِهِ وَذِكرى لِلمُؤمِنينَ﴾ [الأعراف: ٢] «پەرتووکێک دامانبەزاندووەتە سەر تۆ سا لە دڵتدا شەرم و ترس و سڵەمینەوەیەک نەبێت لێی کە بیگەیەنیت و وەک یادهێنانەوەیەکیش بۆ باوەڕداران.»

ڕازیبوونیش بە حوکمی خوایی و وێناکانی وەحی و دەربازبوون لە شەرملێکردنی؛ هەموو ئەمەشی بە پێوەری باوەڕ داناوە، وەک دەفەرموویّت: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤمِنونَ حَتّى يُحَكِّموكَ فيما شَجَرَ بَينَهُم ثُمَّ لا يَجِدوا في أَنفُسِهِم حَرَجًا مِمّا قَضَيتَ وَيُسَلِّموا تَسليمًا﴾ [النساء: ٦٥] «سا نەخێر سوێند بە پەروەردگارت باوەڕیان

نییە هەتا نەتکەن بە دادوەر لەهەرچیدا کە ئەبێتە گێرە و کێشە لەنێوانیاندا لەپاشانیش لە دەروونیاندا شتێک نارەزایی لە بڕیاردان و داوەرییەکەت نەبێت و بە ڕادەستبوونی تەواو ڕادەست و ملکەچی نەبن.»

جا لەم ئایەتەدا بە چەندەها ئامرازی زمانەوانی جەختی لەم مەرجەی باوەڕ کردووەتەوە بۆ چەسپاندنی واتاکەی، لە وێنەی ئامرازەکانی: سوێندخواردن، ڕەتکردنەوە، بەشوێنداهێنان، دووبارەکردنەوە، ناوی ڕەها و جگە لەوانەش لە شێوازە جەختکارییەکانی ناو زمان، تەنانەت هەندێک لە زانایان بە «دە جەختکەرەوە»ی ژماردووە لە هەمان یەک ئایەتدا! وەک لە پەرتووکە فراوانە زانستییەکاندا هەیە. (١)

ئاوەها و بەم شێوەیە ئایەتەکانی قورئان جار لەدوای جار ئەم ئاگادارکردنەوەیە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دووپات دەکاتەوە سەبارەت بە مەترسیی پەستانی هەوا و هەوەسی بۆدواوان، وەک لە سوورەتی مائیدەدا دەفەرموێت: ﴿وَلا تَتَّبِع أَهواءَهُم عَمّا جاءَكَ مِنَ الحَقِّ﴾ [المائده: ٤٨] «شوێن ئارەزووی ئەوان مەکەوە و لابدەیت لەو حەقەی کە بۆت هاتووە.»

لە زمانێکی تۆقێنەری ئاگادارکردنەوەشدا کە خوێنەر لێی دەلەرزێت دەفەرموێت: ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعتَ أَهواءَهُم بَعدَ الَّذى جاءَكَ مِنَ العِلمِ ما لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلا نَصيرٍ﴾ [البقرة: ١٢٠] «خۆ ئەگەر شوێن هەوا و ئارەزووی وان بکەویت لەدوای ئەوەی کە بۆت هاتووە لە زانست؛ ئەوکات لای خواوە دۆست و پشتیوان و سەرخەرێکت بۆ نییە.»

ئەم جەختکردنەوە پاراوە دووپاتکراوە خواییە سەبارەت بە ململانێی سەخت و دژواری نێوانی ئەم دوو جەمسەرە، جەمسەری ئارەزووی بۆدواوان

---

(١) انظر مثلًا: ابن القيم، "الصواعق المرسلة"، تحقيق: علي الدخيل الله، دار العاصمة، الطبعة الثالثة، (١٤١٨هـ)، (ص ١٥٢٠).

و جەمسەری کتێبەکەی پەروەردگار و کاریگەری ئەوەش لەسەر بانگخوازی گەیەنەر لە ڕێگاکەی پەروەردگاردا، ئەمە تەنها تێبینییەکی هزری نییە کە بەدەم قاوەی یانەیەکی ڕۆشنبیرییەوە وەربگیرێت، بەڵکوو بنچینەیەکی قووڵ وتۆکمە وهەڵقوڵیوە لە مەزنی زانستی خودایییەوە بەڕێساکانی بانگەوازی و گەیاندنی ئایین.

هەمان جەختکاریش لەسەر پێکدادانی ئەم دوو جەمسەرە ئارەزووی مرۆیی و، وەحی خوایی دووبارەدەکاتەوە، لە سوورەتی قەصەص-دا دەفەرمووێت: ﴿فَإِن لَم يَستَجيبوا لَكَ فَاعلَم أَنَّما يَتَّبِعونَ أَهواءَهُم وَمَن أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَواهُ بِغَيرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ﴾[القصص: ٥٠] «خۆ ئەگەر وەڵامیان نەبوو و بەدەم بانگتەوە نەهاتن بزانە کە (ئەوە لەبەر ئەوەیە کە) شوێن هەوا و ئارەزووی خۆیان کەوتوون.»

ئاماژە بە هەمان پێکدادانیش دەدات کە لە سوورەتی شووڕادا دەفەرمووێت: ﴿وَلا تَتَّبِع أَهواءَهُم وَقُل آمَنتُ بِما أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتابٍ﴾[الشورى: ١٥] «شوێن هەوا و هەوەسی ئەوان مەکەوە و بڵێ باوەڕم هێناوە بە هەرچی پەرتووکێک خوا دایبەزاندووە.»

ئەو شوێنانەشی کە پەروەردگار پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە مەترسی هەژموونی بانگهێشتکراوان و زەبەلاحیی کاریگەرییان لەسەر بانگخواز ئاگادار کردووەتەوە گەلێک زۆرن، هەرکەسیش لەو شوێنانەی پەرتووکەکەی خودا وردبێتەوە و ڕەهەندە واتاییەکانی هەڵبداتەوە و تەماشا بکات و «دووپاتکردنەوەی ئاماژەدان بە سەختی ڕووبەڕووبوونەوەی هەوا و هەوەسی مرۆیی لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هۆشیاریدانی پەروەردگار لە وەڵامهەبوونێک بۆ پەستانکردنی ئارەزووی خەڵکی لەپێناو بزرکردنی ڕاستییەکانی وەحی» ببینێت، هەروەها زۆر پێکگرێدانی خودا بۆ ئەم دوو دژە: ئارەزووی خەڵک و پەرتووکەکەی خودا؛ بۆی وەدەردەکەوێت بۆچی پەروەردگار باسی ئارامگری لەپاش باسی شوێنکەوتنی

وەحییەوە هێناوە، ئەوەش لەوێ لە سوورەتی یوونسدا کە دەفەرمووێت: ﴿وَاتَّبِع ما يوحى إِلَيكَ وَاصبِر﴾ [یونس: ١٠٩] «شوێن ئەوە بکەوە کە بۆت وەحی دەکرێت و ئارام بگرە.»

هەر بەڕاست، ئەو کەسەی بیەوێت هەموو وەحی بپارێزێت و دەست پێوە بگرێت چەندە پێویستی بە هێزی ئارامگری هەیە، ئارامگرتن لەسەر پێکدادانی وەحی و ئارەزووی مرۆییدا، ئارامگرتن لەسەر قورسبوونی دەروونەکان و کەمەندکێشبوونیان بە داو و مێخی نەریت و خووەکانیان، ئارامگرتن لەسەر هەوڵی هەڵەداوان و مکوڕی نەفس کە بانگخواز بەرەو بەدەمەوەچوونی داخوازی و چاوەڕوانییەکانی جەماوەر پاڵدەنێت، هەرچەندە لەگەڵ ئەوەشدا یەکنەگرێتەوە کە ئایەتەکانی وەحی دەیهێنن و دەیخەنەڕوو.

ئەگەریش کادیری ئیسلام دەست بە پێگەی ئارامگرییەوە نەگرێت، بێگومان کە دەکەوێتە ناو ئاڕاستەکردنی دەقەکان و لادانیانەوە بەرەو لەوەڕگای ئارەزووە زەمینییە نەوییەکان، لەبری ئەوەی دەقەکان ئەو بەرنە بەرزاییەکانی ئاسمان و وێستگەکانی بەندایەتی پێ تەی بکەن.

زۆرجاریش کادیری ئیسلام ئەوە نییە کە کەوتبێتە ژێر پەستانی تامەزرۆبوون بۆڕێنومابیکرانی خەڵک، بەڵکوو بووەتە قوربانی خۆلادان لە گاڵتە و گەپ و تانەکان، چونکە تێبینیکراوە کە هەندێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەتی ماددی زۆر چەمک و دەستەواژەی ئایینی و کەلەپووری سەنگین لەمیانەی تێزە ڕەخنەییەکانیاندا دەخەنە قاڵبی نوکتەیێکەوە. لە واقیعیشدا: گاڵتەچییەتی و تانەدان لە کاریگەرترین ئامڕازەکانی هەژموون و باڵکێشانن بەسەر ئەوانی دیکەدا، چونکە زۆرترین ئازار بە پیاوانی مەرد دەگەیەنن، ئەوسا لە زۆر هەڵوێستی پێویستیان دەگرنەوە و دەستەوەستانیان دەکەن لە ترسی ئەوەی کە بینە مایەی گاڵتەجاڕی و بکەونە پێگەیەکی تانەلێدراوەوە. هەربۆیە پەروەردگار

پێغەمبەران و چاکسازانی ئاگادارکردووەتەوە لەوەی کە نەیارانی بانگەواز چەند بە خەستی ئەم ئامراز و هەژموونە بەکاردێنن کە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِن قَبْلِكَ﴾ [الأنعام: ١٠] «بەڕاستی گاڵتە کراوە بە پێغەمبەرانێک بەر لە تۆش.»

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَقَد أَرسَلنا مِن قَبلِكَ في شِيَعِ الأَوَّلينَ(١٠) وَما يَأتيهِم مِن رَسولٍ إِلّا كانوا بِهِ يَستَهزِئونَ﴾ [الحجر: ١٠ - ١١] «بەڕاستی بەر لە تۆ بۆ ناو کۆمەڵانی خەڵکانی سەرەتا و زووش پەیامبەرانمان ناردووە. پێغەمبەرێکیشیان بۆ نەدەهات کە گاڵتەیان پێ نەکردبێت.»

جاری واش هەیە کە چاکسازان ڕووبەڕووی ستەمی تۆمەتبارکردنی سیاسی دەبنەوە کە گوایە ئەوانە بەتەمای هەژموونی سیاسی و گەمەی دەسەڵات و باڵکێشانن بەسەر جەماوەردا و نموونەی ئەم تۆمەتانە کە زۆرجار کاریگەری لەسەر ڕەفتاری کادیرانی ئیسلام دادەنێت. قورئان ئاماژەی بەمەش کردووە کە نەیارانی بانگەوازە خوداییەکان ئەم تۆمەتە سیاسییانە دەکەنە بنێشتەخۆشەی سەرزاری خۆیان. هەربۆیە؛ گەلی فیرعەون دەیانگوت کە مووسا تەنها خەم و تەمایەکی سیاسی لە سینەدایە و پیلانی وایە دەست بەسەر خاکی نیشتیمانی واندا بگرێت، وەک پەروەردگار لێیانەوە دەیگوێزێتەوە: ﴿قالَ أَجِئتَنا لِتُخرِجَنا مِن أَرضِنا بِسِحرِكَ يا موسى﴾ [طه: ٥٧] «گوتیان ئەرێ مووسا تۆ هاتوویت کە بە جادووەکەت لە خاکی خۆمان وەدەرمان بنێیت.»

هەروەها وتیان کە مووسا و هاڕوون ئامانجیان دەسەڵاتە وەک پەروەردگار لێیانی دەگێڕێتەوە: ﴿وَتَكونَ لَكُمَا الكِبرِياءُ فِي الأَرضِ وَما نَحنُ لَكُما بِمُؤمِنينَ﴾ [یونس: ٧٨] «مەزنی و سەرگەورەیی ئەم خاکە بۆ ئێوە بێت؟ سا وا ئێمە بێباوەڕین پێتان.»

# کۆتایی: چڵی دوایی

خوێنەری خۆشەویستم! باوەڕم پێ بکە ئێرە پێگەی چەند لێکدانەوەیەکی هزریی ساردوسڕ نییە، یاخود جێگای چێژوەرگرتن بێت لە درێژدووانێکی زەینی کە بە تەنیشت قاوەیەک لەسەر سینییەک پێکەوە دانرابن، نا هاوڕێکەم. چەندە ئاواتەخوازم کە هەست بەوە بکەیت بابەتەکە چەند مەزن و گەورەیە و چەندت پێویست بەوەیە مکوڕ و پێداگرانە لێی بڕوانیت.

هەندێک بۆڵەیان دێت و ئاگری قەڵسی لەسەر مەقەڵی برۆکانیان هەڵدەستێنن وەختێک کادیرانی ئیسلام سەبارەت بە جومگەیەتی و گرنگییەتی ئەم بابەتە و تیژی و سەختی بژاردە نمایشکراوەکان تێیدا دەدوێن، هەروەها ئەوەی کە هەر بۆچوونێک لەم وێستگەیەدا سامناکە کە یاخود لەسەر لێواری چاڵە یاخود پێی لە پەیژەی ڕزگاری ناوە. هەندێک دژ بەمەن و ئەم تێزە بچووکدەکەنەوە و بە شین و ڕۆڕۆی دادەنێن لەسەر مردوویەک کە بوونی نییە و بستە لمێکی بەرزبووەوە کە گۆڕی تێدا نییە.

ئەم قورئانە تەنها عەمبارێکی مەعریفی، یاخود چەند ویردێکی سرووتی نییە، بەڵکوو پەیامێکی خوداییە کە کەیسێکی لەخۆگرتووە لەسەروو گشت کەیسەکانەوە، کەیسێک کە چەندەها قوڵپی پەیوەندی شکاند و شمشێری لە کێڵان دەرێنا و چەند تەختی شاهانەی ژێروزەبەر کرد و شوانۆچکەی مەڕانی بردە بانێکی سەرکەش و بەرزەوە.

چەند بەئازارە کە ئەمڕۆ لە چاوی ڕۆشنبیراندا داهێنان ئەوەیە کە نووسینەکانت قورئان و فەرموودەی زۆری تێدا نەبێت و گوتارەکانت بە یادی خوا و بەرەکەتی

ئایەت و ڕێنوماییەکانی ڕۆشن نەکەیتەوە، بەڵکوو داهێنان نمایشکردنێکە بە ئاخنینی گوتارەکانت لە فلان و فیسار ناوی بریسکاوەی فرانکفۆنی و هەرچی ناوی خوار ناوی خوایە لە ناوی دروستکراوەکان، ئەوسا ڕووی خۆش دەبینیت و دەروون و سینەکان پێشوازیت لێ دەکەن.

توخوا بنوارە لە ڕاکردنی زۆرێک لە زێدەڕەوانی مەدەنییەت لە دەقە ئایینییەکان و بەدەمەوەهاتن و گەشانەوەیان بە باسکردنی ناوی کەسایەتییە ڕۆژئاواییەکان و ئەوجا بەراوردی ئەمە بکە بەو فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿وَإِذا ذُكِرَ اللَّهُ وَحدَهُ اشمَأَزَّت قُلوبُ الَّذينَ لا يُؤمِنونَ بِالآخِرَةِ وَإِذا ذُكِرَ الَّذينَ مِن دونِهِ إِذا هُم يَستَبشِرونَ﴾ [الزمر: ٤٥] «وەختێک ناوی (اللّٰه) بە تاکوتەنها بهێنرێت، دڵی ئەوانە دادەخورپێت کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە و تێک دەچێت. کاتێکیش ناوی ئەوانەی جگە لە ئەو بێت، دەبینیت دەگەشێنەوە و دڵخۆش دەبن.»

لە سوورەتی حەجیشدا دەفەرموویت: ﴿وَإِذا تُتلى عَلَيهِم آياتُنا بَيِّناتٍ تَعرِفُ فى وُجوهِ الَّذينَ كَفَروا المُنكَرَ﴾ [الحج: ٧٢] «وەختێک ئایەتەکانی ئێمەیان بەڕوونی و بەڵگە و بەرچاڕۆشنی بەسەردا دەخوێندرێتەوە، ناڕەزایی و قەڵسی لە ڕوخساری بێباوەڕاندا دەبینیت.»

لەڕاستیدا: پشتکردن لە وەحی و ناڕەحەتبوون پێی ئاماژەدەرێکی ترسناکە بەوەی کە بەشێکی شاراوە لە دووڕوویی لە دڵدا بوونی هەیە کە پێویستە هەر زوو بەر لە کات بەسەرچوون پاکبکرێتەوە، وەک دەفەرموویت: ﴿وَإِذا قيلَ لَهُم تَعالَوا إِلى ما أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسولِ رَأَيتَ المُنافِقينَ يَصُدّونَ عَنكَ صُدودًا﴾ [النساء: ٦١] «کاتێکیش پێیان دەوترێت: وەرن بەدەم ئەوەوە کە خوا دایبەزاندووە و بەدەم پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت.)، دەبینیت دووڕووان زۆر قایم و خراپ پشتت لێدەکەن و ڕوودەچەرخێنن.»

جا سەرچاوەیەتی هزری جۆرێکە لەوەی کە دەبێت خودا بەتەنها خۆی

بڕیاری تێدا بێت، بەتاکڕاگرتنی پەروەردگاریش لە حوکم و گوێڕایەڵیدا بنچینەی بەندایەتی و ملکەچییە، لەوەش ڕابمێنە چۆن پەروەردگار حاڵی ئەو بێباوەڕانەی بۆ باسکردووین کە شەیدا و ئارامن بە ناوهێنان و گەورەکردنەوەی جگە لە خودا و بێزارن لە باس و ناوهێنانی خوا، ئەوجا لە دڵی خۆتدا بڵێ: "ئای کە چەندە بە یەک دەچن ئەمڕۆ و دوێنێ!"

لە کۆتایی ئەم توێژینەوە ڕەخنەییەشدا: بە لامەوە گرنگە کە دووبارە و بە شێوەیەکی تایبەت جەخت لەوە بکەمەوە کە ئامانجی ئەم کارتە توێژینەوەیە سووککردنی ڕەهەندی ئامادەکردنی هێز و عەمبارکردنی توانا تازە و داهێنانەکان نییە، یاخود حەرامکردنی حەڵاڵ و پاکەکان و داخستنی دەرگای خۆشگوزەرانییەکان.

بەڵام هاندەری کرۆکی بۆ نووسینی ئەم توێژینەوەیە تەنها: گەورەبوونەوە و قڵیشبردنی گرفت و کەلێنەکان بوو لە ڕێکخستنی لەپێشینەکاندا لەلای چینێکی بەرفراوان لە ڕۆشنبیران بە جۆرێک کە فەرامۆشکردنی زۆرێک لە حەقیقەتەکانی وەحی و خراپەکردن بەرانبەر بە خودی پڕۆژەی ڕابوونی بەشوێندا هاتووە، هەتا ئەوەی کە زانستە مەدەنییەکان بوونەتە ئامانج و زانستە خواییەکان تەنها وەک ئامرازێکی شوێنکەوتەی ئەو ماونەتەوە، لەگەڵ ئەوەدا کە ڕاستییەکانی قورئان تەواو بە پێچەوانەی ئەوەوە هاتوون کە زانستە خوداییەکانیان کردووەتە بنچینە و جگە لە خۆشیان کردووەتە خزمەتکاری.

جا ئەم بەشانەی پێشوو ئامانج لێی خستنی بەهای مەدەنییەت، یاخود بەتاڵکردنەوەی گرنگییێتی شارستانییەت نەبوو، یاخود چەقاندن و جێگیرکردنی یەکجاریی ئەو حاڵەتی بەکاربەری و شوێنکەوتەییەی کە لە کۆمەڵگا موسڵمانەکانماندا هەیە، بەڵکوو تەنها هەماهەنگییەک بوو بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی لەپێشینەکانی ڕۆشنبیری موسڵمان و وەدەرخستنی وێنای

جیاوازی ئیسلامی ئێمە بۆ چەمکی شارستانییەت و مەدەنییەت و پێشکەوتن و ڕابوون و نوێگەری، بە ئامانجی دووبارە لەبەرچاوگرتن و دۆزینەوەی ئەرکی لەپێشینەی بژاری دەروونەکان و پێگەی بڵندی زانستە خوداییە بەمیراتماوەکان لە دوایین پێغەمبەرەوە (ﷺ)، پێویستی ئێمە پێی یەکەم شت و لەپاشان دووەم پێویستی جیهانی هاوچەرخیش پێی.

ئیدی خەرجکردنی تەواوی توانا و هێز لە ئامادەکردنی هێز و وەچنگخستنی ئامراز و تواناییەکاندا، ئەمەیان واجبێکی شەرعی چەسپاوە بەبێ هیچ ناکۆکییەک کە ئەمڕۆ موسڵمانان لەوپەڕی پێویستیدان بە توانا تازە و داهێنراوەکان بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلامی و بەدیهێنانی ئامانجی پیرۆزی خودایی کە پەروەردگار لە سێ جێگای پەرتووکەکەیدا باسی لێ فەرمووە: لە سوورەتەکانی «تەوبە» و «فەتح» و «صەفّ»دا، کە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذِى أَرسَلَ رَسولَهُ بِالهُدى وَدينِ الحَقِّ لِيُظهِرَهُ عَلَى الدّينِ كُلِّهِ﴾ [الفتح: ٢٨] «ئەو خودایەیە کە پێغەمبەرەکەی بە ڕێنومایی و ئایینی حەق ناردووە تاکوو بەسەر هەموو ئاییندا زاڵی بکات.»

وێنەی ئەم ئامانجە پیرۆزە خوداییەش بە گرتنەبەری ئامرازە شەرعییەکان نەبێت لە ئامادەکردنی هێز و تواناییەکان، نایەتەدی. هەربۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَأَعِدّوا لَهُم مَا استَطَعتُم مِن قُوَّةٍ وَمِن رِباطِ الخَيلِ تُرهِبونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُم﴾ [الأنفال: ٦٠] «بۆیان ئامادە بکەن چەندی دەتوانن لە هێز و لە ڕاگرتنی ئەسپ و سواری کە دوژمنی خودا و دوژمنی خۆتانی پێ بتۆقێنن.»

لە دوو سەحیحەکەدا هاتووە: لە فەرموودەی ئیبن عومەرەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جارێک کە لەسەر مینبەر بوو فەرمووی کە باسی لە خێرکردن و خۆپاکڕاگرتن لە دەستپانکردنەوە دەفەرموو: «دەستی باڵا باشترە لە دەستی نەوی، دەستی باڵا بەخشەرە و دەستی نەویش ئەوەیە کە داوادەکات.»[1]

---

(١) "صحيح البخاري": (١٤٢٩)، و "صحيح مسلم" (١٠٣٣).

بەڵام هەوڵدانی تەواو بۆ گرتنەبەری ڕێگای هێز و هۆکار و توانابیەکان مانای پشت پێبەستن و وابەستەبوونی دڵ نییە پێیەوە. هەربۆیە؛ کاتێک لووطی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بە گەلەکەی فەرموو: ﴿قالَ لَو أَنَّ لى بِكُم قُوَّةً أَو آوى إِلى رُكنٍ شَديدٍ﴾ [هود: ٨٠] «گوتی ئاخ ئەگەر هێزێکم بەسەرتاندا دەبوو یاخود پشتێکی قایمم شک دەبرد.»

پێغەمبەر (ﷺ) تێبینییەکی زۆر پاراو و جوانی لەسەر ئەوە فەرموو، کە تورموذی و جگە لەویش بە سەنەدێکی حەسەنەوە گێڕاویانەتەوە لە ئەبوو هورەیرەوە لەوەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: «ڕەحمەتی خوا لە لووط، خۆ پشتێکی قایمی هەبوو، مەبەستی: (اللّٰه)ی بەرز و بەدەسەڵات بوو، جا لەپاش ئەو پەروەردگار پێغەمبەرێکی نەنارد کە زۆری و هێزی گەلەکەی لەپشت نەبووبێت.» [١]، تورموذی لە موحەممەدی کوڕی عەمرەوە دەگوێزێتەوە کە فەرموویەتی: "(ثروة) یانی: زۆری و هێز و پشت."

هەروا چێژبردن لە پاک و حەڵاڵەکان شەریعەت جێگیری کردووە، وەک دەفەرمووێت پەروەردگار: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا كُلوا مِن طَيِّباتِ ما رَزَقناكُم﴾[البقرة: ١٧٢] «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە حەڵاڵ و پاکی، ئەوە بخۆن کە پێمان بەخشیون.»

هەربۆیە؛ پێشەوا موسلیم لە سەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «ئەی خەڵکینە! بەڕاستی خودا پاکە و پاکیش نەبێت وەری ناگرێت» هەروەها خودا فەرمانی ئەوەی بە باوەڕداران کردووە کە فەرمانیشی بە پێغەمبەران کردووە، جا فەرموویەتی: ﴿يا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلوا مِنَ الطَّيِّباتِ وَاعمَلوا صالِحًا إِنّى بِما تَعمَلونَ عَليمٌ﴾[المؤمنون: ٥١] «ئەی پێغەمبەران لە پاکەکان بخۆن و کاری چاکە بکەن، بەڕاستی من بەوەی کە دەیکەن زانا و ئاگادارم.» هەروەها

---

(١) "سنن الترمذي": (٣١١٦).

فەرموویەتی: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنوا كُلوا مِن طَيِّباتِ ما رَزَقناكُم وَاشكُروا لِلَّهِ إِن كُنتُم إِيّاهُ تَعبُدونَ﴾ [البقرة: ١٧٢] «ئەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەو پاکانە بخۆن کە پێمان بەخشیون.» (١)

## دەشکرێت ئەم پرسە لەمیانەی دابەشکردنی پەیوەندی بە توانا دونیاییەکانەوە بەسەر سێ ئاستی سەرەکیدا پوخت بکرێتەوە:

یان ئەوەیە گرنگیدان بە بنیادنانی دونیا وابەستە بێت بە ئامانجی سەرخستنی ئیسلام و بەدیهێنانی بەهاکانی.

یاخود تەنها بۆ تێرکردنی پێویستییە مرۆییەکان بێت.

یاخود بە ئامانجی شانازیکردن و کەشوفش و خۆشگوزەرانی و پێشبڕکێی دونیایی و ئەوانە بێت.

جا ئەم سێ ئاستە، پێغەمبەر (ﷺ) پوختی کردوونەتەوە کە هەر ئاستێکی بە وەسفێکی کۆکەرەوەی تێروتەسەل تاریف کردووە، ئەوەش لە فەرموودەی بەناوبانگی ئەسپدا کە بوخاری و موسلیم لە دوو سەحیحەکەیاندا لە فەرموودەی ئەبوو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوای (ﷺ) فەرموویەتی:

«ئەسپ سیانە (سێ جۆرە)، بۆ یەکێک پاداشتە و بۆ یەکێک پەرژێنە و بۆ یەکێک بار و تاوانە. جا ئەوەی کە پاداشتە بۆی: ئەوەیە کە پیاوێک لەپێناو خوادا بۆ جیهاد ڕایدەگرێت و ئامادەی دەکات، جا ئەو ئەسپە هەر شتێک بخوات و لە سکیدا ونی بکات، پەروەردگار بە پاداشت بۆی دەنووسێت، ئەگەریش لە سەوزاییەکدا بیلەوەڕێنێت، هەرچی بخوات، پەروەردگار بەوە پاداشتی بۆ دەنووسێت، لە ڕووبارێکیش ئاوی بدات، بە هەر دڵۆپێک دەیخواتەوە و دەچێتە زگی، پاداشتی هەیە. هەتا ئەوەی پاداشتی لە پاشەڕۆ و میزیشیدا

---

(١) "صحيح مسلم": (١٠١٥).

باس کرد. ئەگەریش بەرزاییەک (گردێک) و دووان غاربدات و ببڕێت، بە هەر هەنگاوێک کە دەینێت پاداشت هەیە. ئەوەشیان کە پەرژێنە بۆی: ئەوەیە کە پیاو بۆ بەخشندەیی و بەخشین و جوانی ڕایدەگرێت و حەقی پشت و سکی لە ناخۆشی و خۆشیدا زایە ناکات. ئەوەشیان کە بارە بەسەریەوە: ئەوەیە کە بۆ خۆدەرخستن و شانازی و زیادەخەرجی و ڕووپامایی خەڵک ڕایدەگرێت، ئەوەیانە کە بار و تاوانە بەسەریەوە.»[1]

جا ئەم فەرموودە مەزنە لێوانلێوە لە وانە و واتا کە لە چەند دەربڕینێکی کورتبڕی پوختدا هەرچی کە ئەم توێژینەوەیە ویستی بیڵێت، ئەو بەزیادیشەوە فەرمووی. لاشمان گرنگە کە ئاماژە بە پێگەی چاکی دەستکەوت و توانا دونیاییەکان بدەین وەختێک ئاڕاستەی سەرخستنی ئیسلام دەکرێتەوە و ڕەزامەندی پەروەردگاری لێ دەویسترێت، تەنانەت مرۆڤ لەسەر وردەکاریی جووڵانەوەکانیشی لە وەختی ئەنجامدانی پەرستشەکەدا پاداشت وەردەگرێت با خۆشی هۆش و نیازی بە لای ئەو وردەکارییانەوە نەبێت کە زیاد لە یەکێک لە شرۆڤەکارانی دوو سەحیحەکە ئاماژەیان بەوە داوە، لە بەرانبەر نەگبەتی و پووچییێتی ئەو توانا و دەستکەوتانە وەختێک بۆ کێبڕکێی دونیایی کۆدەکرێنەوە.

✧دەشکرێت هەندێک لەو ئامانج و ئەنجامانەی کە ئەم توێژینەوەیە مەبەستی بووە لەم هێڵانەی خوارەوەدا پوخت و کۆ بکرێنەوە:

- بەندایەتی: ئامانجە هەرە گەورەکەیە، ئیدی زانستە مەدەنییەکانیش ئامرازێکی شوێنکەوتەی ئەون.

- ڕۆشنگەریی ڕاستەقینە: چاوڕۆشنبوونەوەیە بەو زانستە خوداییانەی کە وەحی لەخۆی گرتوون، دابەزین و تاریکی تەواویش: بێبەشبوونە لەڕۆشناییەکانی وەحی، ئیدی پلەی زانستە مەدەنییەکان بە هەرکوێش بگات.

---

(١) "صحيح البخاري": (٢٣٧١)، و "صحيح مسلم": (٩٨٧).

- بەرزترین ئاستەکانی ئاوەدانکردنەوە: ئاوەدانکردنەوەی ئیمانییە، کرۆکی فرمانی جانشینیش: چەسپاندن و بەفەرمانڕەواکردنی ئایینە.

- زێدەڕەویی مەدەنیی ماددی: چاوگی لادانی ڕۆشنبیری و ڕەگی سەرلێشێوانە هزرییە هاوچەرخەکانە.

- ئیسلامییەکان دژ بە ڕۆشنبیرکردن نین، بەڵام هەڵوێستێکی وردەکارییان هەیە کە جیاوازی لەنێوان سوود لێ بینین و پێسەرسامبووندا دەکات و جیاوازی لەنێوان ئاستەکانی بەرهەمهێناندا دەکات لە شارستانییەتەکانی دیکەدا.

- گوتاری مرۆڤاندنی کەلەپوور سەرەنجامی بووەتە بزرکردنی ڕۆڵی دەق لە پێکهێنانی توراسدا و گەڕاندنەوەی هەرچیی زانستە ئیسلامییەکانە بۆ تەنها دوو فاکتەر: دانەپاڵ و ڕەوانەکردنی بۆ ڕۆشنبیری و کەلتوورەکانی پێشوو، هەروەها بەسیاسیکردنیشی بە بەستنەوەی بە ململانێی بەرژەوەندییەکانەوە، هەموو ئەمەش لە دەمی فیلۆلۆژی ڕۆژهەڵاتناسییەوە وەرگیراوە، بە جۆرێک کە دابڕانی لاوی موسڵمانی لە نموونە ئیلهامبەخشەکانی لێدەکەوێتەوە.

- نارەحەتبوون و بۆڵەهاتن لە سەرچاوەیەتی-مەرجەعییەتی وەحی و بەکەم تەماشاکردنی چاخە زێڕینەکان و هەمیشە بەشانوباڵهەڵدانی بێباوەڕاندا، لە بەربڵاوترین بەشە هاوچەرخەکانی دووڕوویی-نیفاقە کە پێویستی بە پارێزی ئیمانی هەیە.

- زێدەڕەویکردن لە بیرۆکەی ڕێژەیەتیدا بەرەو عەدەمییەت-نەبوونی پەتی هەنگاودەنێت، بە شێوەیەک کە پاکیزەیی یەقین-دڵنیایی و پێگەی ئیحسان-چاککاری بە مرۆڤ دەدۆڕێنێت و نوقمی ڕاڕایی و سەرگەردانی و نابڕاندنەوەی دەکات.

- تووڕەبوون بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی کاتێک سنووریان دەشکێنرێت

بەهایەکی ستایشکراوە، نە هەستیارییە نە هەڵەشەیی نە دۆگماتیزمی و نە خۆزاڵکردن و نە پەڕگیری.

- سەرگەرمبوون بە بەستنەوەی دروشمەکانەوە بە هۆکاری پەتی ڕەوشتییەوە، یاخود بەستنەوەی تەشریعەکان بە چەند حیکمەتێکی کۆمەڵایەتی پەتییەوە، لە گەورەترین هۆکارەکانی لاوازکردنی بەندایەتی و ملکەچی و سستکردنی پاڵنەرەکانە.

- گەورەکردنەوەی «گشتی» هاوکات لەگەڵ وەستاندنی جێبەجێکارییەکانیدا بەرەو مەزنڕاگرییەکی شێوەیی تیۆری دەچێت نەک ڕاستەقینە، چونکە «بەشی» لەبەرچاوگیراوە لە ڕاگرتن و بەرپاکردنی گشتیدا.

- بەزین لە هەمبەر «ئاڵۆزی بەئەنقەست»دا، یاخود دڵخۆشبوون بە ئاڵۆزی تەنها بۆ خۆجیاکردنەوە لە جەماوەر، لەو دەردە دەروونیانەیە کە بووەتە هۆکاری لادانی هزری.

- دامەزراوبوونی ئایینی تەنها بۆ سەلامەتبوون لە دۆزەخ نییە، بەڵکوو شوێنەواری دونیایی گەورەی بەشوێندا دێت لە هێنانی خێر و فەڕ و لادانی کارەسات و شەڕ.

- لاوازیی مرۆیی لە گۆڕینی دەقەکاندا بە ئاڕاستەی ڕازیبوونی خەڵک ڕاستییە کە گاڵتە بە هێز و زەبری ناکرێت لەسەر ئەو کادیرانەی ئیسلام کە خەمی هەمیشەییان ڕاکێشانی خەڵکە بۆ ئیسلام.

- هەوڵدانی تەواو بۆ ئامادەکردن و عەمبارکردنی هێز و تواناییەکان لە ئەرکە شەرعییە چەسپاوەکانە.

تەواوی واتاکانی دیکەش کە لەم بەشەی کۆتاییدا ئاماژەی پێ کرا سەبارەت بە گرنگییەتی ئامادەکردنی هێز و توانایی و دەستکەوتەکان، خۆ لە بڕگە و

بەشەکانی پێشووتریشدا بە بەربڵاوی ئاماژەی پێ کراوە، بەڵام تەنها بۆ جەختکردنەوە بوو لەسەر ئەم کەیسە و هەروەها خۆلادانێکی پێشوەختە لە هەڵە تێگەیشتنەکان. ئەمەش کۆتا بەشە سەبارەت بە پەیوەندیی گوتاری مەدەنی بە بنچینەکانی وەحییەوە، مەبەستیش کۆکردنەوەی تەواوی دیاردەکانی کەلێن و گرفتی ناو گوتاری مەدەنی ماددی نەبوو، بەڵکوو باسکردنی کۆمەڵێک نموونە کە هاوشێوەکانی خۆیان پێ ڕوون ببێتەوە و بناسرێنەوە.

وَصَلَّى اللّٰهُ وسَلَّمَ على نَبيِّنا محمَّد وآلِه وصحبِه أجمعين.

ئەبوو عومەر

دووشەممە١٤٢٨ک/١٠/٦

# ناوەڕۆک




چەند تواناى نەپساوى گەنجانمان کە سەرەتاى ڕێگایان بە زمانێکی بانگخوازانەی گەرموگوڕ دەستپێکرد، وا ئەمڕۆکە -داخى گرانم- هەڵوێستێکی عەلمانی سوور و ڕاشکاویان وەرگرتووە و خەریکی پەکخستنی کرداریی ڕۆڵی دەقەکانن لە ژیانی گشتی، بێوچان کاردەکەن لە دژی فەتوا ئاینییەکان و تانە و تەشەردان لێیان، ڕادەکێشرێت بۆئەوەی ڕۆڵی نووسەرانی بەکرێگیراوی بەردەرگای پادشایان ببینێت، ئیدی سەنگی خۆیانیان دۆڕاند و پروپاگەندە و پیاهەڵدانیان خستووەتە ڕێ، ئەوجا بۆڵەبۆڵیانە لەدەست زمانی ئیمانی و بە گەمژەیی دادەنێن و هەمیشە ڕەهەندی غەیبی و پەنهانی دووردەخەنەوە لە لێکدانەوەی ڕووداوەکاندا، بەڵکوو هەندێکیان کاری گەیشتووە بەوەی بەڕاشکاوی ڕەخنەگەلی وەها دەردەبڕێت کە دوودڵییەکی قووڵ و گەورە سەبارەت بە پرسە وجوودییە گەورەکان دەنوێنێت. ئەم چینە ئیدی سەرچاوەیەتی بەڵگەیان گۆڕییەوە بە سەرچاوەیەتی ڕوخسەت و ئاسانکاریی جا لە هەر کوێیەک دەستبدات بە چاوپۆشی لەوەی کە ئایا مەبەستی خودای تێدا دێتە دی یاخود نا؟ لەو حاڵەی پێشوویانەوە کە هەڵگری خەمی پەرەپێدانی گوتاری ئیسلامی بوون، چوونەتە حاڵ و دۆخی تەنگ هەڵچنینی سیاسی بەو گوتارە.




نرخ : ۷۰۰۰ دینار

